ئازادی سەربەخۆیی میری و گەورەیی
داوا بکەن بە زار و زمان و ددان و لێو

ژیان و شیعرە کوردییەکانی

# سەیفولقوزاتی قازی

١٨٧٦ - ١٩٤٥



ئامادەکردنی
ئەنوەری سوڵتانی    حەسەنی قازی

ئازادی، سەربەخۆیی، میری و گەورەیی
داوا بکەن بە زار و زمان و ددان و لێو

# ژیان و شێعرە کوردییەکانی
# "سەیفولقوزاتی قازی"
# ١٨٧٦-١٩٤٥

ئامادەکردنی
ئەنوەری سوڵتانی
حەسەنی قازی

بنکەی ژین
سلێمانی ٢٠٠٨

٩٢٨
س ٢٧٣ سوڵتانی، ئەنوەر
ژیان و شیعرە کوردییەکانی سەیفولقوزاتی قازی ١٩٤٥-١٨٧٦/ ئامادەکردنی ئەنوەری سوڵتانی، حەسەنی قازی.- سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٨.
٣٢٠ل: (١٧,٥×٢٥ سم)، بەڵگەنامە، وێنە، زنجیرە؛ ٩٧
١- سەیفولقوزات، ئەبولحەسەن- ژیاننامە. ٢- شیعری کوردی.
٣- قازی، حەسەن (ئامادەکاری دووەم) ٤- ناونیشان
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتاییی پۆلێن و پێرستی ئامادە کردووە

سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

زنجیرە: ٩٧

کتێب: ئازادی، سەربەخۆیی، میری و گەورەیی
داوا بـکەن بە زار و زمـان و ددان و لێـو
ژیان و شێعرە کوردییەکانی سەیفولقوزاتی قازی (١٩٤٥-١٨٧٦)

ئامادەکردن: ئەنوەری سوڵتانی، حەسەنی قازی

تایپکردن: سیروان خەلیل

مۆنتاج: لاس

خەت و رووبەرگ: ئەحمەد سەعید

تیراژ: ١٥٠٠

نرخ: ٦٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ٧٢٨ی ساڵی ٢٠٠٨

شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان



لە بڵاوکراوەکانی
بنکەی ژین
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی
عیراق: هەرێمی کوردستان، سلێمانی، ئەندازیاران، گەڕەکی ١٠٥، کۆڵانی ٥، خانووی ٢٣ سنووقی پۆست: ١٤
نۆرمال: ٣٣٠٠٢٦٢ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ یا ٠٧٧٠١٤٦٤٨٣٣ سانا: ١١٢٨٣٠٩
www.binkeyjin.com

# پێرست

## سەرەتا

برای بەڕێزم کاك حەسەنی سەیفی قازی لە مانگی فێبریوەری ۲۰۰٦دا سێ تاقم دەستنووسی شێعرەکانی نەمر میرزا حەسەنی سەیفولقوزاتی قازی- باوکی شەهید حەمە حسێن خانی سەیفی قازی و مامی پێشەوا قازی محەمەدی، هاوڕێ لەگەڵ کەشکۆڵە شێعرێکی دەستنووسی "ئوەیسی عوسمانی" پێدام،[1] بۆ ئەوەی بیانبەمەوە سەر یەك و بیاننووسمەوە و لە قۆناغی دواتردا بڵاویان بکەینەوە. سەیفولقوزات بابە گەورەی کاك حەسەنە.[2]

ئەوە شانازییەکی گەورە بوو بۆ منی ناچیز کە بتوانم ناوی خۆم بە شێعری سەیف متفەڕك بکەمو هەر بۆیەش، کارەکەم خستە پێش کاری دیکەوەو دەستم کرد بە هەڵبژاردنو یەکخستنەوەی لاپەڕە لێکدابڕاوەکانو جیاکردنەوەی شێعری کوردیو فارسیی شاعیر لەیەکترو هەروەها بەراوردکردنیان لەگەڵ یەك و لەگەڵ دەقی چاپکراوی شێعرەکانیش.

ئەرکی من لە نووسینەوەی شێعرە کوردییەکانو هەڵسەنگاندنیان، بەهۆی دیوانی چاپکراوی سەیفولقوزاتەوە هاسان دەبووەوە کە بەڕێز کاك ئەحمەدی قازی (قازی ئەحمەد) لە ساڵی ۱۳٦۱ (۱۹۸۲)دا بڵاوی کردۆتەوە و لەسەر ناوی کەسو شوێنو واتای وشەکان ڕوونکردنەوەی خستۆتە بەردەستی خوێنەر[3].

سەرەتا دەستنووسەکان، وەك گوترا، سیان بوونو پاشان کاك حەسەن تاقمێکی چوارەمیشی بۆ ناردم کە خۆی نووسیوەتەوە. سێ تاقمی یەکەمی دەستنووسەکان

---

[1] کاك حەسەن کوڕی خوالێخۆشبوو ڕەحیمی سەیفی قازییە، کە ئەویش کوڕی سەیفولقوزاتە.

[2] زانیاری لەسەر ئەم کەشکۆڵە هاوڕێ لەگەڵ زیاد لە ۱۰ پارچە شێعری چاپ نەکراوی سێ شاعیری ناوچەی موکریان لە چوار ژمارەی گۆڤاری "مەهاباد"دا بڵاو کردەوە. بڕوانە: گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ٤۳ و ٥٤ (ساڵی ۲۰۰٦) و ژمارە ٥۸و ٥۹ (ساڵی ۲۰۰۷).

[3] دیوانی سیف القضات، گردەوەکۆیی- قازی ئەحمەد، چاپی یەکەم، ۱۳٦۱ [ ۱۹۸۲]، چاپخانە سبز، تاران، ۸۲ لاپەڕە.

**فۆتۆکۆپین[٤]. دەستنووسە ئەسڵییەکان پشتو ڕوو نووسراون و هەردوك بە یەك پەڕە دێنە حیساب.**

**بەم پێیە، بەڵگەنامەکانی بەردەستی من بریتین لە:**

**١. تاقمی سەرەکی شێعرەکان کە تێکەڵاوێکن لە شێعری کوردیو فارسی**

**٢. تاقمی دووهەم، کە تەنیا شێعرە کوردییەکانن**

**٣. کەشکۆڵە شێعرێك کە ئەویش چەند شێعری سەیفی تێدا نووسراوەتەوە و**

**٤. دەفتەرێك کە کاك حەسەن خۆی لە شێعرەکانی سەیفی نووسیوەتەوە.**

**جگە لە شێعرەکان، چەند نامەو پەخشانیش لەناو دوو تاقمی یەكو دوودا هەن کە سەیف بەبۆنەی جیاوازەوە بۆ خەڵکانی جیاجیای ناوچەکەو کاربەدەستانی حکوومی نووسیون یا وەك وتاری فەرمیو وەعز و خیتابە، خوێندوونیەتەوە.**

**تایبەتمەندیی دەستنووسەکان دەکرێ بەم شێوەیە دەست نیشان بکرێن:**

**ئ- سەیف شێعرە کوردی و فارسییەکانی خۆی پێکەوە تۆمار کردوون و بە تێکەڵاوی لەگەڵ یەك نووسیونیەتەوە. وا هەیە ئەم کارەی بەو ئامانجە کردبێت کە سەرجەمیان پێکەوە "دیوان"ێك پێك بهێنن. شاعیرانی کلاسیك بۆیان مایەی شانازی بووە کە بتوانن "دیوان"یان هەبێتو کەسێك دەبووە خاوەن دیوان، کە لە هەر "بەحر"ێکدا لای کەم یەك پارچە شێعری بگوتایە واتە بۆ هەر پیتێکی عەرەبی یەك یا چەند شێعری هەبوایە. دیارە هەموو شاعیرەکان کاتێ دەگەیشتنە پیتی /ث/، /ص/، /ض/، /ط/، /ظ/ و /ق/ تووشی تەنگژە دەهاتن لەبەر ئەوەی وشەگەلێك کە کۆتاییەکەیان یەك لەو پیتانە بێت زۆر نین. ئەوەندەی من سەرنجم داوە، نەمر سەیفولقوزات توانیویەتی "دیوان" پێك بهێنێتو وا هەیە هەر بەو ئامانجەش بووبێت کە شێعری کوردیو فارسی پێکەوە لەگەڵ یەکتردا تۆمار کردوون. گەرچی ئەو مەسەلەی تەواو ڕوون نییەو من لە خاڵی دواتردا باسی هۆکارەکەی دەکەم.**

---

[٤] بڕوانە: پەراوێزی ژمارە ٢.

بڵاوکردنەوەی شێعری کەشکۆڵەکە کەوتە پێش بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبەو بۆ ئەم کارە سپاسی بەڕێوەبەرانی گۆڤاری مەهاباد دەکەم.

ب- دەستنووسەکانی بەردەستی کاك حەسەن‌و بەگوێرەی ئەوانیش کۆپییەکانی لای من، گەلێك شێواو و تێکەڵ پێکەڵن. دیارە بەدرێژایی ساڵان گەلێك دەستاودەستیان کردووە، شیرازەیان پساوەو بیچمی کۆمەڵێك پەڕەی بەربڵاویان بەخۆوە گرتووە. بەلای کەمەوە ٣ کەس هەوڵی نووسینەوەی شێعرەکانیان داوەو نوسخەی ئەوانیش بە تەواوەتی تێکەڵاوی نوسخەی سەیف بووە. جگە لەوە، دەستخەتی خەڵکانی دیکەش هەن، کە یا شێعرەکانی سەیفیان نووسیوەتەوە یا شێعری خۆیان‌و خەڵکی دیکەیان تێکەڵاوی ئەو پەڕانە کردووەو بۆ نموونە، سێ لاپەڕەیان دەستخەتی "ئیمامی"ن کە نازناوی نەمر محەمەدی قازی- وەرگێڕی ناوداری زمانی فارسی کوڕی ئامۆزای سەیفە.

جگە لەو سێ تاقمە دەستنووسە- وەك گوترا، نوسخەیەك لە شێعرەکانی سەیف بەدەستی کاك حەسەن خۆی، نووسراوەتەوە کە دەفتەرێکی قەبارە مام- ناونجییەو شیرازەی هەیەو لە ساڵانی ١٣٤٧ یان ١٣٤٨ی هەتاوی [=١٩٦٨/٩ز ] لە گوندی سەراو نووسراوەتەوە .

ڕێکەوتی نووسینەوەی دەفتەرەکە گرنگە، لەبەر ئەوەی نزیکەی ١٠ ساڵ پێش چاپی دیوانی سەیفی کاك ئەحمەدی قازی (قازی ئەحمەد) نووسراوەتەوە. کاك حەسەن دەڵێ شێعرەکانی لەبەر دەقی ئەو دەستخەتانە نووسیونەتەوە کە لەلای مەرحوومی شازدە خانم هاوسەری شەهید حەمە حسێن خانی سەیفی قازی بوون.

بەربڵاوی‌و بێ‌شیرازەیی لاپەڕە ئەسڵییەکان بۆتە هۆی ئەوەی لەسەردەمی جیاجیادا ژمارە بۆ لاپەڕەکان دابنرێت‌و بە شێوەیەك کە هەندێکیان دوو یا سێ چەشنە ژمارەیان بۆ دانراوەو ئەوەش کاری بردنەوە سەریەکی شێعرەکانی ئەستەم کردوەو ئەرکێکی زۆری دەوێ بزانرێت ئایا مەرحوومی سەیف "سەرجەم"ی یەك دیوانی هەبووە یان نا؟ بەتایبەت کە دەبێ گومانی ئەوەش بکەین هەموو پەڕەکان تەواو نەبن‌و هیچیان لێ‌نەفەوتابێت. ئەوەی کە هەندێ لە شێعرەکان بە ناتەواویی ماونەتەوە دەری دەخات کە نابێ پەڕەی ون بوو لە دەستنووسەکاندا کەم بن.

پ- لە بارودۆخێکی وەها ئاڵۆزدا، من بەباشی دەزانم کە شێعرە کوردییەکان لە بەشی فارسی جیا بکرێنەوەو بڵاو ببنەوە، ئینجا هەوڵ لەگەڵ شێعرە فارسییەکان بدرێت.

ت- تاقمی سێهەمی دەستنووسەکان، لەڕاستیدا کەشکۆڵە شێعرێکە سەرەتاو کۆتایی فەوتاوەو نازانرێ لە ئەسڵدا چەند پەڕە بووە. بابەتی ناو ئەم کەشکۆڵەش بەشێکی لە پێوەندی بنەماڵەی بەڕێزی قازییەکاندایەو چەند پارچە شێعری سەیفیشی گرتۆتە بەر.

گرنگایەتی کەشکۆڵەکە جگە لە لایەنی شێعریو ئەدەبی، ئەوەیە نووسەر ناوی خۆیو هەندێ کەسایەتیی ناوچەکەی بردووە و ساڵی نووسرانی شێعرەکانو ڕێکەوتی نووسینەوەی کەشکۆڵەکەی بەڕوونی دەست نیشان کردووە. نووسەرەوەی کەشکۆڵ، "ئوەیس عوسمانی"یە و شێعرەکانی لە ساڵی ١٣٣٩ی کۆچی هەتاویدا نووسیوەتەوە کە دەکاتە ساڵی ١٩٦٠ی زایینی. لەمەڕ کەسایەتی "ئوەیس عوسمانی" پرسیارم لە بەڕێز عەلی عوسمانی کرد. ناوبراو هەندێ زانیاریی ڕوونی سەبارەت بەو پێدام کە لێرەدا سپاسیان دەکەم. بەگوێرەی کاك عەلی، مەرحوومی مەلا ئوەیس بە "مەلا بابەوەیسی" ناسراوە، مامی خۆیەتی واتە برای کەسایەتی ناوداری ناوچەکە، ئەمر مەلا ئەمجەدی عوسمانیو خەڵکی "قەڵای ڕەسووڵە سیت"ی ناوچەی چۆمی مەجید خان بووە لە نێوان میاندواو و مەهابادو بۆکان. مەلا بابەوەیسی کوڕی مەلا محەمەد حەسەنو باوکی مەرحوومی مەلا جەسیم عوسمانییەو لە ساڵی ١٣٤١ واتە ١٩٦٢ (دوو ساڵ پاش نووسرانی دەستنووسەکە)، کۆچی دوایی کردووە.

لێرەدا زیاتر باسی کەشکۆڵی مەلا بابەوەیسی ناکەمو دایدەنێم بۆ ئەو کاتەی کە شێعرەکانی لە شوێنێکی دیکەدا بڵاو بکەمەوە. هەر ئەوەندە دەڵێم کە لەم تاقمە دەستنووسەدا شێعری بڵاونەکراوەی مەلا ئەمجەدی عوسمانیو قازی کاکە حەمەی بۆکانو چەند شێعرێکی سەیفیش نووسراوەتەوە، کە شێعرەکانی سەیف دەدەمە دەم شێعری دوو تاقمەکەی پێشوو.

ج- نزیکەی ساڵێك دوای ئەوەی سێ تاقمە دەستنووسەکانم بەدەستەوە بوون، کاك حەسەن هەندێك بەڵگەنامەو دەستخەتو وێنەی کۆنی بۆ ناردم کە لە درێژەی ئەم باسەدا هەموویان دەناسێنمو دەیانکەمە پاشکۆی کتێبە کە.

چ- هەندێ لە شێعرەکان لە دەستنووسەکاندا دووپات بوونەتەوە. ئەوە، بۆ من، گەلێك بەسوودە و دەتوانم بەراوردی شێعرەکان لەگەڵ یەکتر و هەروەها لەگەڵ دەقە چاپکراوەکەی قازی ئەحمەد بکەم.

ئەم بەراوردكارییە دەكرێ وشە بە وشە بێتو دەقی چاپكراویان بە چەند قات زیاتر بكات، دەشكرێ دەقێكی پاكردە لەسەر ئەساسی نوسخە دەستنووسەكەی سەیفو بەبێ ئەو زیادكراوانە چاپ بكرێتو خوێنەر لە سەلامەتو ڕاست بوونی شێعرەكان دڵنیا بكرێت. لە جیاتییان، ڕوونكردنەوەی پێویست لەسەر ناوی كەسو جێگاو هەروەها ڕێكەوتی ڕووداوەكانی جێگەی ئاماژەی شێعرەكان، بخرێنە پەراوێزی شێعرەكانەوە. ئەم كارە بەهۆی ئەو ڕاستییەوە گرنگایەتی پەیدا دەكات كە مەرحوومی سەیف كەسایەتییەكی سیاسی چالاك بووەو خۆیو بنەماڵەكەی لە پێوەندی ڕووداوەكانی ڕۆژانەی كوردستانو ئێراندا بوون، هەر بەم بۆنەیەشەوە بەشێكی بەرچاوی شێعرەكانی سیاسینو تێیاندا باسی گەلێك ڕووداوی سیاسی كراوە.

## ناوەرۆکی شێعرەکان

بەگوێرەی شێعرەکان، نەمر میرزا ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات مرۆڤێکی هەستیارو گەلێك خاوەن ئیحساسات بووە. دۆستایەتی گەرمو گوڕی لەگەڵ خەڵکانی دەورووبەری خۆی هەبووەو دۆستایەتییەکی گەنجانەی لەگەڵ هەندێکیان دامەزراندووە. ئەم دۆستایەتییە پێش هەموو کەسو زیاد لە هەموان "عەزیز ئاغای عەبباسی" خاوەن مڵکی گوندی "کولتەپەی قورمیش" دەگرێتەوە و دوای ئەو، خەڵکانی دیکەی ناوچەکەو مەئموورانی ناوچەیی ئێران، کە لێی نزیك بوون و شێعری بۆ گوتوونو هەندێ جار ئەوانیش شێعریان بۆ گوتووە.

بەشی بەرچاوی شێعرە کوردییەکانی سەیف پێوەندیان بە عەزیز ئاغای عەبباسییەوە هەیەو دوای ئەو، شێخ یۆسف شەمسەددینی بورهان°، کە ڕێزو ئیحتیرامی ئەویش لە زۆرێك لە شێعرەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوەو هەروەها عەلی بەگی حەیدەری– ئاغای گوندی حاجیالێکەند، بەڵام لە ژوور هەموو ئەو بابەتانەوە، کوردایەتی، نیشتمانپەروەری، ماف خوارویی گەلی کوردو ئارەزووی سەرفرازیو سەربەخۆییو ئاواتی پێشکەوتی ئابووریو ئاوەدانی کوردستان، شێعرە کوردییەکانیان پڕ کردۆتەوە.

سەیف تا مۆخی ئێسقان کوردە، خەمی دواکەوتوویی کوردستان دەخواتو ئارەزووی پێشکەوتو سەرفرازیی گەلو وڵات مێشکی داگرتووە. هەڵسوکەوتی ڕۆژانەو کارو ژیانیشی مۆرکی ئەو هەستو بیرەیان بەسەرەوەیە، تەنانەت ئەگەر بەشێکی ژیانی خۆی تەرخانی دارنانو باخەوانی دەکات، بۆیەیە کە دەبینێ

---

° خوالێخۆشبوو شێخ یۆسف شەمسەددین محەمەد لەنێوان ساڵانی ١٢٤٢ و ١٢٤٥ [١٨٢٦/٣٠] لە دەورووبەری لاجان لەدایك بووە، لە ساڵانی نێوان ١٢٧٧و ١٢٨٠ [١٨٦٠/٦٣]دا وەك خەلیفەی شێخی سیراجوددین هاتۆتە عیساکەندو پاشان گوندی بورهان، لەوێ خانەقای داناوەو گەورەپیاوانی ناوچە بوونەتە موریدی و هاتوچۆی خانەقایان کردووە. پاشان لە ساڵی ١٣٢٨ك [١٩١٠]دا وەفاتی کردووەو هەر لەوێ نێژراوە. بڕوانە: ابوبکر خوانچە سپهرالدین، "زندگینامە عارف ربّانی حضرت شیخ یوسف ملقب بە شمس الدین برهانی قدس سرّە"، انتشارات صلاح الدین ایوبی، ارومیە، ١٣٦٨ [١٩٨٩]، صص١٥٢–١٧٨.

هاوزمان و هاورەگەزەکانی بایەخی پێویستی پێ نادەن و لە ئەنجامدا چاو لە دەستی گەلانی دراوسێ دەمێننەوە و لە چلەی زستاندا تفاقی مەڕو مالاّت و میوەو سەوزەی خواردەمەنیشیان لەوان دەکڕن:

((حاسڵی عومروو لە زۆرو کەمی
داتان بە گیاو کا لەنێو عەجەمی...
باغان دابنێن، داران بنێژن!
نەجێب و عەسڵن، کۆن و لەمێژن
حەیفە میللەتێك شەش هەزار ساڵ بێ
نۆکەری مالاّن ڕووت و ڕەجاڵ بێ...))

ئەو شێعرە لە ڕاستیدا بۆ عەزیز ئاغای عەبباسی گوتراوە، بەلاّم وەك گوتم کوردایەتی و خەمی ولاّت مێشکی سەیفی بەشێوەیەك داگرتووە کە پێوەندە دۆستایەتی و شەخسییەکانیشی لەودا واتا پەیدا دەکەن، نەك هەر پێوەندی شەخسی، بەڵکوو بڕوای ئایینی و تەریقەت و موریدایەتیی شێخی بورهانیش لە ئەنجامدا دەبنەوە پاڕانەوە بۆ کوردو ئەویش دەبێتە کوردایەتییەکی بێخەوشی سیاسی.

سەیرێکی شێعری یەکەمی دیوانەکەی ئەو ڕاستییە بە باشی دەردەخات. شێعرەکە لە پەسنی خوداو پێغەمبەر دایەو بە ستایشی خودا دەست پێ دەکات:

((بۆ تۆیە، هەر بە تۆیە دەتوانم بکەم سەنا
ڕۆژو شەوێ تۆ دێنی، دەبەی مەغریب و عیشا...))

ئینجا لە درێژەیدا دەگاتە سەر پەسنی پێغەمبەر:

((هەردەم سەلاتی زۆرو سلاّوێکی بێ ژمار
دیاری بۆ ڕۆحی پاکی تۆ، ئەی فەخری ئەنبیا!...))

بەلاّم دواتر، هەر ئەو شێعرە ئایینیە خواپەرستانەیە بەرەو ئاقارێکی دیکە دەبات و هەستی نەتەوایەتیی خۆی ئامێتەی بڕوا ئایینیەکەی دەکات:

((کوردین و بێ کەسین و لە هەر لایە دەرکراو
دەستێ وەدس مە دە، کە لەڕێت ئێمە لانەدا
یانی، نە مڵك و ماڵە لە بۆمە، نە حاڵ و باڵ

بێ جاه و بێ جەلال و بێ حاڵ و بێ سەلا))

لە کۆتاییشدا دەست لە پاڕانەوەو لالانەوە هەڵدەگرێت و بانگی ڕاسان و ڕاپەڕین دەدات. وەك ئەوەی هەست بکات پاڕانەوە سوودێکی بۆ ئامانجەکانی نابێت:

((ئەمڕۆ "حەسەن" موئەززینی کوردانە، بانگ ئەدا:
هەستن لە خەو، وەخڕێن و "حی علی الصلا!"))

کەسێك بەو هەستە کوردانەیەوە، لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کێشەکانی سەردەمدا کاردانەوەی دەبێ چۆن بێت؟

مەلایەکی دوازدە عیلم و ئیماندارێکی بێخەوشی موسوڵمان و موریدێکی بێ ڕیای خانەقای بورهان، کاتێ دەبینێ دەراوێك بۆ کورد ڕوون بۆتەوەو سوپای سۆڤییەتی لەناوچەکەدا جاندرمەو مەئموورانی زۆرداری ئێرانییان قەمتەر کردوە، سێ و دووی لێ ناکات و بەم شێوەیە لە ڕێبەری هەموو بێدینانی جیهان دەدوێت و بە "پێشەوا"ی خۆی دادەنێت:

((کوردینە! ئەوڕۆ ڕۆژی گەپ و کەیف و شادییە
لەو نیعمەتە کە بۆمە "ستالین"ە حامییە...
قوربانی پێشەوایەکی وا بۆ نەبێ "حەسەن"؟...))

بەڵام لێرەشدا خاڵی سەرەکی بڕوا بە خەباتی گەلەکەیەتی، هەر بۆیەشە یەکگرتنی ڕیزەکانی گەل دەخوازێت:

((قوربانوو بم وەرن ببنە دۆستی یەکتری!....))

لە شێعری کوردی و فارسی سەیفدا ناتەباییەکی ڕواڵەتی بەرچاو دەکەوێت. لەکاتێکدا شێعرە کوردییەکان ڕەنگدەرەوەی تووڕەیی و نارەزایەتی شاعیرن لەکاربەدەستانی غەیرە کوردی ناوچەکەو ئەم تووڕەییە هەندێ جار دەگاتە ڕادەی هەڵچوون:

((مەئمووری حیزو بێشەرەف و خائینی وەتەن
ڕاپۆرت بدا، بلا بەدرۆ، چونکە داوییە!
"سەرتیپە شێتە" هۆشی کەرێکی تەواو نەبوو
تەهدید دەکا بە کوشتنێ، ئەم دەم گواوییە...))

بەڵام هەندێ لە شێعرە فارسییەکان پێدا هەڵگوتنیان تێدایە نەک هەر بۆ مەئمووڕانی ناوچەیی، بەڵکوو بۆ کاربەدەستانی تاران و تەنانەت ڕەزا شا.

ئەم بەڕواڵەت ((بێ هەڵوێستی))یە ئەنجامی بارودۆخی سیاسی کوردستانە لەو ساڵانەدا. تەنانەت دواتر و لە سەردەمی کۆماری کوردستانیشدا- کە کەمو زۆر ساڵێک دوای کۆچی دوایی سەیف دامەزراوە، سەبارەت بە خودموختار بوون و سەربەخۆ بوون هەڵوێستێکی تێکەڵاو لەئارادا بووەو لە قۆناغی جیاجیادا باس لە هەردووکیان کراوە

سەیف، بەگوێرەی شێعرەکانی، لایەنگری سەربەخۆیی کوردستانە، بەڵام ئەو سەربەخۆیی‌یە زۆر نزیک و گونجاو نابینێت و لە ئەنجامدا هەوڵی وەرگرتنی ماف کورد لە ناوخۆی ئێران دەدات و بەشێکی ئەم هەوڵە، لە ڕێگەی نیشاندانی برایەتی کوردو فارسەوە دەردەبڕێت، بەشێکی دیکەشی بەهۆی نیشاندانی ((خوێنی ئێرانی لە ڕەگی کورد)) دا

((خۆ کوردو فارس هەردوو بەری دایک و بابێکن...))

یا:

((هەر کوردە خوێنی خالیسی ئێرانی پاکی بێ...))

لە بواری چەسپاندنی ئەو "برایەتی"یەی کوردو فارسیشدا، سەیف هەڵوێستی ئێرانچییەتی دەگرێت و هەندێ جار بەشان و باڵی ئەم و ئەودا هەڵدەڵێت، کە ئەوانە بەگشتی لە شێعرە فارسییەکاندا ڕەنگیان داوەتەوەو لە شێعرە کوردییەکانیدا بەرچاو ناکەون.

وا هەیە هۆیەکی ئەم لایەنە نەرمەی شاعیر بە نیسبەت فارس و ئێرانییەوە لەوەدا ببینرێت کە زوڵم و زۆرو بەرتیل وەرگرتن و گرتن و لێدان و کوشتنی کورد لە ناوچەکە، بەدەستی مەئمووڕانی ئازەربایجانی لە موکریان بەڕێوە چووەو لە زۆر کاتدا سەدا نەوەدی مەئمووڕانی حکوومی، تورکی ئازەربایجانی بوون نەک فارس، بە تایبەت جاندرمە، کە هەر تاقیان فارس نەبوون. ئەوە وا هەیە هۆکارێک بوو بێت بۆ ئەوەی سەیف لە دەست زوڵم و زۆری ئەوان پاڵ بە فارس و ئێرانی و مەرکەزنشینانەوە بدات و هاندەریان بێت بۆ ئەوەی تیتۆڵێک لە کورددا بدرێن و ماف بپارێزن:

((مەرکەز لەبەر چی هیچی نەپرسی لە حاڵی وان؟))
[ لە حاڵی کورد]...

یا:

((پێم کوت بە پادشاو وەزیرو نەخوست وەزیر
ئاورێك وە کوردی دەن وە بە حاڵی بڵاوییە))

بە گشتی، سەیف ڕۆڵەی ڕۆژگاری خۆیەتیو نەبزی لەگەڵ نەبزی زەمانە لێ دەدات. نیشتمانپەروەرێکی کوردە بۆ سەلاحو خێری وڵات هەموو دەرگایەك دەکوتێتو پەنا دەباتە بەر هەموو دەرەتانێکی گونجاو، بەڵام لە ژوور هەموو شتێكو پێش هەموو شت، کوردە، بە کوردی دەژیو بە کوردی دەمرێت. جا ئەگەر بە گوێرەی بارودۆخ بەشانو باڵی ئەمو ئەویشیدا هەڵگوت. یا هەوڵی نوێنەرایەتیی پەرلەمانی ئێرانیدا، سەیفی ڕاستەقینەو کورد پەروەر، گۆڕانێك بەسەر هەڵوێستو باوەڕیدا نایەتو بە هەموو تواناوە هاوار دەکات:

((هەرچی دەبێ بلا ببێ، حەق هەر دەڵێ "حەسەن"
نیمە لە ڕێی وەتەن غەمی دەرکردنو جنێو))

سەیف لە قۆناغێکی ژیانیدا، لە ژێر کارتێکەریی تەبلیغاتی زۆری دەزگا تەبلیغاتییەکانی بریتانیاو لایەنگرانی لە ئێران- کە بووە هۆی چەواشەبوونی گەلێك لە ڕووناکبیرانی ئێرانیش، دژ بە حوکمی قاجارەکان لە ئێران وەستاو لە پەسنی ڕەزا خانی میرپەنجدا شێعری گوتو تەبلیغاتی بۆ کرد. سەیفو خەڵکانێکی زۆر لە ئێرانی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم فریوی ڕواڵەتی فریوکارانەی ڕەزا خانیان خوارد، لەگەڵ شایەکی دیموکراتی وەك ئەحمەد شای قاجار دژایەتییان کردو بوونە بەردەبازی ڕەزاخان بۆ گەیشتن بە دەسەڵات. بەڵام دوای سەندنی دەسەڵات، ڕەزا خان لە بەڵێنی جمهورییەتی ئێران پاشگەز بووەوەو خۆی کردە شا، ئەویش چ شایەك! لە قۆناغی ئەو گۆڕانکارییانەدا، سەیف چالاکانە کاری سیاسی کردووە، خەڵکی بەدەوری خۆیەوە کۆکردۆتەوە و ڕێکخراوەی سیاسی بنیات ناوە. لەناو شێعرە فارسییەکانی سەیفدا ئەو چالاکییە سیاسییانە زیاتر خۆ دەنوێنن. شێعری هەن کە لە قۆناغی جمهورییەت خوازیدا پەسنی ڕەزا خانی داوەو دواتر، تەنانەت پەسنی ڕەزا شا لە سەردەمی پاشگەزبوونەوەی لە بەڵێنەکانیو خۆبەشاکردنیدا!

ئەم شێعرانەو ژمارەیەکی تر لە شێعرە فارسییەکان، شێعری موناسەبەن و لەم ڕوانگەیەوە، هاوشێوەی شێعری شاعیرانی فارسی سەردەمی مەشرووتەو دوای مەشرووتەی ئێرانن (عارف قەزوێنی، عیشقی سنەیی هەمەدانی، مەلیکولشوعەرای بەهار و ...).

شێعرە موناسەبە فارسییەکانی سەیف بۆ گەلێك بابەت و زۆرێك لە خەڵکانی ناوچەیی گوتراون. سەیف شێعری فارسی هەن، کە لە پەسنی بزووتنەوەی شێخ محەمەدی خیابانیدا گوتوونی. ئەو کە چالاکی بواری سیاسەتی ڕۆژ بووە، تەنیا بە شێعر گوتن بۆ بزووتنەوەکە نەوەستاوە، بەڵکوو بەگوێرەی بیرەوەرییەکانی مەرحوومی خەلیلی فەتاحی قازی لە پێوەندی نزیکی خیابانیشدا بووە، کومیتەی "ئازادیستان"ی لە شاری مەهاباد بنیات ناوە و خۆی سەرۆکایەتیی کردووە[٦]. شێعرە فارسییەکان لەم بوارەشدا یارمەتی باش دەدەن و دەراو ڕوون دەکەنەوە. پارچە شێعرێکی سەیف لە گۆڤاری "ئازادیستان" ئۆرگانی حزبی دێموکراتی شەهید محەمەدی خیابانیدا چاپ کراوە:

((اسیر و بسته آن زلف تار برتارم
غلام و کشته آن چشم مست بیمارم
فدای آن قد رعنای سرو آزادت
فدای منطق شیرین لب گهربارم
بیابه خانه ما ای عروس آزادی!
ز غیر گشته مخلد، نشسته، بیدارم...))[٧]

---

[٦] بڕوانە: خەلیل فەتتاحی قازی، "تاریخچه خانواده قاضی در ولایت مکری"، ویراستار قادر فتاحی قاضی، تبریز، ١٣٧٨ [١٩٩٩]، فارسی، لاپەڕەی ٤٢.

[٧] لەگەڵ کاك حەسەن ئەو سێ پارچە شێعرەی سەیفمان لە توێی وتارێکدا بڵاو کردەوە. بەڵام بە ساڵانێکی زۆر پێش ئێمە، خوالێخۆشبوو دوکتور ڕەحیمی سەیفی قازی لە کتێبەکەیدا "قازی محەمەدو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوایەتیی گەلی کورد" کە بە زمانی کوردی و فارسی نووسیویەتیەوەو بەداخەوە تائێستا چاپ نەکراوە، بابەتێکی سەبارەت بەو شێعرانە نووسیوە کە من هەوڵ دەدەم وەك بەشێك لە پاشکۆی هەر ئەم کتێبە بڵاوی بکەمەوە.

سەیف، بەگوێرەی بیرەوەرییەکانی کاک خەلیل، یەکەم سەرۆکی دائیرەی فەرهەنگی شاری مەهاباد بووە[8]، هەوڵی کردنەوەی خوێندنگەی نوێی داوە، بەڵام درەنگتر دەستی لە ئیدارەی فەرهەنگ هەڵگرتووەو لە ئەنجامدا برازاکەی واتە پێشەوا قازی محەمەد بۆتە سەرۆکی دائیرەکە. گەرچی ڕێکەوتی ئەم مەسەلەیە لە بیرەوەرییەکانی کاک خەلیلدا ئاشکرا ناکرێت، بەڵام دوور نییە، ئەم خۆکشاندنەوەیەی سەیف بۆ ئەوە بووبێت خۆی بکاتە کاندیدی نوێنەرایەتیی پەرلەمانی ئێران لە شاری مەهاباد، کە هەر بەگوێرەی کاک خەلیل، زۆرایەتیی دەنگەکانیشی هێناوەتەوە، بەڵام کاربەدەستانی حکوومی سندووقی دەنگەکانیان گۆڕیوەو زۆربەی دەنگیان بۆ مەرحوومی عەلی بەگی حەیدەری خاوەن مڵکی گوندی حاجیاڵیکەند هێناوەتە حیساب[9].

دوای ئەو دەستتێوەردانە ئاشکرایەی کاربەدەستان لە کاری دەنگدانەکە، سەیف نامەیەکی شێعری بۆ ڕەزا شا دەنووسێ و بە ڕەسمی سەردەم بۆ ئەوەی پیس و پلۆخی کارەکان ئاشکرا بکات و بمێنێتەوە نەشکەوێتە بەر داپلۆسینی ڕژێم! حیسابی ڕەزا شا لە کاربەدەستان جیادەکاتەوەو هیوای ئەوە دەخوازێ کە ڕەزا شا بەرگری لەو بێدادو زوڵمە بکات- گەرچی بەدڵنیایی ئەویش و خەڵکانی تریش دەیانزانی ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە!

((به خاکپای شهنشه ببر برید رسالت
کند به عرض تظلم شکوه ملك دلالت
برای ملك از این سوء انتخاب چه حاصل ؟
که عالمی بود اندر فشار و یأس و کالت...
شدەست مجلس شورا مگر تیول وزیران ؟
ز هریکی شده یکدسته انتخاب و حمالت
بگو به مجلس شورا تو ای مؤسس قانون!
پی اساس تو، قانون به ظلم، چون شده آلت ؟

---

[8] خەلیل فەتتاحی قازی، هەمان سەرچاوە، ل٤٢.

[9] هەمان سەرچاوە، ل٤٣، ٥٢.

بزور نیزه چو آرامی برند به غارت،
موکلم به ستیزه دهند امر نکالت.....))

نامەی گازندەو گلەیی و ناڕەزایەتی دەربڕینی سەیف یەك و دوو نین. ئەم نامە شێعرییانە ئاڕاستەی دەوائیری حکوومی و کەسایەتی و کاربەدەستانی ناوچەیی کراون و تێیاندا لە زوڵم و زۆرو بێعەداڵەتی و یاساشکاندن و نەبوونی دادپەروەری لە ناوچەکەدا شکایەت کراوە- جا بێعەداڵەتی چ دەرحەق بە خۆی بووبێتن چ دەرحەق بە خەڵکی ناوچەی موکریان.

نامە بۆ "ئەندامانی مالیەی ئەیالەتی [ئازەربایجان]" لە ساڵی ١٣٠٨ [١٨٩١/٩٢]دا، نموونەیەکی ئەو هەوڵانەیە:

((باز به مالیه‌ام فتاده سروکار
باز به یك درد بیدوام گرفتار
در عجبم این جماعت از چه بدینسان
سنگدل و بی عطوفتند و ستمکار؟
در دلشان مهر و رحم و لطف و کرم نه
هر چه تضرع کنی و لابه و زنهار
مسلکشان کبر و ناز و عجب و تکبر
مقصدشان ظلم و جور و زحمت و آزار...))

یا نامە بۆ "پێشکار"- کە وا هەیە پێشکاری مالیەی ئازەربایجان بووبێت:

((...پس به حسابم برس! بس است عذابم
کرده مرا انتظار مرکزیان، زار))

یا نامە گۆڕینەوەی شێعری لەگەڵ "امیر اقبال"- موفەتتیشیماڵیەی مەراغە:

((پا به هر گوشه مالیه نهی، می بینی
زیرپا چند کس افتاده در این دام بلاست
همه ماتم زده، گریان و پریشان، نالان
مر به مالیه بهرروز، زنو عاشوراست؟))[١٠]

---

[١٠] سەبارەت بە هەڵوێستی سەیف لە بەرانبەر مالییەی ئازەربایجانیشدا، لەگەڵ کاك حەسەن وتارێکمان نووسی و بەتەما بووین بینێرین بۆ ڕۆژنامەی "پەیامی کوردستان" لە مەهاباد، کە

وەك گوتم، هەندێ لەو تەنگژانەی لە شێعرەکاندا ئامارژەیان پێ کراوە کۆمەڵایەتین‌و هەندێکیان شەخسی. وا دەردەکەوێت کە دەسەڵاتدارانی حکوومی– لە کەسایەتی قورس‌و قایم‌و لێزانی‌و تێگەیشتوویی سەیف‌و ڕێزو ئیحتیرامی لەناو خەڵك خۆشحاڵ نین و پلەو پایە بە کەسانێك دەدەن کە دەستەمۆی خۆیان بن‌و هەوای سەرفرازیی گەل‌و هەستی کوردانەیان لەسەردا نەبێت. هەر بۆیەش سەیف بە بەڵێنی بەتاڵ لە چاوەڕوانیی پۆست‌و مەقام ڕادەگرن‌و لە ئەنجامدا درۆی لەگەڵ دەکەن‌و سەری بێ‌کڵاو دەهێڵنەوە. وەعدەی پۆستێکی دائیرەی ماڵیە لە ناوچەکە، یەك لەوانەیە. لە چەند پارچە شێعردا، سەیف باسی ئەو ناڕاستی‌و درۆو دەلەسەیەی کاربەدەستانی ئازەربایجان‌و تاران دەکات کە تەنانەت ماوەی حەوت مانگ لە شاری تەورێز بە چاوەڕوانی دەیهێڵنەوە، بەڵام هیچ وەڵامێکی نادەنەوە.

((چند بمانم اسیرو زار بە تبریز؟
چند کشم جور، پشت میز، ز گفتار؟))

یا:

((از چە رو حل نکند مسألە "ماژور دیویس"؟
مستشاریش ز آمریك، بە ایران زچراست؟
چون فرنگی بە درنگی نکشانند عمل،
چار سال است مر این کار بە شکل اولی است...))

یەك لە شێعرە فارسییە سەرکەوتووەکانی سەیف ئەو شێعرە فارسییەیە کە لە وەڵامی "محمد هاشم میرزای ئەفسەر"– نوێنەری پەرلەمانی ئێراندا نووسیویەتی. هاشم میرزا لە شێعرەکەیدا گلەیی لەوە دەکات کە گەلانی دانیشتووی وڵاتی ئێران وەك تورك‌و عەرەب‌و کوردو ئەوانی تر بەهۆی "اختلافات محلی"یەوە ئێرانیان تووشی ئاڵۆزی کردووەو لە درێژەیدا دەڵێ دەرمانی ئەو دەردەی ئێران ئەوەیە خەڵك یەکیەتی خواست‌و ئارەزوویان هەبێت واتە هەموان خوازیاری یەك شت بن. دیارە محمد هاشم میرزا لە شێعرەکەیدا گلەیی لە "فارس"ەکان ناکات‌و گەلانی دیکەی ئێران بەهۆکاری بشێوی‌و ئاڵۆزی دادەنێت:

---

وەرچەرخانێکی ناخۆش لە سیاسەتی ڕۆژنامەکەدا ڕووی داو ئیتر بە سەلاحمان نەزانی وتارمان لەو شوێنەدا بڵاو بێتەوە.

((ترک و تازی، دیلم و کرد و بلوچ و لر، به ایران
مملکت آشفته کرد از اختلافات محلی
درد ایران راهمی خواهی بدانی چیست درمان ؟
وحدت آمال ملی، وحدت آمال ملی !))

سەیف لە وەڵامی شێعرەکەی محمد هاشم میرزادا پارچە شێعرێك لەسەر هەمان کێش‌و سەروا دەڵێت‌و بۆی ڕوون دەکاتەوە کە هۆی ئەو بشێوی‌و ئاڵۆزییانە، حکوومەتە، نەك خەڵك و ئەگەر بمانەوێت یەکیەتی خواست‌و ئارەزوو لە ئێراندا هەبێت، سەرەتا پێویستە "جیاوازی" نەمێنێت‌و ئەوانەی وا لە مەرکەز دانیشتوون– واتە حکوومەت، دەبێ هەموان بە یەك چاو سەیر بکەن‌و نابەرابەرییەکان لەناو بەرن:

((رفع باید کرد از اول، اختلافات محلی
تا از آن آسان بیابی وحدت آمال ملی....
انتظار وحدت فکرو نظر دارم ز مرکز...))[11]

لە شوێنێکی دیکەدا، ڕەخنە لە سیاسەتی یەکسان کردنی جلوبەرگی ڕژێمی ڕەزاشا دەگرێت‌و دەڵێ "جیاوازی ڕواڵەت" هیچ نییە، وەرن "جیاوازیی دەرفەت‌و دەرەتان"و هەروەها بێدادگەریی کۆمەڵایەتی لەناو بەرن:

((متحد الشکل گشته‌ایم به ظاهر
این همه تبعیض و فرق چیست در انظار ؟ ...))

★ ★ ★

شێعری سەیف، بە کوردی‌و فارسییەوە، شێعری سەردەمی دوای مەشروتەی ئێرانن. تایبەتمەندیی سەرەکی شێعری مەشروتە، سیاسی بوون‌و بەرپرس بوون وبە زمانی کۆمەڵانی خەڵك نووسینە. ئەم سێ خەسڵەتە بە ئاشکرا لە شێعرەکانی سەیفیشدا دەبینرێن. تایبەتمەندییەکی دیکەی شێعری سەیف ئەوەیە بۆ

---

[11] سەبارەت بە شێعرەی سەیف‌و هاشم میرزاش، لەگەڵ کاك حەسەن وتارێکمان نووسی‌و بڵاو کردەوە. بڕوانە: حسن سیف قاضی و انور سلطانی، "وحدت ملّی وتنوع قومی در اشعار سیف القضات"، روزنامه "پیام کردستان"، مهاباد، شماره ۳۳، ۲۹ جولای ۲۰۰٦، صفحه ۹ (ڕۆژنامەکە عینوانی دانراوی ئێمەی بۆ وتارەکە گۆڕی).

"موناسەبە" گوتراون و ئەوەش هەر خەسڵەتێکی شێعری شاعیرانی ئەو سەردەمەیەو شاعیرانی وەك لاهووتی و عارف و ئیرەج میرزا و نەسیمی شیمال و ئەوانی تر بە بۆنەی ڕووداوی تایبەت یاخۆ لە پەسنی خەباتکاران و دژ بە نەیارانی ئازادی و دێموکراسی شێعریان گوتووە. بە هەمان شێوە، سەیفیش شاعیری شێعری "بۆنە"و موناسەبەیە. بڕوانەئەو شێعرانەی بۆ هاتنی سوپای سوور بۆ ناوچەی موکریانی گوتوون و پەسنی ستالین و میرجەعفەری ئازەری و... هتد، یاخۆ ئەو چەند شێعرە خۆمانەو لەبەردڵانەی کە بۆ عەزیز ئاغای عەبباسی گوتوون و تێیدا باسی ئاش و باغ و ڕێگا کردنەوەو سەرماو سۆڵی ساڵێکی تایبەت و هاتن و چوونی ئەم و ئەوی کردووە یاخۆ باسی زیارەت و سەردانی خانەقای بورهان و دەیان دیاردەی دیکەی ناوچەکە.

وا هەیە بتوانین تایبەتمەندییەکی دیکەی شێعری سەیف بە "ئایینی و سۆفیانە" دابنێین، لە زۆرێك لە شێعرەکاندا- تەنانەت شێعری سیاسی و دۆستانەش، پەسنی خودا، پێغەمبەر، چواریار و شێخی بورهان و تەنانەت ئیمامان و "پێنج تەن"ی ئالی عەبا- کە ئەمیان تایبەت بە موسوڵمانانی شیعەیە، ڕەنگی داوەتەوە.

هاوڕێ لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییانەو هەندێ جار تەنانەت پێش ئەوانیش، هەستی دۆستانەو خالیسانەی شاعیر بۆ هەندێ کەس و زیاد لە هەموان بۆ عەزیز ئاغای عەبباسی، وەك شەوقێك کەوتۆتە سەر شێعری سەیف و درەوشاندوویەتەوە. ئەو شێعرانەی وا بۆ عەزیز ئاغای گوتوون، مرچ و مۆن و تووڕەو تۆسن نین، هێرشکارییان تێدا نییەو لە توندوتیژی بەدوورن، نەرم و ڕەوان و ڕووخۆش و شاد و پڕ لە بزەن، شێعرێکن خۆماڵی و شاعیر بۆ دڵی خۆی و هەستی خۆی گوتوون، بۆ کەسێکیشی ناردوون کە وا دەردەکەوێت نزیکترین و خۆشەویست ترین دۆست و هاودەمی بووبێت. کاك ئەحمەدی قازی پەیوەندیی سەیف و عەزیز ئاغای عەبباسی بە پەیوەندیی نێوان مەولەویی ڕۆمی و شەمسی تەورێزی شوبهاندووە، کە وێدەچێت لە شوێنی خۆیدا بێت (بڕوانە دواتر).

ئەوەی وا لە سەرەوە سەبارەت بە شێعرە فارسییەکانی سەیف و مەسەلەی پەیوەندی سەیف و مەئموورانی حکوومی گوترا، ڕوونکردنەوەیەکی پێویستە: هەموو ئەو شێعرانە دارماڵی ڕەخنە لە داموو دەزگا حکوومییەکان و هەوڵی ڕاگەیاندنی نالەباری و بێسامانیی سیاسی و ئابووریی ناوچەی موکریانیان تێدا دراوە. تەنانەت

لە تاقە یەك شێعریشدا سەیف داوای خەڵاتو بەخششی لە کەس نەکردووەو بە ڕەسمی هەندێ لە شاعیرانی دیکەی ناوچە، نە ئەسپی لێیان ویستووە نە زین! سەیف کەسایەتییەکی ناسراوی ناوچەکە بووەو بەرزترین مەقاماتی ڕژێم پەیوەندییان پێوە کردووە، دیوەخانیشی دایم جمەی هاتووە. هەر بۆیەش ڕێزی خۆی پاراستووەو لەگەڵ هەمواندا پەیوەندی باشی ڕاگرتووە، لەو پەیوەندییەش بۆ خێرو سەلاحی گەلەکەی کەڵکی وەرگرتووەو هەوڵی هێنانە سەر عەقڵی ڕژێمو نەرم کردنی لایەنی مەئموورە پلە بەرزەکانی ناوچەکەی داوە، هەمووشی بۆ بەرژەوەندی گەلەکەی.

سەیفو پێشەوا و بە گشتی بنەماڵەی قازی لە ناوچەیەکدا دەژیانو مڵکدارییان دەکرد، کە بە تەونی عەشیرەیی چنرا بوو. ئەوان کە خاوەنی هیچ عەشیرەتێك نەبوونو تەنیا لە ڕێگەی ژنو ژنخوازییەوە لە بەگزادەی فەیزوڵڵا بەگی نزیك بوون[١٢]، لە چەند لاوە هەستیان بە مەترسی دەکرد: پێش هەموان دێبۆکرییەکان بوونو بە دەرەجەیەك کەمتر، مەنگوڕ و تەنانەت مامەش، ئەوە جیا لە ئازەربایجانییەکانی میاندواو و مەراغەو دەوروبەر، کە ئەگەر سیاسەتی وریایانەی سەیفو گەورە پیاوانی بنەماڵەکە نەبوایە، دەیانتوانی وەك کورد و وەك سوننی و وەك خاوەن مڵکیش لەگەڵیاندا بکەونە کێشەوە.

ئەو ڕاستییە عەینیانە، بنەماڵەی قازی کردبووە کەسانێکی ئاشتیخوازی دوور لە شەڕو هەراو پێکدادان، کە هەوڵی زۆریان بۆ نزیکایەتیو دۆستایەتی لەگەڵ دراوسێکانیانو هەروەها بەشێوەیەکی ژیرانە، بۆ ڕاگرتنی خاتری حکوومەت دەدا. ئەم تەبعە نەرمو ئاشتیخوازانەیە لە سەیفو لە پێشەواشدا دەبینراو ئەگەر کەسایەتی ئاشتیخوازی پێشەوا نەبوایە، لە ماوەی تەمەنی کۆماردا، بەدەستی بەتاڵ نەدەکرا شەڕو هەرای عەشایری دەوروبەری مەهابادو ئاژاوە نانەوەی حکوومەتی ناوەندیو کێشەی سنوور لەگەڵ ئازەربایجانییەکان چارەسەر بکرێت- کارێك کە پێشەوا بەباشی ئەنجامی دا.

---

[١٢] یەکەم هاوسەری سەیفولقوزات، زبێدە خانم، کچی مەرحوومی شێربەگ لە ئاغاوەتی خاوەن دەسەڵاتی ناوچەی فەیزوڵڵابەگی بوو.

گەلێك جار باس لەوە دەكرێت كە ئایا بزووتنەوەی نەتەوایەتیی كورد لە ساڵانی پێش دامەزراندنی كۆماری كوردستانی ١٩٤٦و خودی كۆماریشدا، بزووتنەوەیەكی سەربەخۆییخوازی بوو یاخۆ جووڵانەوەیەك بوو بۆ دابینكردنی هەندێ ماف لە چوارچێوەی حكوومەتی ئێراندا. سیاسەتی گشتی كۆمارو ڕاگەیاندنی ڕێبەرانی كۆماریش نەك هەر تەمی ئەو پرسیارە ناڕەوێنن، بەڵكوو بەڵگە بۆ هەردوو بۆچوونەكان بەدەستەوە دەدەن. ئەو دیاردەیە ڕاست لە شێعرو قسەو هەڵوێست گرتنەكانی سەیفیشدا دەبینرێت.

ڕاستەقینە ئەوەیە بزووتنەوەی نەتەوایەتیی كوردی ڕۆژهەڵات لەو بڕگە تایبەتە زەمەنییەدا كۆرپەیەكی ساوا بوو، هێشتا نەگەیشتبووە پلەیەكی ئەوتۆ كە بتوانێ ئەركی گەورەو گرانی جیابوونەوە لە ئێران‌و دامەزراندنی بنەمای ئابووری- سیاسی- سوپایی حكوومەتێكی سەربەخۆی كوردی دابمەزرێنێت، بەتایبەت كە ناوچەكانی سنەو كرماشان‌و ئیلامی لەگەڵ نەبوون. دیاردەی حكوومەت‌و دەسەڵاتی كوردیش تەنیا بە بوونی سوپای سوور و پارێزگاریی سیاسی- سوپایی ئەوانەوە واتای پەیدا كردبوو. بەڵام سەربەستی، خەونی هەموو كوردێك بوو- وەك ئێستا لە باشووری كوردستانی ساڵی ٢٠٠٨یشدا وەهایە. ئەوەش كە دەیتوانی خەونەكە بهێنێتە دی، تەنیا هێزی لاوەكی‌و "دۆستە بێگانەكە" بوو، كە هەژار گوتەنی ((ئەودەم، قزە بوو))، خەڵك‌و ڕێبەرانی كۆماریش بەو ڕاستییەیان دەزانی‌و لە كارو كردەوەیاندا دوورەپەرێزییان ڕەچاو دەكردو خۆیان لە قەرەی توندوتیژی نواندن‌و گڤە كردن نەدەدا.

هەڵوێستی سەیفیش- كە تەنیا ماوەی یەك ساڵ پێش دامەزراندنی كۆمار كۆچی دوایی كرد، عەینوبیللا وەهایە، لە ناڵ‌و لە بزمار هەردووكیان دەدات، كورد لەگەڵ گەلانی دیكەدا بەراورد دەكات‌و دەڵێ ئێمە چیمان لە خەڵكانی تر كەمترە كە دەسەڵاتی خۆمان بەدەستەوە نییە؟ بەڵام لە عەینی كاتدا ڕووی قسە لە مەئموورانی حكوومەتی ئێرانیش دەكات‌و لێیان دەخوازێت ئاوڕێك لە كورد بدەنەوەو تیتۆڵێكی لێ دابدڕن لەبەر ئەوەی ((كوردو فارس برای دایك‌و بابێكن))و ((خوێنی خالیسی ئێرانی لە ڕەگیاندایە)). ئەو دووڕێیانەی وا لە بەردەم سەیف بوو، لەبەردەمی ڕێبەرانی كۆماریش بوو و هەردووش لە ڕاستیدا ئەنجامی لاوازیی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی كورد و نەبوونی بنەمای فیكری- سیاسی لە سەردەمی ئەو كاتەی

ڕۆژهەلاتی کوردستان، وەك ئاکامی پێنەگەیشتوویی ئابووریی ناوچەکەو دواکەوتوویی سیستەمی بەرهەمهێنانو نەبوونی بنەماو ژێرخانی پێویست بۆ گەشەکردنی پێوەندەکانی دەسمایەداریو نەبوونی ئۆرگانەکانی ئەو سیستەمە لە ناوچەیەکدا بوو، کە تانو پۆی بەرایەڵی پێوەندە عەشیرەییەکان تەنرابوو.

من سەیفولقوزات وەك مرۆڤێك سەیر دەکەم کە لاقی لەسەر ئەم زەوییەی ئێمە بەندە، نەك بوونەوەرێکی ئاسمانی کە پەروەردەی خەیاڵاتەو دوورە لە ناتەواویو هەڵەو خەتای مرۆڤانە. دەمەوێت بڵێم ڕێبازی تەزکەرە نووسانی کۆن ڕەچاو ناکەم، تەنیا بە شانو باڵی شاعیرەکەدا هەڵناڵێمو نایگەیێنمە عەرشی ئەفسانەیی. سەیف کەسایەتییەکی لێزانو تێگەیشتوو و خوێندەوارو بە شانو شەوکەت بووەو وەك کۆمەلانی خەڵك ڕێزیان لێ گرتووە، کار بەدەستو مەئموورو دەسەلاتدارانی دەوڵەتیی لە ناوچەکەو لە تارانیش ڕێزیان بۆ داناوە. ماڵەکەی پەناگەی لێقەوماوانو پێگەی دەسەلاتداران هەردوو بووە. هەم خەڵکی ناوچەکە بۆ پەیوەندی گرتن لەگەڵ کاربەدەستانی حکوومی هاتوونەتە لای، هەم مەئمووڕانی دەوڵەت سەردانی ماڵیان کردووەو لە نفووزو کەسایەتی بەرزی سەیف کەڵکیان وەرگرتووە. ڕەزاشای پەهلەوی نیشان و "گۆچانی مورەسەع"ی پێ خەلات کردووە، ئەویش پەسنی ڕەزا شای داوە:

((فخر بر امثال خود زآنرو کند سیف القضاة
چون عصایش داده شاهنشاه بهر امتیاز ...
پهلوی شاهنشه ایران همیشه شاد باد
تا خداوند تعالی قادر است و کارسان))

یا ئەو شێعری وا بۆ محەمەد ڕەزا شای کوڕی ڕەزا شای گوتووە:

((عید مولود شهنشاه جدید
این چنین روزی بخود، ایران ندید
همچو مولود رسول پاکزاد
از وجودش لرزه در عالم فتاد...))

بەلام گرنگ ئەوەیە سەیف لەو پەیوەندییانەی خۆی سوودی بۆ بەرژەوەندی گەلەکەی وەرگرتووەو ئەگەر جارێك بەشانو باڵی دەسەلاتیدا هەڵگوتووە، دە جار

سەرزەنشتی کردوون و لێی خواستوون ئاوڕ لە کورد بدەنەوەو کوردستان ئاوەدان بکەنەوە. ئەوە خاڵی سەرەکییە لە کەسایەتیی سەیفدا. هەڵە دەبێت ئەگەر بە حیسابی شێعرە نەتەوایەتییەکانی، وەك پێشمەرگەیەك بیگرینە بەرچاو. سەیف نە گریلای سەر چیا و نە پێشمەرگەی چەك لە شانی مەتەرێزی خەبات بووە. ئەوەی سەیفی مومتاز کردووە کەسایەتیی بەهێزو شامیل و جێگەی متمانەی بووە کە کۆمەڵانی خەڵك و مەئموورانی ناوچەیی ڕژێم هەردوك پێویستیان پێی بووەو سەرە هەودای گەلێك لە کاروباری کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووریی ناوچەی موکریان گەیشتۆتەوە ئەو.

من هەڵس وکەوتی حکوومەتی پەهلەوییەکان لەگەڵ سەیف هاوچەشن دەبینم لەگەڵ ئەو هەڵس وکەوتەی وا لەگەڵ ڕەحمەتی ئایەتوڵڵا مەردووخی کوردستانی دەیانکرد. بەم قسەیە نامەوێت بەراوردکاریی کەسایەتیی ئەو دوو گەورە پیاوە بکەم– گەرچی هەڵوێست گرتنی هاوچەشنیان کەمیش نەبووە، بەڵکوو دەمەوێت بڵێم ڕژێم کەم و زۆر بە یەك چاو سەیری هەردووکیانی کردووەو بنەمای کێشەکەش ئەوە بوو کە هەردوو پەهلەوییەکان لە هێزو دەسەڵاتی ئاخوندو موجتەهیدی شیعە لە قوم و مەشهەدو نەجەف دەترسان و لە بەرژەوەندیی خۆیانیاندا دەدیت کە کەسایەتیی زاناو ئەدیب و قەڵەم بەدەستی سوننی لە بەرەی خۆیاندا ببینن و لە ڕێگەی ئەوانەوە لانی کەم کوردستان و هەروەها پاشماوەی ناوچە سوننییەنشینەکانی ئێران بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. زۆرێك لە کتێبەکانی ئایەتوڵڵا مەردووخ لە چاپخانەی ئەرتەشی ئێران چاپ دەبوون یاخۆ بە یارمەتی و لای کەم بە تەئییدی ئەوان بڵاو دەکرانەوە. دیارە ئەم کارانە بۆ سەیف نەکراوە، بەڵام خاتر ڕاگرتن و لاواندنەوەی لەلایەن کاربەدەستانی ڕژێمەوە هاوچەشنییەکی لەگەڵ هەڵوێستیان سەبارەت بە ڕەحمەتی مەردووخ هەبووە.

هەڵوێستی کاربەدەستانی ڕژێم بەرانبەر بە سەیف و نیازیان لەم نزیك بوونەوەیە هەرچی بووبێت، وەك پێشتر گوتم، ئەوەی کە سەیف خۆی بگرێتەوە ئەوە بووە لەو پەیوەندییانە بۆ بەرژەوەندی کورد کەڵکی وەرگرتووەو هەرگیز لە مەتەرێزی داکۆکی لە مافەکانی گەل نەهاتۆتە دەرێ و لەبەرەی حاکمان و زاڵماندا نەوەستاوە– هەر ئەوەشە کە مێژوو گەورەیی بە ناوی سەیف دەبەخشێت.

لەلایەکی دیکەوە، سەیف خاوەن موڵکێك بووە بە هەموو تایبەتمەندییەکی خاوەن موڵکی ئەو سەردەمەوە: دە و دووی لە ڕەعییەت سەندووە، بێگاری پێ کردوون و یەك کەلام، چەوساندوونیەتەوە. بەوەی ئێمە سووكو سانا بەسەر ئەم مەسەلەیەدا باز بدەینو چاو لە ئاغایەتیو خاوەن موڵك بوونی سەیف بپۆشین، نە ڕێزی سەیفمان زیاد کردووەو نە لەگەڵ خۆمانو خەڵك ڕاستگۆ بووین. بەڵام ئایا لێرەشدا دەمانەوێت لە سەیف مەوجوودێکی ئاسمانی دروست بکەین یاخۆ وەك مرۆڤێك لێی بدوێین؟ سەیف خاوەن موڵك بووە، بەڵام خاوەن موڵکی چاك، لە بیری بەرژەوەندی گەلەکەیدا بووەو نەیویستووە کورد «حاسڵی عومری زۆرو کەم، بدا بە کاو گیا لەنێو عەجەم»! یاخۆ نەسیحەتی کوردی کردووە «نۆکەری ماڵان نەکات و ڕووتو ڕەجاڵ نەبێت»، خۆی لەم بوارەدا هەنگاوی هەڵێناوەتەوە، داری ناشتووەو باخی ناوەتەوەو بەوەش دەوڵەمەند بووەو دیوەخانی گەورەی پڕ لە نۆکەرو دەستو پێوەندی هەبووە کە دایم لەمیوان جمەی هاتووە، نە دار ناشتن و باخ نانەوە تاوانە و نە کەسایەتی سەیف بەوە نزمی دێنێت کە خاوەن موڵك بووبێت.

بە گوێرەی زانیارییەك کە کاك حەسەنی قازی پێی داوم، سەیف شەش دانگی سێ گوند (گوێگجەلی، موشیر ئاباد و کانی کووزەڵە)و سێ دانگی دوو گوند (سەراو، عەولابات)و هەروەها بەشێ لە گوندی پیرۆلی باغیو... هەبووە. ئالێکساندر ئیاس کۆنسوولی ڕووسییەی تەزاری لە سابلاغ کاتێك لە ئۆکتۆبری ١٩١٢ لە تەورێزێوە بەرەو سابلاغ چووە، دەڵێ: «من بە تەواوی لەوە ئاگادار بووم کە ئەو دڵدانەوەیە لەلایەن بەسیرەوە تەنیا حەولێکی حیسابکراو بوو بۆ ئەوەی سرنجی من بەرەو لای خۆی ڕاکێشێو لە بەرژەوەندی وی بجووڵێمەوە سەبارەت بە گازندەی ڕەسمی خۆی بە دژی حاکمی ساوجبولاغ [سابلاغ]، سەرداری موکری لەسەر دێیەکانی دەلمەو گوێگجەلی، کە زەمانێك بەسیر داگیری کردبوون و لەلایەن موکرییەوە بەزۆری لێی ئەستێندرابوەوە». دیارە دواتر دەستاودەستی کردووەو سەیف ئەوێی لە سمایل بەگی حەیدەری کڕیوە.

ڕێزدار ڕەحمانی مودەڕریسی فەردێك شێعری فارسی لەبەر بوو، کە گوایە لە زمان خەڵکی گوندی "سەراو"ەوە گوترابێت. شێعرەکە باسی بڕینی ئاوی گوند لەلایەن سەیفولقوزاتەوە دەکات (بڕوانە درێژەی هەر ئەم سەرەتایە).

بەکورتی، سەیف قازی بووە، ئاغا بووە، خاوەن موڵك بووە، بەڵام شاعیری خەمخۆری نیشتمانەکەشی بووە. هەر هەڵسەنگاندنێکی کەسایەتی سەیفیش کە لایەنێك لەو لایەنانەی تێدا نەگیرابێتە بەرچاو، ناتەواوە.

بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی بریتانیا هەواڵێکی سەبارەت بە سەیفولقوزاتی تێدایە. بەگوێرەی ڕاپۆرتەکە، هەواڵدەر یا جاسووسێك لە بۆکانەوە بە کۆنسولییەتی بریتانیا لە تەورێزی ڕاگەیاندووە کە «سەیفولقوزات چۆتە ناو حزبی توودەوە». ئەوەی کە هەواڵەکە ڕاست بێت جێگەی گومانە، بەڵام هەڵوێست گرتنی ئەرێیی سەیف سەبارەت بە هاتنی سوپای سوورو پەیوەندی گرتنی لەگەڵ ئەفسەرانی سوپای سوور، ڕاستییەکی سەلماوە. ئەوەش لەو شێعرە دەردەکەوێت کە سەیف بۆ ستالین و سوپای سووری گوتووە:

«کوردینە ئەمڕۆ ڕۆژی گەپ و کەیف و شادییە
لەو نیعمەتەی کە بۆمە ستالینە حامییە...
ڕووسوورە هەر کەسێ کە "قزلْ ئۆردوو"ە پەنای...»

ئەوە دەقی بەڵگەنامەکەیە:

ژمارە FO ٣٤١\٤٥٤٧٨
ڕاپۆرتی ژمارە ٨ [کۆنسوولییەتی تەورێز]
١٩ی مانگی ئاپریل تا ١٦ی مانگی مەی ١٩٤٥
٩٧) «ورمێ: بە گوێرەی هەواڵی هەواڵدەرێکمان لە بۆکانەوە، نزیکەی هەزار کەس لە کوردی دێبوکری، حەیدەری و شێخ ئاغایی، هەروەها مەلایەکی خاوەن نفووز بەناوی سەیفولقوزات چوونەتە ناو حزبی توودەوە.»[١٣]

وەك دەبینین سەیف لەگەڵ هەموو بزووتنەوەیەکی سیاسی کە بەرژەوەندی کوردی تێدا بەدی کرابێت و هیوایەکی ڕزگاریی کورد لە مافخوراوی بەخشیبێت هاوکاری کردوە، هەر لە بزووتنەوەی مەشرووتەوە تا ئازادیستانی خیابانی و ڕاپەڕینی سمکۆو پێشوازیکردنی سوپای سوورو هتد... دیارە بەشداریکردنی سەیف

---

[١٣] بۆ دەقی بەڵگەنامەکە، بڕوانە: "ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا"، وەرگێڕانی ئەنوەری سوڵتانی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١٢٧.

لە بزووتنەوەی مەشرووتەخوازیی ئێراندا پێویستی بە بەڵگەی زیاتر هەیەو هیوادارم دەرفەتم بۆ بڕەخسێت لەم بوارەدا زانیاریی زیاتر گردوکۆ بکەم.

## بنەماکانی بیری سیاسیی سەیفولقوزات

بیری سیاسی سەیف لە چەند سەرچاوە وەرگیراوە: کوردی، ئێرانی، ئازەربایجانی و عەرەبی- ئیسلامی.

**یەکەم، کوردی:**

سەیف بە حوکمی پێگەی چینایەتی خۆی- وەك خاوەن موڵکێك، خوازیاری هێمنایەتیو پاراستنی دۆخی "مەوجوود" بوو و ئەم ئاشتیخوازییە لە بنەماڵەی قازییەکاندا گەلێك بەرچاوە. دەکرێ یەك لە هۆکارەکانی ئەوە بێت کە بنەماڵەی قازی سەرەڕای موڵکداریو دەوڵەمەندیی، عەشیرەتێکیان بە دەورەوە نەبووە تا لە بەرانبەر هۆزی دەسەڵاتداری ناوچەکە- وەك دێبوکریو مەنگورو گەورکو مامەش بیانپارێزێت:

((سپای دووریت لە سێ لا دەوری داوم
بە سانی مەنگوڕو پیرانو مامەش))

یاخۆ واهەیە بتوانن دژ بە دەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندی بوەستن کە ئەوانی تر بۆ نموونە، لە شۆڕشی شێخ عوبەیدیلای نەهری (١٨٨٠)دا دژی وەستابوون.

بە پێچەوانە، قازییەکان لە ڕاپەڕینی سمکۆو ئاڵۆزیو تاڵانو بڕۆی ئەو ساڵانەدا (١٩١٩) هەوڵی هێورکردنەوەی ناوچەکەو بەرگری لە توندوتیژیو سەرەڕۆیی سوپای عەشیرەتی سمکۆیان دا و لەم ڕێگایەوە کەوتنە ڕووبەڕوویی و تێکگیران لەگەڵ سوپاکە. لەڕاستیدا هەڵوێستی بنەماڵەی قازی جیاوازیی لەگەڵ هەڵوێستی خەڵکی شاری مەهاباد نەبوو، کە ئەوانیش دڵنیگەرانی بێقانوونیو بێسەروبەرەیی سوپای سمکۆ بوون- یا وەکوو هەردوولایان هەڵوێستی کوردانەی سمکۆیان لا پەسند بوو و پشتگیرییان لێ دەکرد[١٤].

---

[١٤] خەلیل فەتتاحی قازی، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥، ٥٥.

دەوری سەیف لەم پەیوەندییەدا گەلێك گرنگە. سەرەڕای هەموو دژایەتیو ناکۆکییەکی نێوان سوپای سمکۆو بنەماڵەی قازی، کاتێ کە سوپای سمکۆ لەناوچەکەدا نەمان و ڕوانینێکی واقیع بینانە بەسەر ڕێبەرەکەی واتە سمکۆدا زاڵ بوو و لایەنی سیاسی- نە تەوایەتی بزووتنەوەکە، جێگەی ئاژاوەی ناوخۆییو شەڕو هەرای عەشیرەیی گرتەوە، سەیف کە لە خەمی داهاتووی گەلەکەیدا بوو، چوو بۆ چاوپێکەوتنی سمکۆ و هەوڵی پەیوەندیدانی سمکۆی لەگەڵ شێخ مەحموودی نەمرداو ڕێگای بۆ سەفەری سمکۆ بۆ سلێمانی خۆش کرد[15]، کە ئاشکرایە ئەوە سەفەرێکی سیاسی بوو و بە ئامانجی یەکخستنو یەکگرتنی هەردوو شۆڕشەکە بەڕێوە چوو.

ئەوە نمونەیەکە لە پێوەندی سەیف لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد و چاوخشاندنێك بەشێعرە کوردییەکانیو تەنانەت شێعرە فارسییەکانیشیدا، پێوەندی نزیكو هەمە لایەنەی سەیفو کێشەی کورد دەردەخات. ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لە ناوەڕۆکی شێعرە کوردییە کانی سەیف:

### ١- بانگاشە بۆ یەکگرتنی ڕیزەکانی گەل:

((هەستن لەخەو، وەخڕ بن و"حی علی الصلا"))

((هەر بێ سەریو عەداوەتی خۆتانە دێتە ڕێو))

((چون دومنن لەگەڵ یەكو نیتانە یەکیەتی

ڕاتان دەدەن بە جارێ لە هەورازێ بۆ نشێو))

((قوربانوو بم وەرن ببنە دۆستی یەکتری))

((بە یەکدی شاد بین، بۆ یەکدی بمرین))

((خڕ بینەوە لە هەرجێ تفەنگینە داوەتە))

---

[15] بڕوانە: د. ڕەحیم قازی، "قازی محەمەد و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوایەتیی گەلی کورد"، کە هەڵبژێردراوێکی لە بەشی پاشکۆی ئەم کتێبەدا هاتووە.

## ٢- داوای ماڤ سیاسی بۆ گەلی کورد:

((پێم گوت بە پادشاو بە وەزیر و نەخوست وەزیر
ئاورێك وە کوردی دەن وە بە حاڵی بلاوییە))
((بۆچی زمانی دایکی لە ئێمە مەنع کرا؟))

## ٣- ئاواتی سەربەخۆیی بۆ کوردستان:

((هەر میللەتێ لەلاوە حەقی خۆی بەدەستەوە))
((خەڵکی دی دڵ خۆشن بە جێگەو مەوتەنی خۆیان
بۆچی ئەمەش نەخۆینەوە لەو چۆمو کانییە؟))
((ئاخر بەزاتی تۆیە ئومێدی نەجاتی مە))
((ژێردەستی و ئیتاعەتی بێگانە تا بە کەی؟))
((بۆچمانە ماڵو سەر، کە لەسەر سەروەری نەچێ؟))
((بمرین لە رێی نەجاتی وەتەن با بە نێرو مێو))
((ئاسوودەیی مەرامیە، کوێخایی ماڵی خۆی...))
((هەر کەس کە روشدی بێ، هەوەسی ماڵی خۆی دەکا))
((ئازادی، سەربەخۆیی، میری و گەورەیی
داوا بکەن بە زارو زمان و ددان و لێو))
((ئیمانە مەرکەزێکی کەوا پاڵی پێوەدەین))
((جیرانەکەت بە ئارەزوویی کۆنی خۆی گەیشت))
((مەشموولی خۆشە، زۆر موقەددەسە
نەك بۆ کەسێکی بێ گەورەو کەسە))
((هەر کەس لە خۆیدا سەرداری نەبێ
حاڵی هەر وایە، ئاخری وا دەبێ))

## ٤- نیشتمانپەرستی:

((حوببی وەتەن نیشانەیی ئیمانە کوردەکان!))
((ئیمە لە رێی وەتەن خەمی دەرکردن و جنێو))
((مەردچاکە ئەو کەسەی سەری دانێ لە رێی وەتەن))
((تۆ سەر لە من بخوازە لە بۆ کێشکی نیشتمان))

**٥- کوردستانی بوون:**

((هەریەك غوڵامو نۆکەری بێگانە میللەتێك))

((خۆشیمە لەو شەهادەتی "شێخان"ە نێو بە نێو)) [ئاماژەیە بە شێخ سەعیدی پیران]

**٦- بانگەواز بۆ دانانی ژێرخانێکی بەهێزی ئابووری بۆ کوردستان:**

((باغان دابنێن، داران بنێژن))

((حەیفە میللەتێك شەش هەزار ساڵ بێ

نۆکەری ماڵان ڕووتو ڕەجاڵ بێ))

((حاسڵی عومروو لەزۆرو کەمی

داتان بەگیاو کا لەنێو عەجەمی))

((نۆکەریی ماڵان شەرمە لە بۆمە

کۆلان هەڵگرین بە کۆمەکۆمە))

((تاکەی لە دەرکان کزو لاواز بین؟))

((بۆ وانە هەرچی جوانە، لە جێ، دێ ، لە ژن، لە ماڵ

هەر شاخو داخە بۆمە....... ))

((دێهاتی لێك دەی چادرو هۆبانی

دەس ناکەوێ ڕۆن بۆ چڵکەسانی))

((ئاشی کولتەپەت کارێکی چاك بوو)) [ڕوو لە "نامی٢١" ]

**٧- هاندان بۆ خوێندن:**

((واجبە خوێندن بۆ دنیاو دینێ))

((بە کوتەو شانامان میللەت دەمێنن))

((ئەخلاقی چاكو خوێندنو دینداری، ئیتیحاد))

((هەرگیز حەقی ژیانی نییە پیاوی بێ سەواد))

((نەمەدرەسە، نەعلیمو نە دەرس و نە سەنعەتێك

زوڵمە لەگەڵ مە........ ))

((ئەو بەدبەختییە، لە کورد ڕووی دابوو

لەبەر نەخوێندن کۆزیان ساوا بوو))

((بخوێنن چاکە هەتا دەتوانن!
بەڵکە تەکلیفی خۆتان بزانن))

### ٨- دۆستایەتی و پەیوەندیی شەخسی:

لەم باسەدا جگە لە ئەندامانی بنەماڵەی خۆی وەك شەهید محەمەد حسێن خان و ئەحمەدی کوڕی، بێگومان عەزیز ئاغای عەبباسی و عەلی بەگی حەیدەری و شێخی بورهان لەپێش هەموو کەسێکەوەن. لەمەڕ عەزیز ئاغا پێویستە بگوترێ کە هەندێ شێعری سەیف سەرجەم بۆ ئەو گوتراون و ڕاستەوخۆ ڕوویان لەوە.

بۆ عەزیز ئاغای عەبباسی:

((عەزیز! ئارەزووت زۆری بۆ هێنام))
((زۆر توولی کێشا عەزیز! هیجرانت))

سەبارەت بە شێخی بورهان:

((هەر کەس دە پەنای شێخیدا نەبێ
حیزی نەفسییە، شەیتان پێی فێرە
نێوی شەمسەددین ڕۆژە، کە هەڵدێ
هەروەك چەکچەکی هەڵدێ ئەو کوێرە))
((بۆ تەواف کەعبەیی کۆی شەمسی دینە وا حەسەن
هەر وەکوو مەزرەق بەهەر مەرزو دیارێ خول دەخۆم))

بۆ عەلی بەگی حەیدەری

هەندێ شێعری سەیف ڕوویان لە عەلی بەگی حەیدەری- ئاغای حاجیاڵیکەندە. لەو پەیوەندییەدا گرنگە بگوترێ سەرەڕای کێبەرکێی نێوان هەردوو کەس بۆ مەسەلەی ئەندامیەتیی پەرلەمانی ئێران و هەندێ کێشەی موڵك، شێعرەکانی سەیف دارماڵی دۆستی و نزیکی و نیشاندەری هاتوچۆی نێوان ئەو وعەلی بەگن لەوانە، ئەم پارچە شێعرانە:

((کەسێ بەختی "سەعید"ی بێ دەبێ حازر لە دیوانت))

هەروەها پاشماوەی شێعرەکە، کە لە چاپی قازی ئەحمەد دا وەك شێعرێکی سەربەخۆ چاپ کراوە:

((لە مەیدانی سەعادەت بوو، نەسیمی من سەعادەت بوو
بە عینوانی مەدیحی جارو بارە دێمە مەیدانت))
((دڵی وێران لە هیجران بۆوە مەعموور))

### ٩- خاوەن هەستی:

ئەو شێعرانەی وا بۆ عەزیز ئاغای عەبباسی گوتراون، نیشاندەری خۆشەویستییەکی بێڕادەو خلووسێکی پاکی شاعیرن بۆ عەزیز ئاغاو ئەندامانی بنەماڵەی ئەو. شێوازی دەربڕینی شاعیر لەو دەرفەتانەدا کە ڕووی قسەی لە عەزیز ئاغایە، لەوپەڕی جوانیو ڕازاوەییدایە، بە شێوەیەك کە شێعرەکان شان لە شانی شێعری غەرامی دەدەن:

((هەر کەس عیشقی تۆی لەسەردا نەبێ
بێشك حەیوانە، پڕو پا نێرە))
((ئەوانە شێعرن، عەزیز! بە مەرگت
موخلیست بێ تۆ وەجاغی کوێرە))
((باری فیراقت پشتی شکاندم))
((وەك مەجنون لە دووت کەوتمە کێوان))
((عیشقت لە سەرم قەت ناچێتە دەر؟))

شێوەی دەربڕینی هەستو خۆشەویستی بۆ خەڵکانی دیکەش لە ڕادەی ئاسایی بەدەرە، بۆ نموونە ئەو شێعرانەی وا بۆ عەلی بەگی حەیدەری گوتوون:

((عەلی! مەشهووری شارە، من کە سەیفی زولفەقاری تۆم
هەمیشە "یا عەلی!"مە، گەر قەبووڵم کەی لە شیعانت))
((هەتا موژگان لە بۆ دیدە ببێ حافیز لە دیتندا،
لە ئەمر و نەهیدا تا ڕاستو چەپ بن تیری موژگانت))

بە خوێندنەوەی شێعرەکانو شێوازی دەربڕینی هەستو شێوەی دۆستایەتی کردنی سەیف لەگەڵ خەڵكو ئاوەدانبوونی لەڕادەبەدەری دیوەخانەکەی، من دەگەمە ئەو ئەنجامەی کە سەیفولقوزات مرۆڤێکی خاوەن هەستی ئەوتۆ بووە کە لە تەمەنی پیریشدا دۆستایەتی گەرمو گوڕو گەنجانەی لەگەڵ خەڵکانی دەورووبەری خۆی هەبووەو بەگشتی حەزی زۆری لە هاوڕێیەتیو دۆستی بووەو ئەو هەڵوێستەش لە

شێعرەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە. ئەگەر بتوانم دەڵێم ئەو هەستیاریو گەرمو گوڕییە لە بنەماڵەی سەیفیشدا ماوەتەوەو بۆ نموونە، خوردبوونەوە لە وەسیەتنامەی کوڕە گەورەی سەیف- شەهید محەمەد حسێن خانی سەیفی قازی، خوێنەر تووشی سەر سوڕمان دەکات کە چۆن کەسێك کە دوای چەند خولەك لە سێدارە دەدرێت، بە وردی بیر لە یەك یەکی ئەندامانی بنەماڵەی خۆی هیچ، لە خەڵکانی دەورووبەری دەکاتەوەو لیستەی ناوی هەموو ئەو کەسانەی وا پێیان قەرزدارە، ڕیز دەکاتو لە هاوسەرەکەی دەخوازێ قەرزیان بداتەوەو هەروەها داوای لێبوردن لە نۆکەرو دەستو پێوەندی دەکات. لە ژوور هەموو ئەوانەشەوە، ئەو هەڵوێستەی وا بە نیسبەت هاوسەرەکەیەوە دەیگرێتو داوای لێبوردنی لێدەکاتو دەخوازێت کە بۆ هەڵبژاردنی شێوەی ژیانی دواڕۆژی خۆی هەدست بە ئازادی بکات. هەموو ئەوانە لەوپەڕی باوەڕی ئاساییدان.

لە پەیوەندی ئەو چەند بابەتەی سەرەوەدا یەکدوو ڕوونکردنەوە پێویست دەبن:

١- ئەوەی وا سەبارەت بە خواستی «سەربەخۆیی» واتە ئیستیقلالی کوردستان، لە ژێر ژمارە ٣ دا گوترا و ئەو نموونانەی وا لە شێعری سەیف هێنرانەوە، نابێ بەوە دابنرێت کە سەیف بەرنامەیەکی داڕێژراو بۆ دروستکردنی دەوڵەتی کوردی هەبووە. لە ڕاستیدا ئێستا ٦٣ ساڵ دوای مەرگی سەیفیش هێشتا بەرنامەیەکی بەربڵاوی نێوخۆیی بۆ وەدیهاتنی ئەو "ئاوات"ە نییە.

سەیف بەبێ گومان داوای ناسنامەیەکی جیاواز "لەوانی دی" بۆ کورد دەکاتو ئەوەش ڕەنگدانەوەی هۆشیاریی نەتەوەیی لای ئەوە، بەڵام دانانی دەوڵەتی خۆییو تەنانەت خودموختاریی کورد لە بیرو بۆچوونی سەیفدا فۆرمولە نەکراوە و تەنیا لە تەمومژدا خۆ دەنوێنن. هەمان ئەو بارودۆخە، بە شێوەیەکی هاوچەشن، لە سەردەمی کۆماری کوردستانیشدا دەبینرا.

٢- سەبارەت بە پەیوەندی سەیف لەگەڵ خانەقای شێخی بورهانیش خاڵێك هەیەو باسکردنی بە پێویست دەزانم:

سەیف، بێگومان مەلاو ئیماندارێکی بێ خەوش بووە. لەو ساڵانەشدا نزیك بە هەموو دانیشتوانی ناوچەکە موریدو سەرسپێردەی مورشید یا شێخێك- بەگشتی شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی بوونو تەریقەت تێکەڵاوییەکی زۆری لەگەڵ شەریعەت پەیدا کردووەو لای کەم بۆ کۆمەڵانی خەڵکی ئاسایی، ئەو دوو چەمکە یەك واتایان

هەبووە. بەم پێیە، موریدایەتیی سەیف بۆ شێخی بورهان لە قووڵایی باوەڕیەوە سەری هەڵداوە.

بەڵام سەیرێکی بارودۆخی سیاسی- کۆمەڵایەتی ئەو ساڵانەی موکریان و کوردستان و ئاگاداربوون لە کێشە کۆمەڵایەتییەکان و گیروگرفتی سەیف و بنەماڵەی قازی لەگەڵ سەرەك هۆزە دەسەڵاتدارەکانی موکریان، دەکرێ ئەو گومانەشمان تێدا بخولقێنێت کە سەیف لە خانەقای بورهاندا، پەناگەو پشتیوانێکی دۆزیوەتەوە کە لە بەرانبەر ملهوڕان و زۆردارانی عەشیرەتی دەسەڵاتداری کورد پارێزگاریی لە خۆی و بنەماڵەکەی کردووە. با سەیرێکی ئەم شێعرەی بکەین:

«لە سایەی هیممەتی پیرە حەسەن! دوژمن موتیعی تۆ
دەنا "سە"ی کێ دی بەبێ زەحمەت پەتی دابێ!»

ئێستا ئەگەر سەیری ئەم دوو پارچە شێعرەی خوارەوە بکەین کە بە ئاشکرا رووی لە یەکێ لە دەسەڵاتدارترین سەرەك هۆزانی ناوچەکەیە، بۆمان دەردەکەوێت سەیف لە داوی چ دژایەتی و دوژمنایەتییەکدا پەلی کوتاوەو چەندەی نیاز بە پشتگیری و پشتیوانی "هێز"و "دەسەڵات"ێکی زەوینی بووە لە شەڕو هەرای بەردەوامی عەشیرەتەکاندا پارێزگاریی لێ بکات:

«نێوی "شەمسەددین" ڕۆژە، کە هەڵدێ،
هەروەك چەکچەکی هەڵدێ "ئەو کوێرە"»

هەروەها:

«وشك بوو دووپشك- ئەو "کوێری ناڕاست"»

ئایا لە هەلومەرجی ئەودەمی ناوچەکەدا هیچ دەسەڵاتێکی بەهێزتر لە کەسایەتیی ڕێزلێگیراوی شێخ هەبوو سەیف پشتگیری و پشتیوانی زاڵمانی دەست ڕۆیشتووی موکریانی لێ بخوازێت؟ بە بۆچوونی من، نا! هەر بۆیەش، بەوپەڕی ئیرادەتەوە هاتوچۆی خانەقای دەکردو بە گوێرەی وەسیەتی خۆی، دوای مردنیش لەوێ نێژرا.

دووهەم، ئێرانی:

سەیف ڕۆڵەی سەردەمی مەشرووتەی ئێران (١٩٠٦) و ئاکامەکانیەتی. ئەدەبی مەشرووتەی ئێران و خەباتی ڕووناکبیران و شاعیرانی ئێرانی بەشێوەیەکی سروشتی

له پەروەردەکردنی بیری ئازادیخوازیی سەیفدا دەورێکی گرنگی بینیوە و شێعرە فارسییەکانی له باری ناوەرۆك و فۆرمەوە جیاوازییەکیان لەگەڵ شاعیرانی فارسی سەردەمی نێوان مەشرووتیەت و سەرهەڵدانی دیکتاتۆریەتی ڕەزاشا- بۆ نموونە: "ملك الشعرای بەهار"و "عارف قەزوێنی"و "عیشقی کوردستانی" (هەمەدانی)دا نییە- گەرچی توندوتیژییەکانی شێعری "عیشقی" و "فەڕوخی" یتێدا نابینرێت.

جیا لەوانە، خوێندەواری و شارەزایی له ئەدەبی کلاسیکی فارسیش دەبێ وەك دیاردەیەك له پەروەردەی سەیفدا بگیرێتە بەرچاو.

سێهەم، ئازەربایجانی:

بنەماڵەی قازی لەچاو سەرەك هۆزو خێڵە کوردەکانی دیکەی ناوچەی موکریان، گەلێك نەرمونیانترو دۆستانەتر لەگەڵ تورکە ئازەربایجانییەکاندا هەڵسوکەوتیان دەکردو ئەم شێوە هەڵسوکەوتە، له هاتوچۆو دۆستایەتی خەڵکی ناوچەکەدا خۆی دەنواندو نموونەیەکی دیکەشی ئەو ڕاستییە بوو کە ژنی دووهەمی سەیف- خوالێخۆشبوو "وەجیهە خانمی جاوید" خەڵکی ورمێ و ژنی سێهەمیشی واتە ڕوبابە خانم- کە "سیغەیی" بووە ، هەردووکیان ئازەربایجانی بوون و سەیف له هەردووکیان منداڵی هەبووە. هەروەها هاوسەری شەهید حەمە حسێن خانی کوڕی سەیف، فەڕوخلەقا خانمی مەلیك قاسمی، ئازەربایجانی بوو.

نموونەی دیکەی تێکەڵاویی سەیف لەگەڵ خەڵکی ئازەربایجان، کردنەوەی لقی ئەنجومەنی "ئازادیستان"ی شەهید شێخ محەمەدی خیابانی له مەهابادو هاوکاریکردنی سەیف لەگەڵ گۆڤاری ئۆرگانی بزووتنەوەی "خیابانی"یە، کە پێشتر ئاماژەم پێکرد. سەیف کە ئابووری پێشکەوتووتری ئازەربایجان و ژیانی کەمۆزۆر باشتری خەڵکەکەی ئەوانی بەچاو دەکرد، بە شێوەی ئەوان باغی پێك دەهێناو داری دەنا، بانگی گەلی کوردیشی دەکرد ئەو کارانە بکەن و له عەجەم دانەمێنن. سەیف، بە شێوەی ئاسایی، زمانی تورکی ئازەربایجانی دەزانی و تەنانەت بە تورکی شێعری دەگوت. بەداخەوە لەناو دەستنووسەکانی بەردەستی مندا نموونەی ئەو شێعرانە کەمن. بەڵام ناتوانم ئاماژە بەو ڕاستییە نەکەم کە زمان و کولتووری ئازەربایجان له خوڵقاندنی کەسایەتیی سەیف و ئافراندنی هەڵوێستەکانیدا شوێنی هەبووە.

**چوارەم، عەرەبی- ئیسلامی:**

لایەنێکی دیکەی ژیانی سەیف، فەقییەتی، مەلایەتیو قازییەتی بووە. لە حوجرەی زۆر گوندی کوردستاندا ژیاوەو دەرسی خوێندووە، ((سەیف زانستی مەعقوولو مەنقوول و زمانی عەرەبی لە خزمەت مەلا شەفیع لە عەنبار (گوندێك لەنزیك بۆکان)و مەلا حەسەنی قزڵجی بۆکانیو مەلا ساڵحی سەدراباتیو "مەلای سڵەمانکەندی" تا پلەی مەلایەتیی خوێندووە)) و هەر لە ماوەی فەقێیەتی لە گوندی سڵەمانکەندیدا بووە کە بۆتە ئەوینداری زبێدە خانمی کچی ئاغا شێر بەگ لە ئاغاکانی فەیزوڵڵا بەگیو پاشان هێناویەتی. پێوەندی سەیف لەگەڵ زمانو ئەدەبی عەرەبی- کە لەڕێگەی باوەڕی ئایینیو خوێندنی ناو حوجرەی مزگەوتو هەروەها نەریتی قازییەتیی بنەماڵەکەیانەوە پێی گەیشتووە، بنەمایەك لە پەروەردە و هەروەها کەسایەتییەکەی پێك دەهێنن، کە زۆروکەم دەبێ لە هەڵسەنگاندنی خۆیو کردەوەکانیدا بێتە حیسابکردن. سەیف شێعری عەرەبیشی هەنو ئەوەندەی لەناو دەستنووسەکاندا چاوم پێیان کەوتبێت، یەکدوو پارچە زیاتر نین، بڵاویان دەکەمەوە، بەڵام دڵنیام ژمارەی شێعری عەرەبی سەیف دەبێ لەوانە زیاتر بووبێت.

**پێنجەم، تەریقەت:**

سەیف موریدێکی بێخەوشی خانەقای بورهان، سەر بە تەریقەی نەقشی بوو و هەموو ساڵێك بۆ ماوەی مانگێك یا زیاتر، دیوەخانو ئاغایەتیو ملكوماڵو نۆکەرو دەستو پێوەندی بەجێهێشتووەو چۆتە خزمەت شێخ یۆسف شەمسەددینو لەگەڵ موریدو سۆفیو دەروێشو دیوانەی شێخ- کە زۆربەی زۆریان لە کۆمەڵانی هەژاری خەڵك بوون هاونشینی کردووەو بە لەتکە نانێکی خانەقا برسییەتی شکاندووە. ئەو موریدایەتییە پاكو بێپێچوپەنایە شوێنی زۆری لەسەر کەسایەتیی سەیف داناوەو کردوویەتە مرۆڤێکی نەرمو نیانو بە "تەحەمول"و تەبع ناسك. هەڵسووکەوتی لەگەڵ ڕەعییەتی گوندەکانیو هەروەها خاوەن موڵکی گوندەکانی دەوروبەرو دراوسێ ئازەربایجانییەکانی، مۆرکی ئەو سەبرو لەخۆبوردوویيو لایەن نەرمییەی پێوە دیارە، بە شێوەیەك کە سەرەڕای کێشەی موڵك[١٦]، هەروەها سەرەڕای کێبەرکێی

[١٦] لە ڕێزدار ڕەحمانی مودەریسیم بیست، کە بەهۆی کێشەی ملکی نێوان سەیفو عەلی بەگی حەیدەرییەوە شێعرێکی فارسی لە زمان خەڵکی گوندی (سەراو) گوترابوو، باسی برانی ئاوی گوندەکەی دەکرد:

نوێنەرایەتیی پەرلەمان لەگەڵ عەلی بەگی حەیدەری- برای میسباح الدیوانی ئەدەب شاعیری ناودار، هەردووکیان پێکەوە لە پەنای خانەقای بورهاندا بە گۆشەگیریو ئیعتیکافەوە خەریك بوونو لە خۆبەکەمزانیو بچووکیکردنی "موراد"ی خۆیاندا گرەویان لەیەکتر بردۆتەوە. بە بۆچوونی من، هەر ئەو نەرمو نیانیو ناسك هەستییە دەوری گرنگی بینیوە لە هەڵوێست گرتنی سەیف بەرانبەر بە عەزیز ئاغای عەبباسی- کە ئەویش موریدی هەمان خانەقا بووە و زۆرجار پێکەوە چوونەتە زیارەتی شێخ. هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی پڕ لە شەوقو زەوقی سەیف بەرانبەر بە عەزیز ئاغا زەحمەت دێتە گونجان ئەگەر لە ڕوانگەی ئەو ناسك هەستیو بێوردبوونەوە موریدانەیەوە سەیر نەکرێت. شێعری سەیف بۆ عەزیز ئاغا دارماڵی خۆشەویستیو ڕێزگرتنەو شاعیر بەشێوەیەکی گەنجانەو پڕ لە خۆشەویستی ناوی عەزیز ئاغا دەبات کە نموونەی تەنیا وا هەیە لە ئەوینی مەولانای ڕۆمی بۆ شەمسی تەبریزیدا بینرابێت، دوو پیری زورهانی جێگەی ڕێزی کۆمەڵانی خەڵك کە دیوەخانیان هەمیشە لە میوان پڕ بووە، تەنیا لەڕێگەی هەستێکی ئەوتۆوە دەتوانن وەها لەیەکتر نزیك ببنەوە.

### شەشەم، بنەماڵە:

شوێنی ڕاهێنانی بنەماڵە لەسەر مرۆ، دیاردەیەکی بەرچاوەو لە منداڵییەوە تا کۆتایی تەمەن هەر دەمێنێت. ئەوەی سەیف لە باو وکاڵی خۆی وەرگرتبێتو لێیان فێر بووبێت، چەند شتێکن کە دەکرێ بەم شێوەیەی خوارەوە لیستە بکرێن:

### خوێندەواریو مەلایەتی و قازییەتی

لە هەندێ برگەی تایبەتی زەمەنیدا سێ کەس لە بنەماڵەی قازی هاوکات لەگەڵ یەکتر مەحکەمەی قەزاوەتیان لە مەهاباد هەبووە. ئەرکی قازییەتیو بەڕێوەبردنی

---

ما اینهمه اهل سراب    خون میخوریم از جای آب

سیف القضات قاطع آب    شاها برس بداد ما

هەر کاك ڕەحمان گوتی کە لایەنگرانی مەرحوومی سەیفیش لە بەرانبەردا هەمان شێعریان گۆڕیبوو، لەجیاتی وشەی "خون"، شتێکی پیسیان دانابوو، بەم شێوەیە: ((... میخوریم از جای آب)) ... بۆ ئەوەی وەڵامی ئەولایان دابێتەوە.

مەحکەمە، خۆی لە خۆیدا گەورە پیاوانی بنەماڵەکەی بەرەو ڕێبەرایەتیو سەرۆکیو پێشەنگیی خەڵك و ئاوێتە بوون لەگەڵ سیاسەت هان داوە. لەم بوارەدا کەسێکی وەك قازی فەتاح لەلایەن ڕووسەکانەوە شەهید کراوە، پێشەوا قازی محەمەدو سەدری قازیو هەروەها سەیفی قازی (کوڕی سەیف) لەڕێگای خەباتی نەتەوایەتیی گەلی کورددا قوربانی کراون، سەدری قازی نوێنەری مەهاباد بووە لە پەرلەمانی ئێرانو هەوڵی سەیف بۆ چوونە پەرلەمان بەهۆی دەست تێوەدرانی ئاشکرای دەزگای حکوومەتی ڕەزاشاوە هەرەسی هێناوە، بەڵام ئەو هەوڵی ڕێبەرایەتییە پێش سەیفیش لە بنەماڵەکەیاندا هەبووەو لە سۆنگەی سەیفەوە گەیشتۆتە لوتکەیەکی بەرزتر، ئینجا بە خەباتو شەهادەتی پێشەوا قازی محەمەد بەرزترین لوتکەی هێناوەتە ژێر پێ.

**مڵکداری، واتە خاوەن مڵکی**

سەیف خاوەنی چەندین گوندی شەشدانگو سێ دانگ بووە. لەو گوندانەو بەتایبەت لە گوندی "گوێگجەلی"دا کە ماڵو دیوەخانی سەیفی لێ بووە، سەیف بەکاری ئاوەدانکردنەوەو بەتایبەت باغدارییەوە خەریك بووە.

**مەسەلەی ناو:**

ئەوەندەی زانرابێت، نەمر سەیفولقوزات ناوی حەسەن بووەو بە ئاغای سەیفیش ناوی دەکردووە. بەڵام لە هەندێك لە شێعرەکاندا -بەتایبەت- شێعری فارسی، کاتێ یادداشتی نووسیوەو ئیمزای کردووە، ناو یاخۆ مۆرەکەی بە "ابوالحسن" نووسراون. ناسنامەی ڕەسمیی حکوومیی سەیفیش کە بەداخەوە تەنیا فۆتۆکۆپییەکی ڕەشداگەڕاوی لە بەردەستی مندایە، وشەی "ابوالحسن سیف قاضی"ی بە ڕوونی تێدا دەبینرێتو لە بەڵگەنامەی "جواز حمل تفنگ دو لول سرپرشکاری" یشدا، کە لەشکری ٤ی "شمال غرب"ی ئێران لە ١٣٢٠/١/١٠دا بۆی دەرکردووە، بە "ابوالحسن سیف القضات" ناو براوە.

"ابوالحسن" ناوێك نییە لە ناوچەکە و لەناو کوردی سوننیدا هەبووبێتو لەڕاستیدا ابوالحسن"کنیە"یەو بە واتای باوکی حەسەنە. بەڵام وێدەچێت ئەم هەڵبژاردنی ناوە لەلایەن مەرحووم "میرزا ابوالقاسم"ی باوکییەوە بەگوێرەی نەریتێکی تایبەتی بنەماڵەکە بووبێت، کە قازی قاسمی باوکی سەیفیش بە هەمان

شێوە بە "ابوالقاسم" ناودێر کراوە. ناوی ئەحمەدی کوڕی سەیفیش لەسەر یەکێ لە شێعرەکان بە "میر ئەحمەد" نووسراوەو ئەوەش دوور نییە لەبەر خاتری وەجیهە خانمی هاوسەری بووبێت کە کچی مەلاو سەییدێکی عەجەم بووە.

### شەجەرەنامە

بەهۆی ئەرکی گرنگی سیاسیی چەند کەس لە ئەندامانی بنەماڵەی قازیو بۆ ڕوونبوونەوەی پەیوەندیان لەگەڵ یەکتر، هەوڵ دەدەم شەجەرەنامچەیەك لە گرنگترین ئەندامانی بنەماڵەکە پێك بێنمو لە بەشی "بنەماڵەی سەیفولقوزات"دا بیخەمە بەرچاوی خوێنەر.

### سەیفو مەسەلەی ژن

لە پەیوەندی ژنو مافەکانیدا، هەڵوێستی سەیف هەندێك ئاڵۆزە:

١- لەیەك لەو وێنانەدا کە دەکەوێتە بەرچاوی خوێنەرەوە، سەیف بە جلوبەرگی مەلایەتییەوە- جلوبەرگی ئاسایی خۆی لە هەموو تەمەنی دوای فەقێیەتی، بەرچاو دەکەوێت کە بە ڕووی خۆشەوە لەنێو کۆمەڵێك خەڵك وەستاوە و چەند کەسیان ژنی سەرڕووتن و جلوبەرگی نوێی ئورووپاییان لەبەردایە. ئەگەری زۆر ئەوەیە وێنەکە لە ساڵی "کەشفی حیجاب"ی ڕەزا شا ١٣١٤[= ١٩٣٥] ، یاخۆ دواتر لە شارێکی وەك تاران، تەورێز، یا ورمێ هەڵگیرابێت.

٢- لای کەم شێعرێکی فارسی هەیە کە بۆ وەجیهە خانمی هاوسەری خۆی نووسیوەو وەك ((وەجیهە خانمی لە گیان خۆشەویستترم)) ناوی بردووە.

((تو آن نه ای که ز خاطر برون روی نفسی<br>
من آن نیم که به غیر از تو دل دهم به کسی... ))<br>
٦ شوال ١٣٤٩ (= ١٩٣١/٢/٢٥)

لە تەورێز گوترا (دەقی نوسخەی حەسەنی قازی).

شێعر بۆ هاوسەر گوتنو ناوبردەکردنی لەناو دەفتەری شێعردا، ئەویش لەلایەن مەلاو قازییەکی ناو بە دەرەوەی ئەو سەردەمە، پێویستی بە بیرێکی ڕوونو هەڵوێستێکی دیموکراتیانە هەیەو بە هەمان شێوەیە، وێنەگرتن لەگەڵ ژنانی

بێحیجابیش. ئەم کارە تەنیا لە سەیف- وەك مەلایەکی ڕووناکبیری کورد دەوەشایەوەو ئەستەم بوو مەلای عەجەم کاری ئەوتۆی بکردایە.

٣- لەگەڵ ئەوانەشدا، سەیف پارچە شێعرێکی هەیە

((ئەگەر دەپرسی باسی ئەم ناوە،

حوکمی ئازادی ئیعلان کراوە...)

کە بە ئاشکرا دوای ڕاگەیاندنی یاسای (لابردنی حیجاب) لەلایەن ڕەزاشاوە گوتراوە. شێعرەکە وا هەیە سەربەخۆ بێتو واش هەیە بەشێك بێت لە شێعری پێش خۆی:

((عەزیزم ناردبووی بۆم سەر کڵاوە

دۆعای گەیاند بووم، دەگەڵ سڵاوە...))

فەزای گشتی شێعرەکە بریتییە لە نامەیەکی شێعری، کە سەیف لە شارێکەوە (تاران، تەورێز، یا ورمێ)، کە من زۆر پێم وایە تاران بێت، بۆ عەزیز ئاغای عەبباسی نووسیوەو تێیدا باسی گۆڕانی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئازادیی ژنانو هاتنە سەر شەقامیان، هەروەها وەرزشو چوون بۆ "سیرك"و تیئاترو سەرڕووتیو ڕەقس و گەردشی ژنان دەکاتو من دووری نازانم ڕێکەوتی گوتنەکەی لەگەڵ ڕێکەوتی هەڵگرتنی ئەو وێنەی وا پێشتر باسمان کرد، هەر یەك بێت.

شێعرەکە ئاوێنەیەکی ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییانەیە کە دوابەدوای هاتنە سەر حوکمی ڕەزاشا لە ئێراندا هاتە کایەوەو بۆ نموونە، باسی کۆکردنەوەی چەك، وەرگرتنی "سجیل" یا ناسنامە، مەشموولیو سەربازیو لاچوونی پێچو کڵاو و دانانی کڵاوی پەهلەوی دەکاتو لەو پەیوەندییەدا دەچێتە سەر باسی ئازادی ژنانو لە کۆتاییدا هەموو ئەوانە پەیوەند دەدات بە تەکیەو خانەقاو مزگەوتو نوێژو جومعەو جەماعەتو ڕۆژوو و حەجو سەرفیترەو زەکاتەوە.

شێعرەکە، لەباری بۆچوونەوە پەیامێکی ناتەباو ئاڵۆز بە خوێنەر دەدات. لەلایەکەوە دەڵێ:

((ژنو پیاو وەك یەك زەحمەت بکێشن

فەرەنگی، بەوەی لێمە لەپێشن....))

کە پەسنی ئەو بەرانبەرییەی ژن‌و پیاوە، لەلایەکی دیکەوە زیاترین فەردەکانی شێعرەکە بە تەوس‌و تەنز یا ڕاشکاوی، هێرشکردنە سەر هەمان ئەو ئازادییانەیە بۆ ژن.

((وەرزش دەکەن‌و زۆرانی دەگرن
عەیب‌و عار نەما، نابێ تێفکرن
باسك ڕاست دەخەن، خۆ دادەنوێنن
سینگ وەپێش دەخەن، لاقان هەڵدێنن...
ئەوجار هەر کەوتن بۆ کوڕ لایقە،
لەژێرو لەسەر هەر ئەو فایقە!...))

تا ئەو شوێنەی کە دەڵێ:

((نابینم نوێژو جومعەو جەماعەت
نابییێم بانگ‌و ئەوڕادو قامەت
کوا حەڵقەی دەرسی مەلای لادێیان؟
کوا دەور و "ئالی بابا"ی فەقێیان؟....))

بە تێگەیشتنی من، سەیف وەك مەلایەکی بیرڕووناك لەنێوان دوو جازیبەی بەهێزدا گیری خواردووە. لەلایەکەوە بڕوای ئایینی‌و سوننەتی- کە هەموو نیشانەکان دەری دەخەن پێی وەفادار بووەو تا کۆتایی تەمەنی خەریکی نوێژو ڕۆژوو و زیکری خانەقا بووە، لەلایەکی دیکەوە پەسن و ددان پێدانانی شێوەکانی "مۆدێڕنیسم"- کە دوابەدوای مەشرووتییەتی ساڵی ١٩٠٦و سەرهەڵدانی دەسمایەداری‌و بە تایبەت ئەو هەوڵانەی وا لەسەردەمی حوکمی ڕەزاشادا بۆ گۆڕینی بنەماکانی ژیانی فیئۆداڵی‌و لای کەم وەرگرتنی ڕواڵەتی ژیانی ڕۆژئاوایی دەدرا.

سەیف ڕۆڵەی سەردەمی خۆیەتی‌و لە ساڵانی دەرکەوتنی ئەو گۆڕانکارییە گرنگانەدا ئاشکرایە نەیتوانیبێت بە شەوێك‌و ساڵێك زنجیری پەیوەندەکانی خۆی لەگەڵ کۆمەڵگای سوننەتی بپچڕێنێت- کە بە تایبەت خۆی لە باوەڕە ئایینیەکاندا دەنواندو لە سەنگەری ئاییندا ماتەی کردبوو.

سەیف بەردەبازی ڕاگواستنی کۆمەڵگای سوننەتی بۆ مۆدێڕنیزمێك بوو کە ئەودەم تازە سەری هەڵدابوو، هەڵوێستی سەیف بەرانبەر بە مەسەلەی ژنیش- وەك یەك لە گرنگترین بەرەکانی شەڕی ئەو دوو دیاردەیە، نیشاندەری پەیوەندییەتی لەگەڵ هەردوو لایەنی کێشەکە- سوننەت‌و مۆدێڕنیسم!

## بنەماڵەی سەیفولقوزات

بۆ ئەوەی پەیوەندیی سەیف لەگەڵ ئەندامانی دیکەی بنەماڵەی قازی ڕوون بێتەوەو هەروەها بزانرێت کەسوکاری سەیف لە ڕێگەی ژنو ژنخوازییەوە لەگەڵ چ کەسانێکدا خزمایەتییان هەبووە، تکام لە کاک حەسەنی قازی کرد هەندێك زانیاریم لەم بارەیەوە بداتێ. ئەوەی لە خوارەوە دەیبینن ڕاگەیاندنەکانی کاک حەسەنەو من لەسەر بنەمای ئەوانە، شەجەرە نامچەیەکم پێك هێناوە کە بە شوێن زانیارییەکاندا دێت. زۆرم پێ باش دەبێت تا ئەو شوێنەی بکرێت وێنەی ئەندامانی بنەماڵەی سەیف لە بەشی پاشکۆی ئەم کتێبەدا بڵاو بکرێنەوە، بەڵام ئەوە وەستاوەتە سەر توانای ئەوەی لە دوورەوڵاتی چی دەکرێت. هەروەها پارچە شێعرێکی فارسی سەیف بۆ شەهید محەمەد حسێن خانی کوڕی دێنمەوە کە تێیدا ڕێنومایی کارو کاسبیو ڕاستیو دروستی کوڕەکەی دەکات و ناوی منداڵەکانیشی لە شێعرەکەدا دەگونجێنێت. شێعرەکە هەروەها، بەشێوەیەك، کەسایەتیو خواستو ئارەزوو و ئامانجەکانی سەیف نیشان دەدات، کاتێ داوا لە کوڕەکەی دەکات نوێژو ڕۆژوو لەبیر نەکات، دەسگرۆیی خەڵك بکات، برای خۆی خۆش بوێت، ئاگای لە ژێردەستان بێت، لە هاوڕێی خراپ دوور بکەوێتەوە، ئاگای لە ملكو ماڵ بێت، باغو دارستان بنێتەوە، شەڵتووکی برنج بچێنێت، و لەجیاتی چەوەندەر داری قەیسی بنێژێت.

بەڵام لە هەموان گرنگتر، ژیننامەیەکی کورتە، کە ڕێزدار گەوهەر تاج خانمی سەدری قازی لە ساڵی ١٣٨٣هـ [٢٠٠٤ز]دا نووسیویەو کاك حەسەن لەبەری نووسیوەتەوە و بۆی ناردووم.

گەوهەر تاج خانم وەك ئەندامێکی بنەماڵە، شارەزای کەسایەتیو شێوەی ژیانی سەیف بووەو هەموو بۆچوونەکانی لەمەڕ ئەو، دەبێ بە هەند وەربگیرێن. کەوا بوو، با سەرەتا بەیەکەوە یادداشتەکانی ئەو بخوێنینەوە، ئینجا بچینە سەر زانیارییەکانی دیکە لەمەڕ بنەماڵەی سەیفولقوزات:

### ژیننامەی سەیفولقوزات

**نووسینی: گەوەر تاجی سەدری قازی**

((مەرحوومی سەیفی قازی یانی ئەبولحەسەنی سەیفی قازی کە تا ساڵی ١٣٠٦ [هەتاوی] دەگەڵ قازی عەلی برای خۆی جەمعولماڵ بوو، جوێ دەبێتەوە ماڵی

دەچێتە گوێگجەلی خەریکی کەسبو کارو فەلاحەت دەبیٚو گوێگجەلی لە ئەسەر فەعالییەتی ویدا زۆر ئاوەدان دەبیٚو بەندی ئاوی بۆ لە چۆمی جەغەتووی هەڵ دەبەستیٚو ڕۆژ بە ڕۆژ دێیەکە ئاوەدانتر دەبیٚ.

گوێگجەلی قەبلەن ئی سمایل بەگی حەیدەری بووەو [وشەیەك دەبیٚ لێرەدا کەوتبیٚ، وا هەیە "عیمارەتێك" بیٚ] لەسەر تەپەیەك ڕوو بە چۆمی جەغەتوو دروست دەکاو تاریخیشی هەیە بە دیواری عیمارەتەوەیە. ئاغای سەیف بەنناو ئوستادکارو میٚعمار لە تەورێز دێنێت و لەسەر عیمارەتی سمایل بەگ یەك دەست خانووبەرەو عیمارەتی زۆر خۆشو با سەفا دروست دەکاتو تەبەقەی دووەمی عیمارەت....

ئەڵبەتە لێرەدا زیندەگیی ئەبولحەسەن لە سیننی منداڵیدا بەحس دەکەم. کوڕی میرزا قاسمی قازیو دایکی هەمین خانم لە تایفەی کاکە مەلا بووە. ئاغای سەیف عومری زۆر کەم بووە دایکی بە ڕەحمەتی خودای دەچیٚو پیرۆزە خانمی خوشکی خۆی زۆری ئاگا لێی دەبیٚ. میرزا قاسمی بابی دەگەڵ فاتمە خانمی کچی ئەمینولیسلام عەرووسی دەکاو بۆ حەسەن چاك نابیٚ، بۆ خۆی تەعریفی دەکرد، هەمیشە لە جێی تەڕ دەینواندم ئەلعان بۆیە هەمیشە لاقم دێشیٚ. فاتمە خانم لە میرزا قاسم کوڕێکی دەبیٚ بە نێوی میرزا ڕەحیم، دە سیننی نەوجەوانیدا لە ئاوایی پیرۆلی باغی لەسەر ئیختیلافی زەوی یەعنی مەزرەعە دەگەڵ مالیکی بورهان شەهید دەبیٚ. خولاسە ئەبولحەسەنی سەیف لە مەحکەمەی قازی یەعنی مزگەوتی قازی کە هەمیشە مەلاو مودەریسی گەورەی هەبووە دەرس دەخوێنیٚ، دوایە بۆ تەکمیلی تەحسیل دەچێتە قەریەی سڵەمانکەندی موڵکی ئاغا شێربەگ کە مەلای زۆر باسەوادی لیٚ بووە، ئەو سەردەمە [ئەوان] دەگەڵ خانەوادەی قازی عەلی برای، خزم بوون. ئاغای سەیف تەبعی شاعیری هەبووە. ماڵی ئاغا شێربەگ لەگەڵ عیمارەتی مزگەوتی سڵەمانکەندی هەمجەوارن.

ئاغای سەیف فەقێی جەوان لەسەر بانی مزگەوت دەرس حازر دەکاو لە حەساری ماڵی ئاغا شێربەگ لە دووڕا چاوی بە زبێدە خانم کچی چکۆڵەی ئاغا شێربەگ دەکەویٚ؛ فەورەن دڵێكو هەزار دڵ عاشقی دەبیٚو بە خاتری زبێدە خانم غەزەلێك شێعری بە زاراوەی بەشی فەیزوڵڵابەگی گوتووە- [کە] دە کتێبی شێعری ئاغای سەیفدا نییە [نیاز، دیوانی سەیفولقوزات چاپی کاك ئەحمەدی قازییە].

ئەمن ئەو شێعرە، کە دەینووسم لە خوارەوە، لە کچی گەورەی ئاغای سەیف فاتمە خانم بیستووە کە لەسەر مقامێك بەناوی سەوزەی هەمزە بەگ گوتوویەتی دوو شێعری ئاوایە:

((سەوزە هەی سەوزە، سەوزەی واشە چەم!
ئاو لە شەتاوخور، پەڕەی گوڵ بەدەم!
بۆچی نامان کەی بە نەزری خاڵان؟
بەندە ڕزگار کەی لە وێڵیی ماڵان))

خولاسە ئاغای سەیف دەرسی تەواو دەبێ و خوازبێنی زبێدە خانم دەکرێ، ئەو زەمانی ئاغا شێربەگ دە حاڵی حەیاتدا نابێ، گەنجاڵی خانی برای زبێدە خانم مانعی ئەو خزمایەتییەیە ئیجازە نادا، بە هەزار زەحمەت ڕازی دەکەن، خولاسە زبێدە خانم بە تەشریفات و ڕسوومی ئەو سەردەمەی بە بووکی دێتە سابلاغ و دەگەڵ خوشکی گەورەی خۆی گەوهەر تاج خانم دەبنە بووکی میرزا قاسمی قازی. موتەئەسیفانە ئەو دوو خوشکە ٣ مانگ دەگەڵ یەك دەبن، گەوهەر تاج خانم لەسەر زایمان بە ڕەحمەتی خودا دەچێ.

زبێدە خانم دایکی شەهید محەمەد حسێن خانی سەیفی قازییە. چەند کوڕی بە چکۆلەیی مردوون. تەنها ئەو کوڕە موحتەرەمەی بوو [منداڵەکانی دیکەی هەموو کچ بوون]، دەگەڵ دایکی خۆی بە ئیحتیرام بوو و زۆری خۆش دەویست.

ئاغای سەیف وەك لە ئەوەڵدا عەرزم کردن تا ساڵی ١٣٠٦ [١٩٢٧] دەگەڵ قازی عەلی جەمعولماڵ بوون، دوایی دەچێتە گوێگجەلی. کوڕی نۆبەرەی میرزا مەحمود بە جەوانی مەرحووم بووە. چەند کچی هەبوو: فاتمە، سوڵتان، حومێرا، عایشە، هەر چوار کچ خانمانی موحتەرەم و با وەفا بوون. کچانی ئاغای سەیف و زبێدە خانم مەخسووسەن عایشە خانم کچی چکۆڵەی، زۆری خزمەتی بابی خۆی کردووەو هەمیشە دۆعای بە خێری بۆ دەکرد.

ساڵی شکاکان، لەکن سمایلاغای سمکۆ بە درۆو دەلەسە شەیتانی لە ئاغای سەیف دەکەن. ئاغای سەیف مودەتێ لە ڕەزائییە دەبێ دەگەڵ وەجیهە خانمی جاوید ئیزدیواج دەکاو چەند ئەولادیان دەبێ.

ئاغای سەیف لە خانمێکی ئەهلی تەورێز [ڕووبابە خانم] کچێکی بوو بەنێوی توووران خانم زۆر ژنی چاك بوو.

سەیف پاش مودەتێك کە لە ورمێ دەبێ هەڵدەستێ دەچێتە (چاری) بۆ کن سمایلاغای شکاك. سمایلاغا بە مەحزی ئەوەی ئاغای سەیف مولاقات دەکا هەموو کودوورەت لە بەین دەچێ، زۆری ئیحتیرام دەگرێ‌و پێی دەڵێ دەبێ بچی بۆ کاری کوردستان هەمکاری بکەی.

خولاسە ئاغای سەیف بە عیزەت‌و ئیحتیرام ماڵی لە گوێگجەلی بوو باغاتێکی زۆریشی لێ‌دابوو، مەخسووسەن باغی ئارەزوو کە زۆری عەلاقە پێی بوو. ساڵی دووسێ جار دەهات بۆ سابلاغ و مێهمانی برازاکانی خۆی دەبوو لە وەتاغی قازی عەلی ئیستیراحەتی دەکرد. ئەمن‌و ڕابێعە خانم [ڕابێعەی ناهید کچی ئامینەی قازی، خوشکی قازی محەمەدو سەدری قازی‌و هاوسەری عەبدوڵلا بەگی ناهیدە، لەو سەروبەندەدا لەماڵی خاڵانی بووە، ئێستا لە شاری لەندەن دەژی] خزمەتیمان دەکرد، ساڵی حەتمەن دووسێ سەفەری سابلاغی دەکرد، مورەتەب شێعری دادەناو زۆر جاران یەك نوسخەی بۆ ئاغای سەدر دەنارد. تەواوی نوسخەی شێعرەکانی لە خزمەت کوڕی خۆی محەمەد حسێن خانی شەهید بوو. ساڵی دێمۆکراتی تەواوی شێعری بابی خۆی، ئاغای سەیفی جەمع کردبوو، دابووی بە مەلا حسێنی گلۆلانی بیاننووسێتەوە. مەلا حسێن هەمووی زۆر جوان نووسیبوو و مورەتەب کردبوو. دوایە وەزع گۆڕا، محەمەد حسێن خان بە منی گوت خانمە خانم ئەو شێعرانەی مەرحوومی سەیف بە ئەمانەت لەکن تۆ بێ تا چاپ دەکرێن. لەبەر ئەوەی محەمەد حسێن خان ئەو ئەمانەتەی دابووە دەستی من، لە تاران بە کۆمەگی کاك ئەحمەدی قازیی کوڕی قازی کەریم چاپمان کردو مامۆستا هەژار پێشەکی لەسەر نووسی.

وەختێك ئاغای سەدر نومایەندە بوو و ماڵی لە تاران بوو، ئاغای سەیف تەشریفی هاتە تاران‌و مێهمانی ئاغای سەدر بوو، نەخۆش بوو، ئەگەر لە موسافەرەتی تاران گەڕاوە گوێگجەلی، لە ساڵی ١٣٢٣ بە ڕەحمەتی خودای چوو و لە خانەقای شەمسی بورهان بە خاك ئەسپێردرا. پاش چەندین ساڵ بۆ ئەوەی مەرقەدی وی لە بەین نەچێ ئیجازەمان لە میرزا عەبدوڵڵای شەمسی بورهان خواست‌و کێلی بەردمان بۆ ئامادە کرد.))

ئەوەی تائێستا گوترا، دەقی یادداشتەکانی ڕێزدار گەوهەر تاجی سەدری قازی بوو. سەبارەت بە مەرگی سەیف کە گەوهەر تاج خانم باسی کرد، ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٨ی ڕێبەندانی ١٣٢٤ و ٢٨ی ژانویەی ١٩٤٦ نووسیویەتی:

[سەیف] ((لە ڕۆژئاوای حەوتمی ڕێبەندان (بهمن)ی ١٣٢٣ی شەمسی موتابیقی ١٢ی سەفەری ١٣٦٨ی مانگی لە تەمەنی هەفتا ساڵیدا دنیای وداع کرد.))

## زانیاریی زیاتر سەبارەت بە سەیف

ئەمر دوکتۆر ڕەحیمی سەیفی قازی- کوڕی سەیفولقوزاتەو یەك لەو ٥٠ لاوە کوردانەیە- کە لە سەردەمی کۆماری کوردستان‌دا بۆ مەشقی ئەفسەری نێردرانە باکۆ، زوربەی ئەو لاوانە لەگەڵ تێکچوونی کۆمار هاتنەوە ڕۆژهەلاتی کوردستان، بەڵام ئەو و چەند کەسی دیکە لەوێ مانەوە. ڕەحیمی قازی هەر لە موهاجەرەت ڕۆمانی بەناوبانگی "پێشمەرگە"ی نووسی. لە ساڵی ١٩٧٩ دوای ٣٣ ساڵ دووری هاتەوە کوردستان‌و لە کۆنگرەی چوارەمی حدکادا وەك ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی ئەو حیزبە هەڵبژێردرا، بەڵام دواتر لەبەر جیاوازیی بیروڕا سەبارەت لەمەڕ بۆچوون بۆ حکوومەتی ناوەندی، ئەوو شەش کەسی دیکە جیا بوونەوە. دوکتور ڕەحیمی قازی لە ساڵی ١٩٨١ دیسان چووەوە باکۆ.

دوکتۆر ڕەحیم کتێبێکی بە فارسی و هەم بە کوردی نووسیوە، کە بەداخەوە تائێستا چاپ نەکراوە. لەو کتێبەدا بەدرێژی باسی سەیفولقوزاتی کردووە و لەسەر هەندێ چالاکیی سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی سەیف زانیاریی زۆری داوەتە دەست. ناوی کتێبەکە "قازی محەمەدو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوایەتیی گەلی کورد" و دەستخەتە فارسییەکەی لە ساڵی ١٩٨٦دا نووسراوەتەوە. من بەشی پەیوەندیدار بە سەیفولقوزاتی کتێبەکەم بە فارسی لەبەر دەستدایەو هەوڵ دەدەم ئەگەر دەقە کوردییەکەیم دەست نەکەوت، وەری بگێڕمە سەر کوردیی‌و بیکەمە پاشکۆی ئەم کتێبە.

دوکتۆر ڕەحیم دەنووسێت:

((ابوالحسن سەیفولقوزات دەورێکی زۆری لە پەروەردەی سیاسی قازی محەمەدو ناسیاوبوونی لەگەڵ بیری نیشتمانیی‌و پێشکەوتووی سەردەمی خۆی هەبوو.

سەیف، شاعیرێکی شۆڕشگێڕو یەك لە زانایانی ناوداری سەردەمی خۆی بوو، کە بە کوردیو فارسیو عەرەبی شێعری زۆری گوتووەو... لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بە پیرەمێردی موکریان ناسراوە... سەیفولقوزات دەکرێ بڵێین یەکەم شاعیری هەموو ئێرانە کە بەهۆی شێعری پڕ ناوەرۆکی سیاسیو شۆڕشگێڕانە، سەبارەت بە گرنگایەتی بزووتنەوەی دیموکراتەکانی ئازەربایجان دواوەو بایەخی زۆری بە شۆڕشی مەزنی سۆسیالیستی لە ڕووسیا داوە...»

### "سەوزە"ی هەمزە بەگ

لە یادداشتی سەرەوەی ڕێزدار گەوهەرتاج خانمدا ئاماژە بە "سەوزەی هەمزە بەگ" کرابوو- کە دەبێ شێوازێك بێت لە بەند یا مەقامی سەوزە، کە ناسیاوی گوێی هەموولایەکمان هەیەو بە شێوازی جیاجیا لە ناوچەی جیاوازی ڕۆژهەڵاتو باشووری کوردستان گوتراوە. من نەمتوانی بزانم هەمزە بەگ کێیە، بەڵام دووری نازانم کەسایەتییەکی ناوچەی فەیزوڵڵا بەگی بووبێت لە دەوروبەری بۆکانو سەقز، جا گۆرانیبێژەکە بێت، یاخۆ ئاغاو دەسەڵاتدارێکی ناوچە- کە ئەو هەوا تایبەتە بۆ ئەو گوترابێت. هەر کەس هەیە، یادی بەخێر بێت کە مۆسیقای نەتەوایەتیمانی بەو گۆرانییە خۆشە دەوڵەمەند کردووە، بەڵام من لەسەر شێعرەکە ئەم تێبینییانەم هەیە:

١. سەیف کە تەبعی شاعیری هەبووە، گەلێك گونجاوە بە گەنجییەتیو لە سەردەمی فەقێیایەتیشدا شێعری گوتبێتو ئەوەش یەك لەو شێعرانە بێت.

٢. زانیارییە مێژووییەکان وەك ژنهێنانی سەیفو خوێندنی لە گوندی سڵەمانکەندیی سەر بە سەقزیش لەگەڵ ئەو هەواڵەدا یەك دەگرنەوە.

٣. ئەگەرێك ئەوەیە سەیف لە ماوەی ژیانی نێو فەیزوڵڵا بەگیدا شێوەزاری ئەوان فێر بووبێتو شێعری پێ گوتبێت، واتە ئەم شێعرەش هی ئەو بێت.

٤. بەڵام هەندێ تایبەتمەندیی زمانی وا دەکەن گومان لە بۆچوونەکە بکەمو بڵێم شێعرەکە فۆلکلۆری بووەو لە ناوچەکەدا گوتراوە، سەیفیش وەریگرتووەو بە گۆرانی گوتوویەتەوە. من تەعبیری "واشەچەم" تەنانەت بۆ ناوچەی فەیزوڵڵا بەگیش بە گونجاو نازانمو هەست دەکەم لە باشوورتر واتە لە هەورامانەوە گەیشتبێتە ناوچەکە.

هەرچۆنێك بێت بەهۆی بەرزبوونی ڕادەی هونەریی شێعرەکەوە، وام بەباش زانی بینێرم بۆ هونەرمەندی ناوداری کورد کاك حەسەنی دەرزی کە خۆی خەڵکی

ناوچەی فەیزوڵڵا بەگییەو شارەزاییەکی زۆری لە مۆسیقای ناوچەکە هەیە. کاك حەسەن لەسەر تەلەفۆن هەوای گۆرانییەکەی بۆ گوتمو جیاوازیی سەوزەی هەمزە بەگی لەگەڵ "سەوزە"ی موکریان دەست نیشان کرد. ئینجا من تکام لە کاك حەسەن کرد نۆتەی گۆرانییەکە بنووسێتەوە کە قەبووڵی کردو ئەوەی لێرەدا دەیبینن بریتییە لە نۆتەی هەوای "سەوزەی هەمزە بەگ"، کە لە ناوچەی فەیزوڵڵا بەگی سەقزو بۆکان دەگوترێت و هونەرمەند کاك حەسەنی دەرزی نووسیویە.

نۆتەی هەوای "سەوزەی هەمزە بەگ":

"هێندێك زانیاری سەبارەت بە کەسوکاری نزیکی سەیف"

١- ناوی باوکی سەیف میرزا ئەبولقاسمی قازی بووە.

٢- ناوی دایکی "هەمین" بووە، کە لە ناسنامەی فارسیدا وەکوو "امینه" [ئەمینه] نووسراوە. ئەو خانمە کچی کەسێك بووە بەنێوی کاکە مەلا، لە تایفەی چاورەقان، لە سابلاغ.

٣- سەیف، ٣ براو خوشکێکی هەبووە:

قازی عەلی [باوکی پێشەوا قازی محەمەدو سەدری قازی]، میرزا عەبدوڵلا ناسراو بە قازی عەسکەر کە وەجاغ کوێر بووەو لە دێی پیرۆلی باغی دانیشتووە،

میرزا عەبدولڕەحیم کە بە لاوێتی لە شەڕی کۆنە مەلالەردا کوژراوە [میرزا خەلیلی فەتتاحی قازی بە درێژی باسی ئەو شەڕەی کردووە]و خوشکەکەشی نێوی پیرۆزە خانم بووە، ئەو پیرۆزە خانمە بەپێی نووسینی میرزا خەلیل فەتاحی قازی زیاتر لە ٧٠ ساڵی عومر کردووەو مێردی بە یەکێك لە ئەندامانی تایفەی قازی کردووە، کوڕێکی بووە بە نێوی میرزا محەمەدی فیرووزیو کچێك بە نێوی ئایشە خانم کە مێردی کردووە بە کەسێکی قەرەپەپاغ.

٤- وەك پێشتریش گوترا، سەیفو قازی عەلی دوو خوشکیان خواستووە، کە کچی ئاغا شێر بەگ لە تایفەی [عەشیرەتی] فەیزوڵلا بەگی بوون.

ژنی قازی عەلی نێوی گەوەر تاج خانم بووە، کە حەوت منداڵی لە قازی عەلی بووە کە سێیان بە منداڵی مردوونو ئەوانەی دی: خەجیجە، قازی محەمەد، سەدرو ئامین. قازی عەلی لە ژنی دووەمیش کچێکی بووە بە نێوی فاتمە خانم، کە وەکوو خانمە چکۆڵە بانگیان دەکردو مێردی کردبوو بە قادر ئاغای قالوێ لە عەشیرەتی گەورك. واتە پێشەوا قازی محەمەدو سەدر لەگەڵ حەمە حسێن خان هەم باوکیان برا بوونو هەم دایکیان خوشك.

دوو لە کچەکانی قازی عەلی شوویان کردووە بە فەیزوڵلا بەگیان: خەجیج هاوسەری کاکە ڕەحمانی یەکشەوە [باوکی سەعیدی هومایوون]و ئامین لەپێشدا هاوسەری عەبدوڵلای ناهید [ئیفتیخار] بووەو دوو کچی لێی هەیەو دواتر شووی کردووەتەوە بە حەمە حسێن خانی بەردەزەرد (ئەمیری). یەك لە کچەکانی ئێستا لە لەندەن دەژی.

**منداڵەکانی سەیف**

**لە زبێدە خانم کچی ئاغا شێر بەگی فەیزوڵلا بەگی:**

ژنی یەکەمی سەیف نێوی زبێدە خانم و شەش منداڵی لێی بووە، ٢ کوڕ و ٤ کچ:

١- مەحموود،

٢- محەمەد حسێن خان، کە دوو جاری زەواج کردووە، ژنی یەکەمی ترکی ئازەربایجانی لە ئاغاوەتی ئیفتیخاری ئەوبەری جەغەتووە بووە [نازانم خۆی بە مەرگی تەبیعی مردووە یان جویٚ بوونەتەوە].

ژنی دووەمی نێوی فەرِوخلەقا خانمی مەلیك قاسمی کچی ئیمامقولی میرزای قاجار بووە، ئەو ئیمامقولی میرزایە کە ماوەیەك حاکمی سابلاغ بووە لەویٚ ژنێکی کوردی هێناوە بە نێوی خەجیج دوای شەهادەتی سەیفی قازی فەرِوخلەقا (شازادە خانم)، کە زۆر ژنێکی بەمشوور بوو، بەپێی وەسییەتی محەمەد حسێن خان، کە داوای لیٚکردبوو دوای نەمانی وی دەتوانیٚ لەسەر ژیانی خۆی برِیار بدا، لەگەلٚ هەمزاغای کەریمی زەواجی کردو لەو کچێك‌و دوو کورِی هەیە. فەروخلەقای مەلیك قاسمی لە رِۆژی چوارشەمۆ سێهەمی بەفرانباری ١٣٦٥ی هەتاوی لە شاری تەورێز کۆچی دوایی کردووە.

٣- فاتم مێردی کردووە بە میرزا عەزیزی میسباحی قازی، ئێستا نەماوە.

٤-حومێرا بە جەوانی مردووە.

٥- سولٚتان خانم مێردی کردووە بە عەبدولرِەحیمی جەوانمەردی قازی، ئێستا نەماوە.

٦- ئایشیٚ مێردی کردووە بە ئەحمەد ئاغای حیسامی کورِی حاجی حەمەد ئاغای شێخالی باوکی مامۆستا هێدی شاعیر.

**مندالٚەکانی سەیف**

**لە وەجیهە خانمی جاوید، ترکی ئازەربایجانی و خەلٚکی ورمیٚ:**

١- ئەحمەد بە جەوانی مردووە.

٢- مەحبووبە بە جەوانی مردووە.

٣- رِەحیم لەپێشدا لەگەلٚ کچی ئامۆزای خۆی، واتە گەوهەرتاج خانمی کچی سەدری قازی [خانمە خانم]، کە بە نێوی نەنکی واتە دایکی باوکیەوە ناودێرکراوە، زەواجی کردووە. نزیکەی ٦ مانگ بەیەکەوە بوون، کە رِەحیم نێردراوە بۆ باکۆ لەویٚ ژنێکی ئۆکراینی جوولەکەی هێناوە لەو ژنەی ٢ کچی هەیە. حەسەنی سەیفی قازی کورِی رِەحمەتی رِەحیمی سەیفی قازی‌و رِێزدار خانم خانمەیە.

٤- عەبدوڵلا بە جەوانی لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا لە تاران لە ڕووداوێکی ئۆتۆمبێلدا گیانی لەدەست دا.

**منداڵی سەیف**

**لە ڕوبابە خانم، ژنێکی دیکەی ترکی ئازەربایجانی:**

سەیف لە ڕوبابە خانم تاکە یەك منداڵی هەبووە، ئەویش تووران خانمە، کە مێردی کردووە بە فەتتاح خانی قەرەوێران [میر موکری] کە پیاوێکی زۆر ئازا بووەو قاتڵی خۆی (برایمە سوور، برای مستەفا خانی خوێریاوایەی لە شەڕێکی بێ مانادا لە میاندواو کوشتۆتەوە). لە فەتتاح خان کچێکی بووە بە نێوی ئێران کە ئێستا ماوە. تووران خانم، دوای کووژرانی فەتتاح خان مێردی کردووەتەوە بە حەسەن خانی میر موکری برازای فەتتاح خان و کوڕی مەجید خانی قەرەوێران، لەو زەواجەش کچێك و کوڕێکی هەیە- هوما و خەسرەو، کە خەسرەو ئێستا لە بۆکان دەژی. ڕوبابە خانم، ژنی سیغەیی سەیف بووە.

لەسەر بنەمای زانیارییەکانی سەرەوە و بۆ هاسانکردنەوەی ناسینی پەیوەندییەکانی بنەماڵەی سەیف، من ئەم شەجەرەنامەیەم پێك هێناوە:

**منداڵانی میرزا ئەحمەدی قازی**

١. <u>میرزا ئەبولقاسمی قازی</u>
٢. حاجی شێخ جەلال
٣. میرزا فەتاحی قازی
٤. قازی وەهاب
٥. میرزا ڕەزاقی قازی
٦. قازی لەتیف
٧. میرزا مەجید
٨. میرزا ئەحمەد

**منداڵانی میرزا ئەبولقاسمی قازی**

١.١ قازی عەلی

١. ٢ قازی عەسکەر

١. ٣ سەیفولقوزات

١. ٤. میرزا عەبدولڕەحیم

١. ٥ پیرۆزە خانم

**منداڵانی سەیفولقوزات**

**ئ. لە زبێدە خانمی کچی ئاغا شێر بەگی فەیزوڵڵا بەگی**

١. ٣. ١ مەحموود

١. ٣. ٢ محەمەد حسێن

١. ٣. ٣ فاتمە

١. ٣. ٤ حومێرا

١. ٣. ٥ سوڵتان

١. ٣. ٦ ئایشێ

**ب. لە وەجیهە خانمی جاوید [خەڵکی ورمێ]**

١. ٣. ٧ ئەحمەد

١. ٣. ٨ مەحبووبە

١. ٣. ٩ ڕەحیم

١. ٣. ١٠ عەبدوڵڵا

**پ. لە ڕووبابە خانم، تورکی ئازەربایجانی**

١. ٣. ١١ تووران

**بەم پێیە، سەیف سەرجەم ٥ کوڕو ٦ کچی بووە.**

ئەم شێعرە فارسییەی سەیفیش لێرەدا دەهێمنەوە کە کاک حەسەن بۆی ناردووەو بە حیسابی ناوی منداڵەکانی شەهید محەمەد حسێن خانی کوڕی، دەبێ شێعرەکەی بۆ ئەو گوتبێت. دوور نییە لەکاتی گوتنی ئەم شێعرەدا سەیف لە تەورێز، ورمێ، یا خانەقای بورهان بووبێتو لە ڕێگەی ئەم نامە شێعرییەوە ڕێنومایی ژیانو ئیشوکاری کوڕی خۆی کردبێت، کە وەك دەبینین گەلێك واقیع بینانەو زانایانەیە- چ لە لایەنی ئەخلاقو هەڵسوکەوتەوەو چ لە باری کارو کردەوەو کاسبیو کشتوکاڵەوە:

ای که از صحبت تو شادانم / وز فراقت غمین و نالانم
از غم دوری "علی" معلول / زاشتیاق "رضا" پریشانم
هجر "عبدالفتاح" قاضی را / مار سر آتشم و او جانم
جای در دل چنان "کچی بابی" / گویی من قالبستم، او جانم
ای پسر من ترا پدر کردم / شکر گوئید فضل و احسانم
تا توانی دلم بدست آور / تا عزیزم شوی دو چندانم
ترك دین و نمازو روزه مکن / تا بجد گردی از نیاکانم
راستی پیشه‌کن، وفاداری / حب خویشان مهر دورانم
از خلایق تو دستگیری کن / تا نیفتی به چاه و زندانم
کم کن آخر تکبرو نخوت / شوی محبوب دوستدارانم
صحبت ناکسان مکن زینهار / تا کسانت شوند دربانم
من به خوشوقتی تو مسرورم / به رفیقان اهل و انسانم
هان و هان از رفیق بد بگریز / به تمسخر کنند یارانم
هان نگهدار مکنت پدرت / پسرانت خورند تاوانم
ملك دست آمده ز دست مده / تانگوئی زپس پشیمانم
آب رفته به جوی ناید باز / سد برآیند ز آب جویانم
هان غنیمت شمار موقع کار / حاصلی نیست از خیابانم
باغ بنشان چنارو بید بکار / تا خلایق خورند احسانم
جای شلتوك را معین کن / تا نگویی ز خوشه چینانم
تا توانی بکار زردآلو / از چغندر بسی هراسانم
جای جالیز را معین کن / شخم کن تاخوری ز بستانم
تا نگوئی که عیش، باید نوش / وقت تعطیل در زمستانم
پند پیرانه‌ی پدر بشنو / تا شوی راست از مریدانم
دوست دارید آن اخ کهتر / جز تو امید او نیمدانم
با فرومایه کم کن آمیزش / تا نکاهی ز شوکت و شانم
زیر دستان بسی رعایت کن / تا نباشی ززیر دستانم
گر به کذب و دروغ خوی کنی / شوی مغضوب حق سبحانم

١- عەلی کوڕی سێیەمی حەمە حسێن خان، لە ژیاندایەو لە کەرەج لە نزیک تاران دەژی.

٢- ڕەزا (محەمەد ڕەزا)، کوڕی دووەمی حەمە حسێن خان لە تەمەنی لاوێتیدا کۆچی دوایی کردووە.

٣- عەبدولفەتتاح (فەتتاح خان= بەهمەن خان) کوڕی گەورەی حەمە حسێن خانی سەیفی قازی لە ٦ی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی [٢٨ی ئۆکتۆبری ٢٠٠٥] لە ڕووداوێکی ئۆتۆمبێلدا لە شاری مەهاباد گیانی لەدەست داو دڵی خزم و دۆستانی هەژاند. ئەو کەشکۆڵەی ماڵەبابەوەیسی نووسیویەتەوەو بەشێك لە شێعرەکانی "سەیف"ی تێدایە، لەسەر داوای فەتتاح خان نوسراوەتەوە. لەو کەشکۆڵەدا مەلا بابەوەیسی شێعرێکی بۆ پەسنی فەتتاح خانی سەیفی قازی نووسیوەو بە دوایدا لەنێو چوارگۆشەیەکدا ئەو ڕستانەی نووسیوە: [تواو نوسراوە حسب الامر فتاح خان لە تاریخ هزار و سیصدو سی و نو مقارن چوار مهر ماە شمسی لە وختی نوسینیدا زور نەخوش بوم لە جیگادا بوم].

٤- کچی بابی (مەلووس)، کچی گەورەی حەمە حسێن خان، ئێستا لە دەوڵەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەژی.

٥- فایقە.

٦- مەحموود.

**ئاسەوارە شیعرییەکانی سەیف**

با لەپێشدا چاوێك بخشێنین بە چارەنووسی ئەو دەستنووسانەی شێعرەکانی سەیف کە ئێستا لە بەردەستی مندان:

**دەستنووسی شێعرەکانی سەیف**

وەك پێشتر گوترا، سەرچاوەی کاری من، سێ تاقم دەستنووس بوون کە کاك حەسەنی قازی بۆی ناردم‌و نووسیبووی:

((بەشێکی زۆری دەستخەتەکان لەلایەن ڕەحمەتی ڕەحیمی قازییەوە بە دەست من گەیشتووە کە دیارە هێندێکیان کۆپی بوون یانی ئەو کۆپی کردووەو کۆپییەکەی بۆ من ناردووەو هەروەها بەشێکی زۆر لە ژمارەدانانەکان لەلایەن ویرا کراون.

وا بزانم ئەو دەستخەتانە هەر ئەوانە بن کە وەرەسەی حەمە حسێن خانی سەیفی قازی (فەتاح خان) کوڕە گەورەی شەهید سەیفی قازی داویە بە ڕەحیمی سەیفی قازی‌و ئەوانە لە ساڵی ۱۹۸۷ یان ۱۹۸۸ چاکم لە بیر نییە بەدەست من گەیشتوون.

بەشێکی دیکە لە دەستنووسەکان [کە زۆر چاکتر پارێزراون] و ژمارەیان زۆر کەمترە لەو یەك دوو ساڵەی دواییدا لەلایەن گەوهەر تاجی سەدری قازییەوە بە دەستم گەیشتوون.

سەبارەت بە ئەو کەسانەش کە لە ڕووی دەستخەتی سەیف شێعرەکانیان نووسیوەتەوە.

۱- مەلا حسێنی گلۆلانی لەسەر داوای حەمە حسێن خانی سەیفی قازی نوسخەیەکی لە ڕووی دەستخەتی شاعیر هەڵگرتووەتەوە. نموونەی ئەو دەستخەتە لە ئەو نامیلکەیەدا کە کاك ئەحمەدی قازی ئامادەی کردووە هەیە.

۲- نوسخەیەك کە بە دەستی کەسێك نووسراوەتەوە کە لە لاپەڕەی ۱۲دا دەنووسێ:

(تحریر شد از روی نسخەایکە بدست شاعر در رمضان سال ۱۳۵۲ نوشتە شدە بود.

۱۳۳۷/٦/۱٦ خورشیدی)

جێی ئیمزا

لە لاپەڕەی ١١دا دەنووسێ ((١٦ شهریورماه نوشته شد.))

لە چەند لاپەڕەی دیکەشدا ڕۆژی نووسینەوەیان دیاری دەکا.

لە ڕووی نامەیەکیش کە دیارە سەیف بە فارسی بۆ عەزیز ئاغای کولتەپەی نووسیوە، نووسراوەتەوەو لەناو دەستخەتەدا هەیە.

٣- ئەوانی دیش بە بەراوەردی خەتەکان دەردەکەوێ، دەکرێ محەمەدی ئیمامی (محەمەد قازی) چەند شێعرێك و حەمە حسێن خانیش یەك لە نوسخەکانی شێعری لەمەڕ خیابانی، بە خەتی خۆی نووسیبێتەوە.

تا ئەو جێگەی ئەمن بزانم دەستنووسی شێعرەکانی سەیف و هێندێك لە کاغەز و یادداشتی شەخسی خۆی لە بنەماڵەدا پارێزراوە. لە زەمانی کۆماری کوردستان یان پێشتر شەهید حەمە حسێن خان کوڕی گەورەی سەیف داوای لە مەلا حسێنی گلۆلانی کردووە، ئەو دەستنووسانە پاکنووس بکا. ئەو نوسخەیە کەوتووەتە لای گەوهەر تاج خانمی سەدری قازی کە دوای ڕووخانی حکومەتی شا بۆ ئامادە کردن بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە لە بەردەست ئەحمەدی قازی سەرنووسەری دواتری گۆڤاری سروەی ناوە.

کۆمەڵێك دەستخەتی دیکە لەلای فەڕوخلەقا خانمی مەلیك قاسمی هاوسەری حەمە حسێن خان بووە کە دوای ڕووخانی ڕژێمی شا لەلایەن خوالێخۆشبوو فەتتاحی سەیفی قازییەوە دراوە بە مامی، واتە دوکتۆر ڕەحیمی قازی کە ئەویش ئەوانەی ناردووە بۆ حەسەن، بەشی زۆری ئەو دەستنووسانەی لە بەردەستی ئەم لێتوێژینەوەو ساخکردنەوەیەی ئێستا دان، هەر ئەو کۆمەڵەیەن. بەپێی ئەوان دەردەکەوێ کەسێکی دیکەش لەسەر داخوازی فەتتاح خان بە خەتێکی زۆر خۆش لەبەر دەستنووسی سەیفی نووسیوەتەوە.

بەڵام وەك گوتم، کاك حەسەن درەنگتر نوسخەیەکی شێعرەکانی سەیفی بۆ ناردم کە بە دەستخەتی خۆی نووسراوەتەوە. سەبارەت بەو نوسخەیەش بۆی نووسیم:

((سەبارەت بە دەستخەتی خۆم و دەفتەرە شڕە: من ئەو شێعرانەم هەر لە ڕووی ئەو دەستخەتانەوە نووسیوەتەوە کە لەلای فەڕوخلەقا خانمی مەلیك قاسمی (حاجی شازدە خانم) خێزانی حەمە حسێن خان پارێزرابوون [دوایە لەلایەن فەتاح خانی کوڕییەوە دراون بە ڕەحیمی سەیفی قازی] و ئەویش هەر وەك لە سەرەوەدا گوتم بۆ منی ناردووە. دیارە هێندێکیان بە فۆتۆکۆپیکراوی.

ئەمن چاکم وەبیر دێ لە دێی "سەراو" شازدە خانم (کە ئەو دەمی هێشتا نەچووبووە حەجێ دەستنووسەکانی لەبەر دەست نام و دیارە ئەو دەمی لە نووسین و خوێندنەوەی کوردی زۆر کول بووم و ئەو نووسینەوەیە دەبێ لە ساڵی ١٣٤٧ یان ١٣٤٨ی هەتاویدا کرابێ.[= ١٩٦٨/٩] )).

## مێژووی شێعرە چاپکراوەکانی سەیف

ئەوەی تا ئێستا سەبارەت بە یەکەم شێعری کوردی چاپکراوی سەیفولقوزات زانرابێت ئەو بۆچوونەیە وا لەلایەن مامۆستا سەید عوبەیدیلا ئەییووبیانەوە ڕاگەیێنراوەو مامۆستا مەلا ساڵح ئیبراهیمیش پشت ڕاستی کردۆتەوە.

هەردوو بۆچوونەکە لە بەشی کۆتایی "دیوانی سیف القضات" چاپی مامۆستا ئەحمەدی قازیدا هاتوون. بە گوێرەی ڕاگەیاندنی ئەو دوو کەسە، سەیف لە سەردەمی ڕاپەڕینی سمایل ئاغای سمکۆدا چەند شێعرێکی لە پەسنی ئەودا گوتووەو لەلایەن محەمەد جەمالەددینی هەکاری (قازی و باوەڕپێکراوی سمکۆ)وە نێردراوە بۆ ڕۆژنامەی کورد چاپی ورمێ و لەوێدا بلاو کراوەتەوە:

((سمکۆی، خودا کە داوە بە مە، ساحیب و ڕەئیس
شوکری بکەین بە زارو زبان و ددان و لێو
مەقسودی وی ئەمە، کەهەقی مە، بداتە مە
تەکلیفی مەش وەهایە، فیدای بین بە نێر و مێو))

ئاشکرایە نوسخەی ڕۆژنامەی "کورد" یا "ڕۆژی کورد" یاخۆ "ڕۆژی کوردو شەوی عەجەم" تائێستا نەکەوتۆتە بەردەست و تەنیا بە حیسابی ڕاگەیاندنی نووسەرێکی ئازەربایجانی (تەمەدون) دەزانین ئەو ڕۆژنامەیە دەرچووەو ئەییووبیان و ئیبراهیمی لەو سەرچاوەیەی سەرەوەدا ڕایاننەگەیاندووە ئەو زانیارییانەیان لە کوێ خستۆتە دەست. بەڵام ئیبراهیمی لە هەمان شوێندا گوتوویەتی کە ئەو "مەبەستە" لە ژمارە ٩ (١٩٨١ن)ی گۆڤاری گرشەی کوردستان [چاپی تاران]دا باسی لێوە کراوە، کە بەداخەوە گۆڤارە کە لەبەر دەستی مندا نییە.

لەمەڕ ڕێکەوتی دەرچوونی ڕۆژنامەکەش بۆچوونی جیاواز هەیەو بە ساڵی ١٩١٩ یا ١٩٢٠ دەزانرێت. بەڵام لەسەر وێنەی ڕووپەڕی یەکەمی ئەو ژمارەیەی وا تەمەدون لە کتێبی "تاریخ رضائیه"دا چاپی کردووە، ١٢ شوالی ١٣٤٠ نووسراوە کە دەکاتە مانگی جوونی ١٩٢٢ (؟).

٢- دووهەم چاپی شێعرە کوردییەکان، ئەو شێعرەیە وا لە نامیلکەی "دیاری کۆمەڵەی ژێکاف بۆ لاوەکانی کورد"دا بڵاوبۆتەوە. "دیاری ..." لەڕاستیدا پاشکۆی گۆڤاری نیشتمان- ئۆرگانی کۆمەڵەی ژێکافە، کە بە نهێنی لە چاپخانەیەکی شاری تەورێز چاپ دەبوو و دەهاتەوە مەهاباد. هەڵسووڕێنەری کاری چاپو هێنانەوەی گۆڤارەکەش نەمر عەبدولڕەحمانی زەبیحی بوو. شێعری چاپکراوی "دیاری ..." ئەو شێعرە ناسراوەی سەیفە:

((کوردینە! تاکەی ئێمە لە کێوان میسالی دێو
بێین و بچین و بۆ مە نەبێ هیچ خودان و خێو!))
ڕێکەوتی چاپی شێعرەکەش ١٣٢٢ [١٩٤٣] یە.

٣- بە ماوەیەکی کەم دوای بڵاوبوونەوەی "دیاری..." و بە شوێن هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەو سەرهەڵدانی حیزبی دیموکراتی کوردستان (١٣٢٤)، ڕۆژنامەی کوردستان- ئۆرگانی حیزب، لە دوو ژمارەی جیاوازدا (٨ و ٢٦) دوو بابەتی لەسەر سەیف و شێعرو ژیانی بڵاوکردەوە. (ساڵی١٣٢٤ -١٩٤٦).

بەڵام لەگەڵ هەرەس هێنانی کۆماری کوردستان، ئیتر دەرفەتی چاپی شێعرەکانی سەیف پەیدا نەبوو، گەرچی وا هەیە لە چاپەمەنییەکانی باشووری وڵاتدا - بۆ نموونە، گەلاوێژ، شێعر یا ژیننامەی سەیف چاپ کرابێت، بەڵام ئەگەر هەبێتیش بەداخەوە من هەواڵم لێیان نییە.

٤- کاک حەسەنی قازی، بەپێی ئەو نامەیەی وا لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٧دا بۆ منی نووسیوە، لە ساڵی ١٩٧٣ یا ١٩٧٤دا لە لەندەن کۆمەڵەیەك لە شێعرەکانی سەیفی بە داکدیلۆ (تایپ ڕایتر) بڵاوکردۆتەوە کە بە حیسابی یەك لە شێعرەکانی سەیف، ناوی نابوو: "سەر سەوزە باغی ئارەزوو نیزیکە بێتە بەر" نامیلکەکە بە ژمارەیەکی کەم بڵاوکراوەتەوەو ئەگەری ئەوە هەیە کە هیچ نوسخەیەکی لەبەر دەستدا نەمابێت.

٥- بەرچاوترین کار کە تا ئێستا لە بواری چاپی شێعرەکانی سەیفدا کرابێت چاپی "دیوانی سەیفولقوزات"ە لەلایەن قازی ئەحمەد [مامۆستا ئەحمەدی قازی]یەوە. ئەو کتێبە، لە ساڵی ١٣٦١ی هەتاوی ١٩٨٢ز لە تاران بڵاوبۆتەوەو نزیك

به هەموو شێعرە کوردییەکانی سەیفی گرتۆتە خۆ. لە بەشی سەرەتای ئەم کتێبەی بەردەستدا باسی تایبەتمەندییەکانی چاپی کاك ئەحمەد کراوەو لێرەدا هەر ئەوەندە بەسە بڵێم دوو سەرەتای کورتی لەمەڕ ژیانی سەیف بۆ نووسراوە کە یەکەمیان لەلایەن نەمر مامۆستا هەژاری موکریانیو دووهەمیان لەلایەن کاك ئەحمەد خۆیەوە نووسراوە. لە کۆتایی کتێبەکەشدا بۆچوونی مامۆستایان سەید عوبەیدیلا ئەییووبیانو دوکتور محەمەد ساڵحی ئیبراهیمی لەمەڕ چاپی شێعرەکانی سەیف لە سەردەمی حوکمی سمکۆ لە ورمێ ڕاگەیێنراوە کە من پێشتر باسم لێوە کردو لە بەشی "بابەتی نووسراو سەبارەت بە سەیف"یشدا، دەقی هەردوو بۆچوونەکەم هێناوە.

سەبارەت بە چاپی شێعرە فارسییەکانی سەیف دەبێ بڵێم بە گوێرەی ئەو زانیارییانەی کە تا ئێستا لەبەر دەستدان، یەکەم جارێك کە یەك لە شێعرەکانی سەیف بە فارسی چاپ کرابێت، هەر ئەو شێعرەیەتی کە لە پەسنی بزووتنەوەی خیابانیدا گوتوویەو لە دوایین ژمارەی گۆڤاری "ئازادیستان" چاپی تەورێزدا بڵاو بۆتەوە (بڕوانە پێشتر).

چالاکی زۆری سیاسیو فەرهەنگی سەیفو هاتوچۆی بەردەوامی شارەکانی تەورێزو ورمێو تەنانەت تاران، ناوبە دەرەوەییو پەیوەندی بەربڵاوی سەیف لەگەڵ ڕووناکبیرو ئەدیبانی هەر ئەو شارانە، کە لە هەندێ نامەی شێعریی سەیفو وەڵامنامەی شێعریی خەڵکانی تر- وەك محەممەد هاشم میرزای ئەفسەر، دا دەردەکەوێت، دەمانگەیێنێتە سەر ئەو باوەڕەی کە شێعری سەیف لە گەلێك چاپەمەنی دەورەیی ئەو سەردەمەی شارەکانی ئێران بە تایبەت تەورێزو ورمێدا بڵاوبووبێتەوە. شوێن کەوتنو دۆزینەوەی ئەو بەڵگەنامانە کاری نەوەکانی دادێی گەلەکەمانەو لە دەسەڵاتی ئێمە لە دەرەوەی وڵات بەدەرە.

هەر چۆنێك بێت، ڕابردوو ڕابووردوەو گرنگ ئەوەیە ئیجازە نەدرێت هەر ئەو شێعرە فارسییانەی سەیف کە تا ئێستا پارێزراونو گەیشتوونەتە دەست نەوەی ئێمە، بفەوتێن. هیوادارین دوابەدوای چاپو بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە، مەجالی ئەوەمان هەبێت شێعرە فارسییەکانیش ڕێك بخەینو بڵاویان بکەینەوە. گەرچی تا ئێستا بەشێك لەکاری ئەو ڕێکخستنانەمان بەڕێوە بردووە، بەو هیوایەی کە خەڵکانی تریش شوێنی مەسەلەکە بگرن.

سەبارەت بە شێعرەکان پێویستە دیاردە بەم خاڵانە بکەم:

١) وەك لە پێرستەکەدا دەبینرێت، ئەم کتێبە سەرجەم ٢٩ پارچە شێعری سەیفی گرتۆتە بەر، لەوانە:

٩یان قەسیدە، ١٣یان غەزەل، ٥یان مەسنەوی (المزدوج)، یەکیان قەتعەو یەکیان چوارینەن. چوارینەکە، وەڵامی چوارینەی کەسێکەو لە شوێنی خۆیدا دەست نیشان کراوە. قەتعەکەش وێ دەچێ غەزەلێکی ناتەواو بێت.

لەناو شێعرەکانی دیکەدا، ئەم دوو پارچە شێعرەی خوارەوە وێدەچێت یەك بن بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە لەناو دەستنووسەکاندا بە جیاجیا تۆمار کراون، منیش وە ك دوو پارچە شێعری جیاواز بە شوێن یەکتردا هێناومن:

یەکەمیان: زۆر توولی کێشا عەزیزا هیجرانت (پارچە شێعری ژمارە ٩)، و

دووهەمیان: ئەگەر دەپرسی باسی ئەو ناوە (پارچە شێعری ژمارە ١٠). کە ئەگەر ئەو دوو شێعرە بە یەك دابنێین، ئەوا سەرجەمی شێعرە کوردییەکانی سەیف لەم کتێبەدا دەبێتە ٢٨.

هەروەها پارچە شێعرێك هەیە کە لە دیوانی چاپکراوی سەیفدا بە دوو پارچە دانراوەو لە دوو شوێنی جیاوازدا چاپ کراوە (چاپی قازی ئەحمەد) بەڵام لە دەستنووسەکاندا پێکەوە هاتوون:

یەکەم: کەسێ بەختی سەعیدی بێ، دەبێ حازر لە دیوانت (ل٦٤)، و

دووهەم: لە مەیدانی سەعادەت بوو، نەسیبی من سەعادەت بوو (ل٤٥).

من ئەو دوو پارچە شێعرەم بە حیسابی ٢ نوسخەی بەردەستم کە پێکەوەیان هێناون، کردۆتە یەك، بەڵام ئەگەر وەك کاك ئەحمەد بە دوو شێعری سەربەخۆیان حیساب بکەم، سەرجەمی شێعرەکان لێرەدا دەبنە ٢٩.

٢) تەرتیبی فەردەکان لە دیوانی چاپکراوی مامۆستا ئەحمەدی قازیو تەنانەت هەندێ جار لە نوسخەی جیاوازی دەستنووسەکانیشدا وەك یەك نین. من بۆ ئەوەی تەرتیبەکە زیاتر تێك نەچێت، دەستم لێ نەداونو وەك خۆیانم نووسیونەتەوە، بەڵام ئەگەر دەقی نوسخەکە لەچاو دەقەکانی تر- چ دەستنووسو چ چاپکراو، ناتەواوییان هەبوو بێت، هەوڵم داوە تەواوی بکەمو لە پەراوێزدا ڕایبگەیێنم کام زیاد کراوم لە کوێ وەرگرتووە.

٣) دەستنووسەکانی بەردەستی من یەکدەستو هاوچەشن نین، واتە دەستو خەتی چەند کەسن، کە یەکێکیان سەیف خۆیەتی. یەك لە نوسخە هەڵگرەکان نزیکەی ٢٤ ساڵ دوای نووسرانەوەی شێعرەکان لەلایەن سەیفەوە، نوسخەی لەبەر هەڵگرتوون، شێوە خەتەکەی جیاوازەو بەباشی لە خەتی سەیف دەناسرێتەوە. بەبۆچوونی من، شێعرە کوردییەکان لای کەم بە سێ دەستخەتی جیاواز نووسراونەتەوە.

٤) وەك گوترا، سەرجەمی شێعرەکانی ناو دەستنووسەکان بە چوارینەکەوە ٢٩ پارچەن. کاك ئەحمەدی قازی سەرجەم ٢٤ پارچە شێعری لە دیوانە چاپکراوەکەدا بڵاوکردۆتەوە.

زۆربەی زۆری شێعرەکان لە هەردوو سەرچاوەدا هەر یەکن، بەڵام ٦ پارچەی نێو دەستنووسەکان لە چاپی کاك ئەحمەدا نییەو ٤ پارچەی ناو دیوانی چاپییش لە دەستنووسەکاندا نابینرێن، مەسەلەی بەیەك دانانی دوو پارچەش لە هەردوولادا دەبینرێت.

ئەو شێعرانەی وا لە دەستنووسەکاندا هەن و لە دیوانی چاپکراوی کاك ئەحمەد دا نین، بریتین لە:

١- تاسەری زولفت ڕفاندی دڵ لە بۆ نێو ئاوری ڕووت

٢- ئەی گوڵی گوڵزاری دین، ئەی نەوجەوانانی وەتەن

٣- عەزیزم ناردبووی بۆم سەرکڵاوە

٤- زیارەتم کرد کاغەزی کوردی

٥- عەزیز! بەینێکە لێم بێ خەبەری

٦- ڕووناکی چاوم ئەحمەدی سەیفی

چوار شێعری ناو دیوانی چاپکراوی کاك ئەحمەدیش کە لەنێو دەستنووسەکاندا نابینرێن، ئەمانەن:

١- عەنبەری زولفت بەدەم سەباوە

٢- دڵ لە بۆ ئاوی بەقای تۆ کەوتە نێو زوڵماتەوە

٣- خەیاڵی هیجری "ئێلخانی" کە دەکرێ

٤- دایم دڵم بە ناڵەو زاری و فیغان دەڵێ

## فۆرمی شێعرە کان

فۆرمی شێعرە کوردییەکانی سەیف عەرووزی کلاسیکە.

## زمانی شێعرەکان

دەستە وشە (ڤۆکابیولێری) بەکار هاتوو لە شێعرە کوردییەکانی سەیفدا، کوردی موکریيانییەو مۆرکی زاراوەی ناوچەی مەحاڵی چۆمی مەجید خان، کە ئاوێتەیە کە لە زاراوەی هەردوو ناوچەی مەهاباد وبۆکانی پێوە ئاشکرایە.

وشەی شێعرە کوردییەکان خۆماڵین واتە شاعیر شارەزایییەکی بەرچاوی لە زمانی کوردی هەبوە وگەلێك وشەی ڕەسەنی کوردی لە شێعرەکانیدا دەبینرێن و بەپێچەوانەی زۆر شاعیری کلاسیکی وەك نالی و وەفایی و تەنانەت شاعیرانی هاوچەرخی خۆی وەك میسباح الدیوانی ئەدەب، کەڵکێکی زۆر کەم لە وشەی عەرەبی و فارسی وەردەگرێت هۆکاری ئەم دیاردەیەش دەبێ لە چوارچێوەی تایبەتمەندییەکانی شێعری سەردەمی مەشرووتەی ئێراندا بدۆزرێتەوە کە زمانەکەی زمانێکی کەمتر "کتێبی"و زیاتر "شەعبی"یەو ڕووی قسەی لە کۆمەڵانی بەرینی خەڵکە نەك "ئێلیت"و هەڵبژاردەو چینی سەرەوەی کۆمەڵگا، کە شانازی بە زمانی بێگانەوە دەکەن و خۆ بە بێگانەوە هەڵدەواسن. هەر بۆیەش شێعری سەیف ڕەوان و بێ گرێ و گۆڵ و نزیکە دڵن.

بنەماڵەی قازی بێگومان نیشتەجێ و خەڵکی سابلاغ بوون، واتە لە هەر کوێیەکەوە هاتوون، لەوێ گیرساونەتەوەو لە پەیوەندی ڕاستەوخۆی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو شارەدا بوون. ئاشکرایە هەندێك لە ئەندامانی بنەماڵەکە لە بڕگەیەکی زەمەنی سەردەمی سەیف و پێش سەیفدا، موڵك وماڵیان لەسەر چۆمی جەغەتووی نێوان میاندواو و بۆکان و ناوچەی فەیزوڵلا بەگی و ساینقەڵا کڕیوەو لەوێ ژیاون. سەیفیش دەبێ لە سابلاغەوە چووبێتە گوێگجەلی و گوندی دیکەی هەر لەو ناوچەیە کڕیبێت، کە سەنەدی کڕینی دوو دانگی گوندی پیرۆلی باغی و عەبدوڵلابادیش ئێستا لەبەر دەستدایە و ڕێکەوتەکەی کۆتایی مانگی زیحەججەی ١٣٥٤ [= ١٩٣٦/٣/٢٢ز]یە (بڕوانە: بەشی بەڵگەنامەکان). هەروەها لە ئیجازەنامەی قازیەتیی سەیف، ئەو نیشتەجێبوونە دەردەکەوێت (بۆ ئەوەش بڕوانە: بەشی بەڵگەنامەکان).

گوێستنەوەی شوێنی ژیان لە مەهابادەوە بۆ ناوچەی سەرچۆمی جەغەتوو، هەروەها دەرس خوێندن لە گوندی سڵەمانکەندی نێوان سەقزو بۆکان و گوندی "عەمبار"ی نزیك بۆکان، کاریگەریی لەسەر زمانی نووسین و شێعر گوتنی سەیف هەبووە، واتە ئەو بن زاراوەیەی کە قسەی پێکردووە هەر موکریانی بووە بەڵام شەقڵی ناوچەی فەیزوڵڵا بەگیشی لێ دراوە.

لە شێعری سەیفدا شێوازی گشتی ئاخافتنەکان موکریانییە بەڵام گەلێك وشەو تێرمی وای تێدا بەرچاو دەکەوێت کە تایبەت بە شاری مەهابادن و ئەگەر خوێنەری شێعرەکان شارەزای ئەو بن لەهجەیەی زمانی کوردی نەبێت وا هەیە نەتوانێ بەباشی شێعرەکان بخوێنێتەوە، یاخۆ کێشی ئاساییانی لێ تێك بچێت. بۆ نموونە:

((جەرگم بۆ پۆلوو، هەناسەم بزووت....))

کە وشەی "بۆ" دەبێ بە شێوازی مەهاباد بخوێنرێتەوە دەنا ئەگەر بکرێت بە "بووە "ی ئاسایی موکریان، کێشی شێعرەکە تووشی گۆڕان دێت. یا:

((لە میسرێ ببۆ خەدێو...))

یا:

((سەر سەوزە باغی ئارەزوو، نیزیکە بێتە بەر...))

یا:

((بەهاری دەگەڵ زستان لێ شێوا....))

یا:

((لە قوڵەسەنێ ڕا بچێ بۆ کوێستان....))

یا:

((ڕەشماڵە ماڵ، و کەشك و پەنیرە مەتاعی مە))

یا:

((بۆ وانە هەرچی جوانە....))

یا:

((ڕووناکیی چاوم، ئەحمەدی سەیفی!))

یا:

((درۆیان مەکە، کەمان مەدوێنە....))

یا:

((فکریٚ له حاڵی خۆ کەنو بگرین به حاڵی خۆو..))

یا:

((دڵی وێران له هیجران بۆوه مەعموور))

و دەیان نموونەی تری لەو چەشنە.

بەڵام له عەینی کاتو هاوڕێ لەگەڵ شێوازی مەهابادی، هەندێ جار وشەکان بەشێوەی بۆکانو تەنانەت ناوچەی فەیزوڵڵا بەگی بەکار دێنێت، بۆ نموونە:

((تفلی دڵم به ناڵەو زاری و فیغان ئەڵیٚ))

یا:

((بپسێین له ڕێی نەجاتی وەتەن با به نێرو مێو))

یا:

((به ڕووتا خاڵو پەرچەم بوون موشەووەش))

یا:

((له سەرتا بیٚ هەمیشه تاجی پیرۆن))

یا:

((سنگیان دەردەخەن، پارچێك له نووره))

یا:

((ژینم پیٚ خۆشه، دڵم پێیٚ خۆشه<br>که تۆم لیٚ دیار بی لەبانو حەوشه))

تەنانەت سەیف هەندێ جار کەڵکی له وشەی باشووری یا باکووریتری کوردستان وەرگرتووه:

((لاڵ بم نابیەم له چیاو ڕازان...))

لەم پەیوەندییەدا ڕوونکردنەوەیەك پێویسته.

له دەقی جیاوازی شێعرەکاندا هەندێ جار وشەکان بەشێوازی جیاواز نووسراون. بۆ نموونه دەقی دەستنووسی بەردەستی منو دەقی چاپکراوی قازی ئەحمەد، وشەی "سینگ"و "سنگ"یان تێدا دەبینرێتو قازی ئەحمەد "سینگیان دەردەخەن"ی نووسیوه، له کاتێکدا دەقەکەی لای من "سنگیان"ی تۆمار کردووەو

ئەوە خۆی دەبێتە هۆی گێژو گومیو بڕیاری کۆتایی لەسەریان نادرێت مەگەر نموونەی دەستخەتی سەیف بۆ هەموو شێعرەکانمان هەبێت، کە بەداخەوە نیمانە.

سەبارەت بە ڤوکابیولەری بەکار هاتوو لە شێعری سەیفدا، هەر ئەوەندە بەسە بڵێم سەیف ڕچە شکێنی ڕێگای بەکارهێنانی تێرمو وشەی خۆماڵیو ئاسایی ئاپۆرەی خەڵکە و بەش بە حاڵی خۆی، شێعری لە عەرشی خوێندەوارانەوە، کە سوود وەرگرتن لە وشەی بێگانەیان بە شانازییەك دادەنا، هێنایە سەر زەوی خەڵکی ئاسایی کووچەو کۆڵانو ئەوەش دیاردەیەکی قانوونمەند بوو بۆ سەردەمی دوای مەشرووتەی ئێرانو عوسمانی کە لە ئەنجامیدا، ئاپۆرەی خەڵك دوای مێژوویەکی چەندین هەزار ساڵە، لە حیساباتی سیاسیدا دەوریان دەبینیو بە هەند وەردەگیران، ئینجا زمانی ئاخافتنیشیان بوو بە زمانی شێعرو ئەدەب:

((دەردی دڵ دەکەم کورت و کرمانجی))

یا:

((کەرە بۆزیشیان لەسەر وەستایە))

یا:

((بۆق کە دەیقڕاند دەویی کردەوە))

یا:

((قاز لە شەتاوان قاڕەی لیٚ بڕا
دوڕنای چۆماوان زوڕنای لیٚ درا))

ئەوانە نموونەن بۆ ئەو تەعبیرانەی وا سەیف لە زمانی ڕۆژانەی خەڵکانی دەوروبەری وەرگرتوونو دەیان نموونەی دیکەش لە شێعرەکانیدا هەن. تەنیا سەیرێکی پارچە شێعری "عەزیزا ئارەزووت زۆری بۆ هێنام" —وەك نموونەی لێکۆڵینەوە لە مەسەلەی بەکارهێنانی دەستە وشەی کوردیو خۆماڵی، دەیان وشەی وامان بۆ دەردەخات کە لە زمانی خەڵکی ئاسایی وەرگیراونو سەیف— وەك پێشەنگی ئەم کارە، ئیجازەی پێداون بێنە ناو شێعرەوە:

سیخوار، بزووت، چەقچەق، پاپۆکە، سەرمازەڵە، قشقەڵە، ڕەشانگ، گاشین، مانگابۆرە، چەکچەکی، خشخشە، سوورە ساقە، دانوو، فیتە، شەوێن، چێشتان، تەقڵە، چڵکەسانی، دانگە، پرو پاتاڵ، کۆمەکۆمە، کۆز، و.....

سەیف، وەستای بەیەکەوە بەستن و بەکارهێنانی وشەی ڕەسەنی کوردییەو ئێمە بۆ پارێزرانی زۆر وشەی کۆنی کوردی، قەرزداری سەیف و قوتابخانەکەین کە ماموستایانی وەك هەژارو هێمن و ئاوات و هێدی و خاڵەمین و حەقیقی و نووری تێدا پەروەردە کران.

## ڕێکخستنی شێعرەکان

بۆ ڕێکخستنی شێعرەکان- کە وەك گوتم لە دەستنووسەکاندا بێ شیرازەو پچڕ پچڕن، دەبوو یا شێوازی سەیف خۆی ڕەچاو بکرێت کە بە گوێرەی نەریتی باو، لەسەر ئەساسی "بەحر" واتە پیتی کۆتایی شێعرەکان ڕێکی خستوون یاخۆ شێوازێکی ئەمرۆیی تری بۆ بدۆزرێتەوە.

شێوەی کاری سەیف باش نەبوو لەبەرئەوەی شێعری کوردی و فارسی پێکەوە تۆمار کردوون و دیوانی لێ پێك هێناون، بەڵام ژمارەی شێعرە کوردییەکان کەمن و کارێکی ئەوتۆ پێویستی پەیدا نەدەکرد.

لەلایەکی دیکەوە ئیتر ئێمە لە سەردەمی تەزکەرە نووسین چووینەتە دەرێ و مەسەلەی ناوەرۆکمان لە قاڵب و فۆرم پێ گرنگترە. هەر بۆیەش هەوڵمدا کارەکە لەسەر بنەمای ناوەرۆك بەڕێوە بەرم و شێعرەکان بەسەر بابەتی سیاسی، ئایینی، کۆمەڵایەتی و ئەویندارییدا دابەش بکەم کە لە پێرستی شێعرەکاندا بەرچاو دەکەوێت.

## سەیف و عەزیز ئاغای عەبباسی

وەك گوترا، زۆرێك لە شێعرەکانی سەیف ڕوویان لە "عەزیز"ە و تەنانەت هەندێکی دیکەی شێعرەکانیش کە من لە بەشی "شێعری ئەویندارى"م داناون دوور نییە بۆ ئەو گوترابن. قازی ئەحمەد سەبارەت بە پەیوەندی ئەو دوو کەسە دەنووسێت:

«پێوەندیی ئەو دوو پیاوە دەمانخاتەوە یادی مەولانای ڕۆمی و شەمسی تەورێز...» (بڕوانە بەشی دواتری ئەم یادداشتانە). بۆچوونی کاك ئەحمەد لە شوێنی خۆیدایەو ڕادەی بەرزی خۆشەویستی سەیف دەرحەق بە عەزیز ئاغا بە هیچ شێوازێکی تر هەڵناسەنگێنرێت. عەزیز ئاغا خاوەن مڵکی کولتەپەی قورمیش و چەند گوندی دیکە بووە کە لە ناوچەی ژیان و مڵکەکانی سەیفولقوزات دوور نەبوون؛

هەردووکیان موریدی شێخی بورهان بوون و هەموو ساڵێك بۆ ماوەی یەك دوو مانگ لە خانەقا ماونەتەوەو خزمەتی شێخ و خانەقایان کردووە؛ هەردوولایان خوێندەوار بوون و تا کۆتایی ژیان بە جلوبەرگی مەلایەتییەوە ژیاون.

ئەو شێعرانەی وا سەیف بۆ عەزیز ئاغای گوتوون، وا هەیە خۆمانەترین و خالیسانەترین شێعرەکانی بن:

ژینم بە بۆنەی "عەزیز"م خۆشە....

یا:

هەمیشە زیکرو فیکرم یادی تۆیە

یا:

لە شایی تۆیە خۆشم بوومە چاوەش...

یا:

دۆستی و ڕاستی پارچێك بوو، کرا
بە بەژن و باڵای بەرزی تۆ بڕا...

یا:

دەردی بێدەرمان هەر دووری تۆیە...

یا:

مەگەر نازانی ئەمنیش براتم؟
ڕووناکیم هەر تۆی، مایەی حەیاتم!

تەنانەت هەندێ لە شێعرە سیاسییەکانی سەیفیش هەر بۆ عەزیز ئاغا گوتراون و ڕوویان لەوە، واتە عەزیز ئاغا هاندەرو پاڵپێوەنەری سەیف بووە بۆ گوتنی ئەو شێعرانەش. بۆ نموونە، شێعری:

((یادم بۆ ناکەی؟ یادت بەخێر بێ!
وەعدەی زوو هاتن وەختە زۆر دێر بێ...

کە لە درێژەیدا دەگاتە کاروباری کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی گەلی کورد:

ئەگەر دەپرسی وەزعی زەمانە
میللەت پەرێشان، ئامان ئامانە
کاری کوردان هەر خۆزگە بە پارە
هەر کەس بە دەردێك چوو، گرفتارە...

له تام چۆته دەر مەزلوومیی کوردان
خودایا! ڕەحمێ بە چووك و وردیان...
هەر کەس لە خۆیدا سەرداری نەبێ
حاڵی هەر وایە، ئاخری وا دەبێ...))

دۆستایەتی و پەیوەندی نزیکی نێوان سەیف و عەزیز ئاغا بۆ ئەوە نەدەبوو لێرەدا چاوی لێ بپۆشرێت و زانیارییەك لەسەر ژیان و کەسایەتی عەزیز ئاغا بە خوێنەر نەدرێت. دیارە لە دوورە وڵاتی ئەم کارە هاسان نەبوو و نەدەگونجا. بەم بۆنەیەوە تکام لە کاك عەلی غوڵامعەلی کرد- کە نووسەرو چیرۆکنووسە و لە بۆکان دەژی و لەم دواییەدا بۆتە زاوای بنەماڵەی عەبباسی، کە هەندێك زانیاریم لەم بارەیەوە لە ئەندامانی بەڕێزی بنەماڵەکە بۆ گردو کۆ بکات. کاك عەلی ئەم ئەرکەی بەڕێوە بردو وتووێژێکی لەگەڵ ڕێزدار جەعفەری عەبباسی ڕێك خست، کە نەوەی ڕەحمەتی عەزیز ئاغایە و ئێستا لە بۆکان دەژی. ئەوەی لە خوارەوە دێت سەرجەمی ئەو زانیارییانەیە وا کاك عەلی لە زمان جەعفەر ئاغاوە نووسیویەتی و بۆی ناردووم.

"کورتەی ژیننامەی عەزیز ئاغای عەبباسی"

نووسینی: ڕێزدار جەعفەری عەبباسی:

ناو: عەزیز عەبباسی، ناسراو بە عەزیز ئاغا،

شوێنی لەدایکبوون: وا هەیە گوندی عەمبار یا قورمیش بێت لە مەحاڵی ئەختاچی بۆکان. منداڵی و مێر منداڵی لەو دوو گوندە تێپەڕ کردووە. زاوای ماڵی عەلی ئاغاو مەحمود ئاغاو حاجی بایز ئاغا واتە بنەماڵەی ئاغاکانی دێبوکری بووە.

بە گوێرەی ناسنامە، لە ساڵی ١٢٦٠ [= ١٨٨١] لە دایك بووەو لە مانگی ئابانی ساڵی ١٣٣٢ی هەتاوی بە وەستانی دڵ لە گوندی کولتەپەی قورمیش لە دەورووبەری بۆکان کۆچی دوایی کردووە [= مانگی ئوکتۆبر یا نوامبری ١٩٥٣].

مرۆڤێکی ئەدیب و خوێندەوار بووە و کتێبخانەیەکی گەورەی هەبووە. زەوقی زۆری بۆ خوێندنی قورئان هەبووەو عارف و لایەنگرو موریدی شێخی بورهان وسەر بە تەریقەتی نەقشی بووە بۆ ماوەیەکی زۆر پارێزگارو "متولی" خانەقاکەش بووەو هەموو ساڵێك ٣ تا ٤ مانگی ژیانی لە خانەقا ماوەتەوە.

چوار کوڕی هەبوون: عوسمان (کە لە تەمەنی ١٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە)، ئەحمەد، عومەرو ئەبووبەکر. لەوانە، ئەبووبەکر ئاغا ئێستا لە بۆکان دەژیو ئەوانی تر لە ژیاندا نەماون.

[سەیف لە شێعرەکانیدا ناوی کوڕانی عەزیز ئاغای چەند جار هێناوە:

((عومەرو عوسمان، بوو بەکری نازدار

بەناز گەورە بن، هانامە چواریار...

عومەر، ئەبوو بەکر یاری غاری بێ

عوسمانیش عەلی ئاگاداری بێ

بوو بەکریش یا خوا هەر چوار یاری بن

خوداو پێغەمبەر ئاگاداری بن...

شوکور کوڕەکان ئێستا چوارن

لە پەنای خوداو حیفزی چوار یارن

عومەرو عوسمان، بوو بەکرو "ڕەحیم"

بیانبەخشێ پێمان ڕەحمانی کەریم))

کە لەو شێعرەی دواییدا، سەیف "ڕەحیم"ی کوڕی خۆیشی لەگەڵ سێ کوڕی عەزیز ئاغا دەخاتو دەپاڕێتەوە خودا کوڕەکان بە هەردوو لایان ببەخشێت.

عومەر و یەکێکی دیکە لە کوڕانی عەزیز ئاغا لە کۆماری کوردستاندا، پایەی سوپاییان بووەو خزمەتی کۆماریان کردووە (عومەر ئاغا دەرەجەی کاپیتانی هەبووە کە بەرانبەر بووە بە سەر گوردی سوپای ئێران). لە گەڕانەوەی سوپای ئێران بۆ ناوچەکەو هەرەس هێنانی کۆماردا، کاتێ سەرلەشکر هومایوونی وەربووە وڵاتو گرتنی خەڵك دەستی پێکرد، کوڕانی عەزیز ئاغا بەهۆی پشتگیری کردنی عەلیاغای عەلیارەوە - کە خاڵیان بوو، لێبوردنیان درایە.

عومەر ئاغا میرزایەکی خۆش قەڵەمو خۆشنووسو کاتبی باوکی بوو، گەلێك لە نامەکانی باوکیو ئاغاوەتی دیکە ئەو دەینووسین، نموونەی خەتی ئێستاش ماون. لە سەردەمی کۆماردا، عومەر ئاغا هاوڕێ لەگەڵ ڕەحمەتی "ئەحمەدی ئیلاهی"و بە حوکمی ڕێبەرانی کۆماری کوردستان هێرشیان کردووتەسەر "حیسامی دا شکستان" کە خاوەن موڵکی گەورەی ناوچەکە [و دژ کاری حکوومەتی نەتەوایەتی

ئازەربایجان و کوردستان بوو] و ماڵیان تاڵان کردووە. حیسام چەند ڕۆژێك لە گوندی "بی بی کەند" بەر بەرەکانی کردوون بەڵام لە ئەنجامدا خۆی بە دەستەوە داوە.

گەرچی ئەو ماڵەی لە حیسام وەرگیراوە، حکوومەتی کوردی [و وا هەیە ئازەربایجان]دەستیان بەسەردا گرتووە، بەڵام دوابەدوای هەرەسی کۆمار، بنەماڵەی عەبباسییەکان لەلایەن حکوومەتی ئێرانەوە مەجبوور کراون بیدەنەوەو بڕی ۱۲۰ هەزار تمەنیان لیٚ ئەستێنراوە — کە بۆ ئەودەم بڕێکی گەلێك زۆر بووە.

عەزیز ئاغا خاوەنی ئەم گوندانە بووە، کە هەموویان کەوتوونەتە مەحاڵی ئەختاچی بۆکان و نێوان چۆمی جەغەتوو و تەتەهوو: کولتەپەی قورمیش، ئەربەنووس، کانی شوقاقان، ئەشکەوتان،و جەمۆغە.

عەزیز ئاغا جارێك لە شەڕی نێوان دێبوکری و بەگزادەدا بریندار دەبێت: شەڕەکە بە هەڵخلاندنی یەك لە ئاغاوەتی دێبوکری ناوچەی بۆکان لە دەورووبەری کولتەپەی قورمیش ڕوودەدات و عەزیز ئاغا ڕانی بریندار دەبێت. دوای ئەو ڕووداوە، گوندی کولتەپە بە ملکی دەکرێت. دیوەخانێکی گەورەو پڕ میوانی هەبووە، لەگەڵ ڕەعییەتی ملکەکانی باش جووڵاوەتەوە:

لەباری کەسایەتییەوە گەلێك مەندو لەسەرخۆ بووە، دۆستایەتی زۆری لەگەڵ سەیفولقوزاتدا هەبووەو سەردانی یەکتریان کردووە، یا پێکەوە چوون بۆ خانەقای بورهان. هەروەها دۆستایەتی نزیکی لەگەڵ پێشەوا قازی محەمەددا هەبووە."

لەسەر بنەمای ئەو زانیارییانەی وا کاك جەعفەر بۆی ناردووم من شەجەرەنامەیەکی بچووك بۆ بنەماڵەی عەزیز ئاغا پێك دەهێنم.

**عەزیز ئاغای عەبباسی**

عوسمان (۱۳ ساڵان بووە کۆچی دوایی کردووە)

عومەر

ئەحمەد (مندالّی نەبووە)

ئەبووبەکر

**کوڕانی عومەر ئاغا**

جەعفەر

عەلی

ئیبراهیم

حەسەن

قەرەنی

**کوڕانی ئەبووبەکر ئاغا**

عەبباس

عەبدوڵڵا

مستەفا

لوقمان

محەمەد

سەبارەت بە پەیوەندی سەیفو عەزیز ئاغا، خاڵێك سەرنجی منی ڕاکێشا: حەمەد ئاغای سەرا (عەبباسی) ئامۆزای عەزیز ئاغا بوو، بەڵام لە هیچ شوێنێکی شێعرەکانی سەیفدا ناوی نەهاتووەو ئەوەش لە کاتێکدایە کە ناوی گەلێك لە ئەندامانی بنەماڵەی عەزیز ئاغا لە شێعرەکاندا دەبینرێت.

بەبۆچوونی من سەیف ئەم کارەی لە بەر چرای بیروباوەڕی نەتەوایەتی خۆی کردووە. حەمەد ئاغا ساڵێك دوای مردنی سەیفو دامەزرانی کۆماری کوردستان، دژایەتی کۆماری کردو هێزی پێشمەرگەی کورد ماڵو مڵکی گوندی "سەرا"یان لێ زەوت کردو کردیانە بنکەی پێشمەرگە. دەبێ لە سەردەمی ژیانی سەیفیشدا حەمەد ئاغا خاوەنی هەمان هەڵوێست بوو بێت، کە ئاشکرایە جێگەی پەسندی سەیف نەبووەو لە ئەنجامدا ئەویش ڕووی خێری تێ نەکردووە.

(١)

١. بۆ تۆیە، هەر بە تۆیە دەتوانم بکەم سەنا
ڕۆژو شەوی تۆ دێن و دەبێ مەغریب و عیشا
٢. گەورەو گران و بێکەس و بێ جێ و بێ مەکان
بۆ بێکەسان کەس و بۆ بێ جێیەکان، پەنا
٣. تەنهاو بەرقەراری، هەر بووی و هەر دەبی
بێ ئازو بێ نیازی، بێ باب و بێ برا
٤. بێ وێنە سانعێکی بە ئەمرێ دروس دەکەی
ئینسان لە ئاو و گوڵ لە گەڵاو و لە گڵ، گیا
٥. هەرچی پەڕی گوڵانە، لە بۆ زیکری تۆ، زمان
هەرچی گەڵای بەدارەوە، دەستن لە بۆ دۆعا
٦. هەر شوکری تۆیە دەیکەن و هەر ڕزقی تۆ دەخۆن
حەیوان لە بەحرو بەڕیە، فریشتان لە سەر سەما
٧. هەر چاویان لە تۆیە، هەر ئوممێدیان بەتۆ
هەرچی غەنی و فەقیرە لە هەرلا، گەدا و شا
٨. ڕەززاق و نازری لە هەموو جێگە حازری
خاڵی لە تۆ، لە عەرزو سەما جێگەیێ نەما
٩. بۆ دۆست و دوژمنە کەرەمت، بێ کەم و زیاد
بێ میننەت و تەشەخخوسە، بێ قیمەت و بەها
١٠. موحتاجی ڕەحمی تۆیە، نەبی بێ ئەگەر، وەلی
حەیرانی وەسفی تۆیە ئەگەر شێخ، ئەگەر مەلا
١١. ماسی لە شەوقی تۆیە لە بەحرا دەکەن شەنا
تەیران لە عیشقی تۆ لە سەمادا دەکەن سەما
١٢. لوتفت لە بۆمە بێ، چ شەفائێکە دائیمی!
دوور بێ لە ئێمە قەهرت، دەردێکە بێدەوا!
١٣. تۆ زیاتری لە هەرچی خەیاڵاتی لێ دەکەم
نە وەك کەسی، نە کەس وەکوو تۆیە، قسەش بڕا!

١٤. تەعریفی تۆ لە تاقەتی فیکری مە، چۆتە دەر
"لا احصی" سەییدی مەیە، فەرموویە بەرمەلا
١٥. هەر کەس بڵیند بکەی، بە کەسێ ناکرێ نەوی
هەر کەس فڕێ بدەی، لە هەموو جێگە دەرکرا
١٦. زەڕڕێك نووری تۆیە کە دونیا پڕە لە نوور
ڕووناکی ڕۆژو مانگی شەو و شوعلەیی سەما
١٧. هەڵکەی ئەتۆ چرایەکی قەت ناکوژێتەوە
ڕیشی دەسووتێ هەر کەسی فووکا لە ئەو چرا
١٨. ڕەدد و قەبووڵی تۆیە یەکێ نەحس، یەك سەعید
ئادەم گەڕاوە هاتەوە، شەیتان وەدەرنرا
١٩. باکم چییە گوناحم ئەگەر زۆرە یا کەمە
چونکە هەمیشە پیشەیی تۆ بووردنە و عەتا
٢٠. زۆرم هومێدە ڕۆژی قیامەت بە عەفوی تۆ
مەعلوومە هەر لە تۆیە عەتا، لێمەیە خەتا
٢١. بەخسووس شەفیعی ئێمەیە ئەو خۆشەویستەکەت
شابازی ئەو فەڕڕو شای شارەکەی سەفا
٢٢. هەردەم سەلاتی زۆرو سلاوێکی بێ ژومار
دیاری بۆ ڕۆحی پاکی تۆ، ئەی فەخری ئەنبیا!
٢٣. مەقسوود لە خەڵقی عالەمی، هەر زاتی پاکی تۆ
خەڵقی هەموو توفەیلی و هەر تۆی کە بانگ کرا
٢٤. چوونە حزوور و هاتنەوەت، لەحزەیێکی گرت
لەو جێگەدا مەلەك بە گەلێك کەوتنە دوا
٢٥. هات، چوو و بیستی و کوتی و زوو گەڕایەوە
ئاڵقەی دەر هەر دەلەرزی، چرای ماڵێ هەر گڕا
٢٦. پاشخوان خۆرن لە خوانی سەفات هەرچی ئەنبیا
ورتکەچنی دەری کەرەمت جوملە ئەولیا
٢٧. تۆ پادشای و ئێمە گەدایانی دەرکی تۆ

غەیری گوزەشت و بەخش، چ دەکرێ لەگەڵ گەدا؟

٢٨. عەبدم لە بۆ سەحابە- کە یار ورەفیقی تۆن

قوربانی ئال و بەیت [و] ئیمامانی ڕێنوما

٢٩. بۆ من- کە چوار یاری نەبی یار و یاوەرن

بۆ دۆزەخم چ غەم؟ بە بەهەشتم چ ئیعتینا؟

٣٠. ئەودەم کە هەر کەسێ بە کەسێکی دەبێ نەجات،

ئێمەین و دەست بە دامەنی ئەو پێنج تەنی عەبا

٣١. کوردین و بێکەسین، لە هەر لایێ دەرکراو

دەستێ وە دەس مەدە، کە لە ڕێت ئێمە لانەدا

٣٢. دونیا، کە سیجنی موئمینە، فەرمووت و دات خەبەر

هەر بۆ مەیە، لەگەڵ مەیە، هەر لێمە ڕوو دەدا

٣٣. یەعنی نە ملك و ماشە لە بۆمە، نە حاڵو ماڵ

نە جاهـ و نە جەلال و بێ ماڵو بێ سەلا

٣٤. لێمە نەشاو نەمیرو نە سەردارو نە وەزیر،

نە حاکمو نە نایبو سەرتیپو نە سپا

٣٥. هەر یەك غوڵام و نۆکەری بێگانەمیللەتێك

زیزو کزو کەسیفو کەنەفتینو بێ نوا

٣٦. نیمانە مەرکەزێکی کەوا پاڵی پێوە دەین

نە مەزنو گەورەییێکی کە پێیان بەرین پەنا

٣٧. پاڵەستۆدان و جواب و فڕێدان لە پللەکان

دەس پێوەنان و پشتە ملە، زللە، گێت! نەیا!

٣٨. نە مەدرەسە، نە دەرس، نە عیلمو نە سەنعەتێك

زوڵمە لەگەڵ مە، هێندە بە چاوێك نەکەن نیگا

٣٩. ئاخر بەزاتی تۆیە هومێدی نەجاتی مە،

ڕازی مەبە لە ئوممەتەکەت میللەتێك فەنا

٤٠. ئەوڕۆ "حەسەن" موئەززینە، کوردانە بانگ دەکا

هەستن لە خەو، وەخڕ بنو "حی علی الصلاه"

٤١. نوێژ چاتره له نووستن، "حی علی الفلاح"
سه‌جده‌و ڕکووع لایقه هه‌ر به‌رنه به‌ر خودا.

بتاريخ شهر ربيع الثانى در شهر ارومى در وقعه اسمعيل اقاى شكاك كه خوددارى نكرده بطرف رواندوز [گريخت] چون جمعيتش از سرش داغان شدند، تحرير شد. ١٣٤٥ [= ئوكتۆبرى ١٩٢٦]

## په‌راوێزی پارچه شێعری ژماره ١:

١. ڕۆژو شه‌وی تۆ دێنی، ده‌به‌ی مه‌غریب‌و عیشا
٣. بێ هه‌مسه‌رو ڕه‌فیق، بێ باب‌و بێ برا
٥. هه‌رچی په‌ڕی گوڵانه
١٣. نی وه‌ك كه‌سێ
١٤. ته‌عریفی تۆ له تاقه‌تی فیكری مه، خاریجه
١٥. هه‌ر كه‌س بڵێندی كه‌ی
١٦. مانگی شه‌و
١٧. ڕیشی ده‌سووتێ هه‌ر كه‌س فووكا له ئه‌و چرا
١٩. چونكه هه‌میشه خۆشه له‌لات بوردن‌و عه‌تا
٢٤. له‌و جێگه‌دا مه‌له‌ك به گه‌لێك كه‌وتنه دوا
٢٦. ورتكه‌چنی كه‌ره‌مت جوملە ئه‌ولیا
٣٠. ئێمه‌ین و ده‌ست به‌دامه‌نی ئه‌و/ پێنجی بن عه‌با
٣١. كوردم و بێكه‌سین
٣٣. نه‌جاه و بێ جه‌لال‌و
٣٤. سه‌رتیپ، نه‌سپا
٣٥. بێ نه‌وا
٣٨. زوڵمه له‌گه‌ڵ مه، هه‌ر كه به چاوێك
٣٩. له ئۆممه‌تی تۆ
٤٠. ئه‌وڕۆ حه‌سه‌ن موئه‌ززینی كوردانه، بانگ ده‌كا

هەستن لەخەو، وەخڕبن، "حی علی الصلا"

لە نوسخەی دەستخەتی حەسەنی قازیدا هەمان ژمارە فەردو هەمان ڕوونکردنەوەی کۆتایی شێعرەکە دەبینرێتو هەمان ڕێکەوتیش. بەڵام قازی ئەحمەد هەمان چەمکی بە کوردی خستۆتە پەراوێزەوە لە جیاتی مەسەلەی هەڵاتنی سمکۆ بۆ ڕەواندز، نووسیویە: ((بەرەو ڕەواندز پاشەکشەی کرد تا هێزێکی تازە بۆ بەر بەرەکانێ لەگەڵ ڕەزاشا بڕازێنێتەوە)).

١. کوردینە تاکەی ئێمە لە کێوان میسالی دێو،
بێین و بچین و بۆ مە نەبێ قەت خودان و خێو؟
٢. خەڵکی هەموو لە باغ و لە شارانە کەیف خۆش
ئێمەش بڵاو و بێسەرە ماوین لە دەشت و کێو
٣. بۆ عاسمان دەڕۆن و لە بەحرا دەکەن سەفەر
هەر عەرزە نیشتگاهی مە، سەنعاتە وەردو شێو
٤. ڕێی وانە کەهکەشان و ڕێی ئێمە بەردەلان
جێی وانە تەخت و بەخەت و جێی ئێمە بەردو چێو
٥. ڕەشماڵە ماڵ و کەشك و پەنیرە مەتاعی مە
قەسرو سەرای خەڵکی دیبە پڕ لە زێڕو زێو
٦. لا هەڵدڕاو و جەرگ بڕاو و فڕیدراو
بێ شوێن و بێ نیشان، پەرێشانن و پەشێو
٧. فیکرێ لەکاری خۆ کەن و بگرین بە حاڵی خۆو
هەر بێ سەری وعەداوەتی خۆتانە دێتە ڕێو
٨. ژێردەستی و ئیتاعەتی بێگانە تا بەکەی؟
شەرمە لە بۆمە هێندە ژیان بێ نیشان و نێو
٩. مەغبوونی هەر موعامەلە، مەحکوومی هەر کەمێك
شاهان بە مەحوی ئێمە دەبەستن گرێ و گرێو
١٠. گوردانی کوردەکان! بەخودا ڕۆژی غیرەتە
دەس دەینە خەنجەران و پیاوانە بێینە نێو
١١. هەر کەس کە بیری تۆڵەو جێی بابی خۆی نەبێ،
ئەو بێ بەشە لە کوردی، دەریکەن نەیێتە دێو
١٢. بۆچمانە ماڵ و سەر کە لەسەر سەروەری نەچێ؟
کوڕ نابێ قەت بترسێ لە زیندان و دارو چێو
١٣. پێ هەڵگرن بگەینێ، کە شەڕ، بۆمە شاییە
دەست تێکگرن، درەنگە، جحێڵانە بچنە نێو

١٤. چون دوژمنن لەگەڵ یەك و بێ دەرس و مەدرەسەن

ڕاوو دەدەن بەجارێ، لە هەورازێ بۆ نشێو

١٥. ئەو ژینی بەو ڕەزاڵەتە بۆ چیتە چاوەکەم؟

بپسێین لە ڕێی نەجاتی وەتەن با بەنێرو مێو

١٦. سەرچوونی تەختی، ڕۆینی سەرداری پێ دەوێ

خۆشیمە بەو شەهادەتی شێخانە نێو بەنێو

١٧. کوان گوردی کوردەکان، کە لە ترسیان دەلەرزی عەرز؟

کێ بوو لە شام شا بوو، لە میسرێ ببوو خەدێو؟

١٨. ئازادی، سەربەخۆیی، میری و گەورەیی

داوا بکەن بەزارو زمان و ددان و لێو

١٩. تاکەی لە باغی خەڵکی بە زیزی و بە مل کەچی

خۆشە لە باغی عێلی چیننی هەنارو سێو

٢٠. بۆ وانە هەرچی جوانە لە جێ و دێ و لە ژن، لە ماڵ

هەر شاخ و داخە بۆمە، کوڕی ڕەش، کچی دزێو

٢١. هەر میللەتێ لەلاوە حەقی خۆی بەدەستەوە

کوردێ کە سەر هەڵێنێ، دەڵێن بۆتە سەربزێو

٢٢. هەرچی دەبێ، بلا ببێ، قسەی حەق "حەسەن" دەڵێ

نیمە لە ڕێی وەتەن غەمی دەرکردن و جنێو

**پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ٢:**

١. دێین و دەچین و

٢. ئێمە

٣. ئاسمان

٤. کەهکەشانە،/ بۆ وانە تەخت و بەختە

٥. ڕەشماڵ و ماڵە

٦. ڕاماندەدەن بە جارێ لە هەورازێ بۆ نشێو

١٠. ڕۆژی هیمەتە/ جحێڵانە بچنە نێو

١٥. ئەو ژینە بۆ زەلالەتە

١٦. تەخت/ لەو شەهادەتە (نیاز، شێخ سەعیدی پیرانە)
١٨. ئازادی، سەربەخۆئی و/ دەعوای بکەن
٢٠. لەدێ و جێ،
٢١. بووە بە سەربزێو
٢٢.حەق هەردەڵێ "حەسەن"

* لە نوسخەی چاپی قازی ئەحمەد دا هاتووە:

((شەهادەتی شێخان، مەبەستی کووژران و شەهید بوونی شێخ عوبەیدیللای شەمزینان و شێخ سەلام بارزانی و شێخ سەعیدو دوکتۆر فوئادو ... بووە)) (ل٣٧).

بەبۆچوونی من نیازی شاعیر تەنیا شێخ سەعیدی پیرانە، گەرچی بەهۆی نیشانەی کۆی "شێخان"ەوە دوور نییە بتوانین شێخانی دیکەشی پێوە پەیوەند بدەین بەڵام من لەگەڵ ئەوەدا نیم شێعرە کە ڕووی لە شێخ عوبەیدیلا ی نەهری بێت کە بە مردنی ئاسایی لە ڕێگەی حیجاز کۆچی دوایی کردووەو هەروەها لە دوکتۆر فوئادیش کە بە دوکتۆر ناسراوە نەك شێخ.

* دوو نوسخەی ئەم شێعرە بەرزەی سەیف لەناو دەستنووسەکاندا هەن، کە بەداخەوە یەکیان ناتەواوە (١٤ فەرد)و ئەویتریان ٢٢ فەردە.

* نوسخەی حەسەنی قازی و قازی ئەحمەد هەردوکیان ٢٢ فەردن.

* ئەو دوو فەردەی کە لە زمان مامۆستا سەید عوبەیدیلای ئەییووبیانەوە لە "دیوانی سەیفولقوزات" چاپی قازی ئەحمەد(ل٨١)دا هاتوون دەبێ بەشێك یا زیادکراوێك بن هەر لەم شێعرە گەرچی هەر دوو فەردە کەجێگەی گومان لێکردنن ودوور نییە درەنگتر لێی زیاد کرابێتن:

سمکۆی خودا کە داوە بە مە ساحیب و ڕەئیس،
شوکری بکەن بەزارو زبان و ددان و لێو
مەقسوودی وی ئەمە، کە هەقی مە بداتە مە
تەکلیفی مەش وەهایە فیدای بین بەنێرو مێو.

(٣)

١. کوردینه! ئەورۆ ڕۆژی گەپ و کەیف و شادییە
لەو نیعمەتەی کە بۆ مە" ستالین"ە، حامییە

٢. دەستی وەدەس مە داوە، کە چیدی لە دەس نەچین
بانگمان دەکا کە ئێرە، جێگەی ئیتمینانییە

٣. ئەو میللەتە ڕەشیدە کە یۆڵداشی وای هەبێ
بۆ قەلع و قەمعی هەرچی ئوروپایە، کافییە

٤. کوردینە! موژدە لێوە، کە چیدی زەلیل نەبن
"میر جەعفەر"یش بە ئەمری وی، بۆ ئێمە هادییە

٥. ئوستادی وا مەزن دەبێ شاگردی وای هەبێ
تەئسیری دەرس و مەشقی وییە هێندە چاکییە

٦. جومهووری "ساویەتی" بە دەنێکە سەلیم و ساغ
لای مۆسکۆیی سەرە، میری باکۆیە چاوییە (؟)

٧. ئەو یەکیەتی و موحەببەتی نێو ئەفسەرانی وان
سوێندی دەخۆی کە پاك برای دایك و بابییە

٨. بۆ شارەزایی ڕێگەیی حەق ڕەهبەری یەکن
بۆ دەفعی دوژمنی وەتەن هەریەك فیدایییە

٩. هەر کامێکی دەبینی، دەڵێی چاکیان ئەوە
دوور بن لە چاوەزارێ، ئەوەش بەختی کوردییە

١٠. هەر کەس دەپرسی "کاکە! چلۆنن لە جێگەتان؟"
خۆش بەخت و شادو دڵخۆش و مەمنوون و ڕازییە

١١. وا چاکە بۆ مە هەرچی بڵێن بە قسەیان بکەین
هەر کەس وەدووی ئەوان کەوێ بێشك نەجاتیە

١٢. مەئیووس و زیزە شاعیرو نەوزانی قەدری وی
وەك شێرێکی لە جەنگەڵی قەفقازێ یاغییە

١٣. بەیداغی سوورە ئەوڕۆکە چاو سوورو پشتیوان
کەروێشکە شێر لە کن مە، هەڵۆ وەك مراوییە

١٤. رووسووره هەر کەسێ کە "قزڵ ئۆردوو"ە پەنای
بۆ مە ئەوە بەسە کە پەنای دیکەمان نییە
١٥. قوربانی پێشەوایەکی وا بۆ نەبێ "حەسەن"؟
ڕەفتاری چاکی وانە بە ئەمرو قسەی وییە
١٦. تەبریکی فەتحی تازە، دۆعای خێری بۆ دەکەم
بۆ ئەو ڕەفیقە گەورە کەوا بۆمە حامییە
١٧. بۆچی زمانی دایکی لە ئێمە مەنع کرا؟
ئەو هێندە، زوڵم و زەحمەت و فەرق و جوداییە
١٨. یا دەرکراوی مەوتەنە، یا حەبسی بێگوناه
کوردێکی مەزن و عاقڵ و مەردی حیسابییە
١٩. هەر ماڵە کوردێکی کە دەچووی، دەتدی شیوەنە
ئەوڕۆکە هەر دێیەکی دەچی، سەیرو شاییە
٢٠. چەن خۆشە کوردەکان! کە دەبینم بە جلکی خۆو
پشتێندو پێچ و پەستەك و چۆغەو سۆرانییە
٢١. ئەوجارەکەش نەمردم و دیتم بە پڕچەکی
شیرو دەمانچە، خەنجەرو بوڕنووی سەوارییە
٢٢. قوربانوو بم، وەرن ببنە دۆستی یەکتری
زۆر عەیبە ڕێگری و دزی، کارێکی چا نییە
٢٣. خەڵکی دی دڵخۆشن بە جێگەو مەوتەنی خۆیان
بۆچی ئەمە نەخوێنەوە لەو چۆم و کانییە؟
٢٤. هێندێکی بۆ عێراق و بۆ سمنان و دامەغان
دەستێکی بۆ شیراز- کە جێی شێخی سەعدییە
٢٥. [دەکرانە دیل و بوونە ئەسیری لەنێو عەجەم]
هەورامی، سابڵاغی، و ئێلی جەلالییە.

**پەراوێزی شێعری ژمارە ٣:**

٣. ئەو میللەتە نەجیبە

٦. جمهووریی مساواتی/ ئی مۆسکۆی سەرە، میرباکویە چاوییە.

٨. هەر خۆی فیدائیە

٩. هەر کامێکیان/ ئەوە بەختی

١٠. مەمنوونو ڕازییە

١٢. نەیزانی قەدری وی

١٣. چاوسوورە/ کەر[و]ێشکی لێژە لێکەمەندە

١٨. حەبسە

١٩. شاییە/ کەدەچی

٢١. نیزامییە

٢٣. بۆچی ئَو

٢٥. سورانیو گۆرانییە/ سوارو

٢٧. لەتکەی یەکەمی ئەم فەردەم لە دەقی چاپکراو وەرگرت.

* قازی ئەحمەد لە سەرەتای پارچە شێعری کۆتایی دیوانە چاپکراوەکەدا- "ئەورۆ حەسەن پەیامی دۆعاو سلاوییە... نووسیویەتی: ((ئەم هەڵبەستە... لە باری کێشو سەرواو ناوەرۆکەوە درێژەی هەڵبەستەکەی پێشوویەتی)) و هەڵبەستی پێشووش لەڕاستیدا ئەم پارچە شێعرەیە.

بۆچوونی مامۆستا ئەحمەد لە ڕاست دەچێت. ناوەرۆك هەر یەکەو کێشو سەرواش هەر وەك یەك. گەرچی من ئەمانەتی دەستنووسەکان دەپارێزمو جیاجیا تۆماریان دەکەم، بەڵام خوێنەر دەبێ ئاگاداری ڕاستییەکە بێت بۆ ئەوەی ئەگەر ویستی بیانداتە دەم یەك. شێعرەکە لە دەستنووسەکانو هەروەها لە کەشکۆڵی "مەلا بابە وەیسی"دا بەشێوەی سەربەخۆ تۆمار کراوە.

* دوو فەردی کۆتایی (واتە ٢٤و ٢٥)م لە لاپەڕەیەکی سەربەخۆی ناو دەستنووسەکان وەرگرتووە. لە لاپەڕەکەدا، فەردی ژمارە ٦یش لەپێش ٢٤دا دووپات بۆتەوە.

* نوسخەی قازی ئەحمەد ئەم زانیارییانەی لەمەڕ شێعرەکە ڕاگەیاندووە:

((میر جەعفەر باغرۆف: ئەفسەرێکی شوڕەوی بوو لە ناوچەی مەهاباد دە زەمانی شەڕی جیهانی دوویەمدا.))

[دیارە بەڕێز ئەحمەدی قازی لەمەڕ باغرۆف هەڵەی کردووە. میر جەعفەر باغرۆف سەرۆکی ئازەربایجانی شوورەوی بووە]

قزڵ ئۆردو: ئوردووی سوور، مەبەست سپای شوورەوییە.

فەتحی تازە: فەتحی بەرلین پێتەختی ئاڵمان [لە لایەن سپای شووڕەوییەوە].

(٤)

١. ئەورۆ حەسەن پەیامی دۆعاوو سلاّوییە
بۆ میللەتی ڕەشیدی پەنای بەشخوراوییە
٢. کانی عەداڵەت و "وەکوویەکی"(١) و برایەتی
زەحمەتکێش و بەکار، چ ژن یا پیاوییە
٣. هەر عیلم و سەنعەتە کە لەکن وان ڕەواجی بێ
بێ قەدرە دەوڵەمەندی و موڵکی کڕاوییە
٤. تا ڕووس بمێنێ کاکە، لە تاریخی عالەما
بە یداغیشی کە سوورە بە خوێنی ڕژاوییە
٥. مەخسووس (٢) لە بۆ شەڕن نەفەرو ئەفسەرانی وان
نەك عەیش و نۆش و لەززەتی شیرو کەکاوییە
٦. هەر یەك بە ڕۆژی مەعرەکە شێرن لە نێرو مێ
بەو قۆڵی داخراوو بەلەك دەرخراوییە
٧. بۆ مەدحیان بەسە کە کەسی بێ کەسان ئەون
بۆ میللەتی زەعیف هومێدو هەناوییە
٨. کاری بە دەستی خۆیەتی هەر میللەتێکی بێ
سەر دادە نێن لە بۆیە لە ڕێی کەس‌نەماوییە
٩. قەفقاز و ڕووس و ئوزبەك و تفلیس و ئێرەوان
تاجیك و تات و ترکەمەن و هەرچی ناوییە(٣)
١٠. هەر کەس بە مڵك و میللەتی خۆی شاد و ڕازییە
ئازادی، سەربەخۆیی وەها پێدراوییە
١١. دنیا تەواوی چاوی لە تانك و لە تۆپی وان
تەییارە، بۆم و ئەژدەر و زیپلین(٤)و ناوییە(٥)
١٢. گۆی سیبقەتی فراندووە ئەمڕۆ لە عالەما
فەخری ڕەفیقەکان، بەقشونی تەواوییە
١٣. ڕووی کردە هەر سپایەکی مەحوی دەکاتەوە
فەتح و زەفەر (٦) لیباسە بە بەژنی بڕاوییە

١٤. ئەلمان کە لاقی گەورەیی لێدا لە عاستی وان
پشتی شکا، نیشانە سەلیبی شکاوییە(٧)
١٥. هەر جێگەیەك کە دوژمنی بۆ چوو، وەپاش درا
پێی ما سەری شکاوی و قونی دڕاوییە
١٦. گیراوە شارەکانی دە نازی بە فەتحی وان
سەربەرزییەك کە مابێ سەری بێ کڵاوییە
١٧. ئەو سەرکەشە کە دوێنێ لە ترسی دەلەرزی عەرز
ئەوڕۆکە بۆتە مەسخەرە، هەر قاوە قاوییە
١٨. هەر دەوڵەتێك کە گرتی بە خوێناوی میللەتێ
گیراوە لێی بە زۆرو بکرا دەرکراوییە
١٩. بەدبەختی و شکست و زەلیلی کە هاتە ڕێی
نەیزانی موددەعی لە خەیاڵاتی خاوییە
٢٠. کاڵەی (٨) دڕا، چی پێ نەبڕا، پشتیشی شکا،
کەوتە هیلاك و غەر غەرە، کاری کراوییە
٢١. ئەو فەتحی وا کرا لە ستالینگرادی وان
دەرچوو بەجارێ دوژمن، و تۆقی زراوییە
٢٢. جێی حەملەیانە ئەوڕۆ ئوڕووپا بە پانەوە
ژاپۆن لە ترسی وانە لە چین چاوە چاوییە
٢٣. کوردان کە هاتوچۆ دەکەن ئەوڕۆ بە پرچەکی
"نیشتمان" زمانی وانە بە ئەمری دراوییە(٩)
٢٤. ڕۆژنامەکانی ترکی لە تەورێزێ دایرن
بۆچ هەر لە کوردی دەردی دڵ و تەنگ و تاوییە(١٠)
٢٥. خۆ کوردو فارس هەر دو برای دایك و بابێکن
وەك یەك نەبێ، لە بەرچی، بەش و نان و ئاوییە؟
٢٦. لەو جەورو زوڵم و زەحمەتە دەدرێ بە کوردەکان
مانیان نەمانە، ژینێکی سەگ تێ ڕیاوییە
٢٧. پێم کوت بە پادشاو بە وەزیرو نەخوست وەزیر(١١)

ئاورێك وه كوردی دهن. وه به حاڵی بڵاوییه

٢٨. ههر كورده خوێنی خالیسی ئێرانی پاكی بێ
نهی كردووه به ترك و عهرهب تێكهڵاوییه

٢٩. مهئمووری حیزو بێ شهرهف و خائینی وهتهن
ڕاپۆرت بدا، بلا به درۆ، چونكه داوییه!

٣٠. سهرتیپه شێته(١٢) هۆشی كهرێكی تهواو نییه
تههدید دهكا به كوشتنێ، ئهم دهم گواوییه

٣١. ئهم خوێندهوه له ناسرو خوسرهو شكایهتێ
"زێرۆ" (١٣)و "حهمه ڕهشید"ه(١٤) سهری بهندو باوییه

٣٢. بێ ڕوحمی، بهد نیهادی، دهگهڵ كوردی تا بهكهی
بهس بێ ئهوهنده فهرق و جودائی، چ ناوییه؟

٣٣. ئاسوودهیی مهرامیه، كوێخایی ماڵی خۆی
نهك بێته ژێر چهپۆكه، به شهق لێدراوییه

٣٤. سهر سهوزه باغی ئارهزوو نیزیكه بێته بهر
مهزرای هومێدی تینوه وهختی شهواوییه

٣٥. ههر كهس كه ڕوشدی بێ ههوهسی ماڵی خۆی دهكا
تۆوێكه زۆر لهمێژه له باغدا چناوییه

٣٦. ئهخلاقی چاك و خوێندن و دینداری و "اتحاد" (١٥)
گورج و بهكارو جهڵد بێ(١٦)، نهڵێن ساوه ساوییه

٣٧. ههرگیز حهقی ژیانی نییه پیاوی بێ سهواد
چاوسووری خۆی نهبێ و وهتهنی پێ بڕاوییه

٣٨. به زمانی دایكی خوێندن و نووسینی بۆ نهبێ؟
ئهو میللهتی قهدیم و زبان بهستراوییه

٣٩. حوببی (١٧)وهتهن نیشانهیی ئیمانه كوردهكان
نیشتمانی خۆت وه ژینه(١٨) به پێچ و كڵاوییه

٤٠. مهرد چاكه ئهو كهسهی سهری دانێ له ڕێی وهتهن
باكی نهبێ له بهندو له داری چهقاوییه

٤١. منداڵەکانی بێسەرە بوون دایکی نیشتمان
هەر یەك بەلایەکا سەبەبی بێلغاوییە
٤٢. جیرانەکەت بە ئارەزوویی کۆنی خۆی گەیشت
کاسەی جیرانی کەی دێ لەوی لێ نراوییە(١٩)
٤٣. تۆ سەر لە من بخوازە لە بۆ کێشکی نیشتمان
چی دێتە سەر زمان، بە کوردی کراوییە (٢٠)
٤٤. هەورامی و جەلالی بۆ سمنان و ساوە چوون
سابلاغی بۆ شیرازێ ڕەپێچەك دراوییە
٤٥. مەرکەز لە بەرچی هیچی نەپرسی لە حاڵی وان
کێ دی بە غەیری کوردی وەتەن دەرکراوییە؟
٤٦. میوان بەخێر هێنانە لە بۆ کوردی بۆتە شوێن
دەرك ئاوەڵایە، سفرە پڕو ڕاخراوییە
٤٧. سەرقژنی، پووزڕووتی، کچی کوردی نایەوێ
داوێنی دادڕاو وسەری پێچراوییە
٤٨. ئێخێکی دادڕاو و کراسێکی سەرلەبەر
دەسماڵو شاڵی پشت، شل و بادراوییە
٤٩. قۆڵ هەڵکراو کراسی بە پشتێندیدا کراو
چارشێو لە شان و زولفی بەلادا کراوییە
٥٠. بەو سینگ و باسکە ڕووتە لە من بۆتە قووتی ڕووح
بەو لێوی ئاڵ و پەرچەمی کاڵ و بڕاوییە
٥١. گەردن بڵیند و سینگ و کەفەڵ هێندە پان و پۆڕ
باریك و شووش قامەت و قەد، چاو خەواوییە
٥٢. کیژانی جوانی عێلی لە خێلی کە دێنە دەر
ئاسکن لە باسك، و سوورە قورینگی شەتاوییە
٥٣. سنجاغ و کوحلی (٢١) بەرۆك، بەرموور و پێشە سەر
ماینی کەحێلی عێلی، ڕەخت لێدراوییە
٥٤. کیژۆڵەکان ببینە لە نێو باری و شتران

ئەستێرەکانی گەش لە حەوا ڕاکشاوییە

٥٥. ئی مە، کەون(٢٢) لە کێوو دەران دا کەدیٚو دەچن

ئەو، (٢٣) تاوسی سایە پەروەرە نەیدیوە تاوییە

٥٦. ئی مە، خەریکی تەون و تەشی و چێشت و نان و خوان

ئەو، لێوی سوور و پۆدر و فرِ و کل دە چاوییە

٥٧. ئی مە، خەریکی زەحمت و کارو مەرارەتن

ئەو، حوکمڕانی مێردە، لە ژێر دەس کڵاوییە (٢٤)

٥٨. هەرچی کوتم، نەسیحەتە، عەینی حەقیقەتە

نەك سوحبەت و جەفەنگە، مەڵێن چاوو ڕاوییە

٥٩. ئەو شێعرە لایقن لە بەریکەن جحێڵەکان

یادم بکەن بەخێرو دۆعای بۆ کراوییە

ذیحجە الحرام ساڵی ١٣٢٣ هەتاوی لە گوندی "زرینە" گوتراوە.

**پەراوێزی شێعری ژمارە ٤:**

قازی ئەحمەد سەبارەت بەم پارچە شێعرە نووسیویەتی:

ئەم هەڵبەستەی ژێرو، دوائین شێعری سەیفە کە دە ڕەمەزانی ساڵی ١٣٢٣ی هەتاویدا هوندویەتەوە. لەباری کێش و ناوەرۆکەوە درێژەی هەڵبەستەکەی پێشوویەتی لەژێر سەرەتای "ڕۆژی شادی"دا [کوردینە! ئەوڕۆ ڕۆژی گەپ و کەیف و شادییە].

١. ڕەشیدو/ میللەتی ڕەشیدی پەنای بەش خوراوان، نیاز میللەتی ڕووس یا بەگشتی، سۆڤیەتییە.

٤. تا ڕووسی یێ بمێنێ

٥. لەززەتە

٦. چ نێر، چ مێ

٧. داخراو، بەلەکی

٩. قەفقازو ئویز بەگ و تەکە، تفلیس و ئێرەوان

تاجیك و تات و قرغز و قرم و سراوییە

١١. تەییارە، بۆمی ئەژدەرو ڕۆزپلین داوییە

١٢. ڕفاندووە/ ئەوڕۆ/ لە عالەما/ ڕەفیقەکانی(؟)

١٣. سپاهێکی

١٤. لە ڕاستی وان

١٥. هەر جێکی گرتی بە زۆری وە پاش دەدا

١٦. سەربەرزێکی کە

١٧. مەخسەرە

١٨. هەر دەوڵەتێکی گرتی بە خوێناوی میللەتی

گیراوە لێی بەزۆر و زەوی گۆڕکراوییە (؟)

٢٠. جەرگیشی بڕا

٢١. ئەو فەتحە وا کرا

٢٢. نیشتمان، ئاماژەیە بە گۆڤاری "نیشتمان" کە ئۆرگانی کۆمەڵەی ژێکاف بوو و ٩ ژمارەی لێ دەرچوو، ژمارەی یەکەمی نیشتمان لە پووشپەڕی ١٣٢٢= جوولای ١٩٤٣ دەرچووە.

٢٤. تەنگەتاوییە

٢٦. ئەو جەور و

٢٧. بە پادشاەو وەکیل و

٢٨. بە سە حاڵی بڵاویە

٢٩. ڕاپۆرتی بەد دەدا بە درۆ

٣٠. ئەو دەم گواوییە

٣١. ناسر، "ناسر خانی قەشقایی" و خوسرەویش براکەیەتی. قەشقاییەکانیش ئەودەم دژ بە حکوومەتی ناوەندی ڕاپەڕیبوون،

((ناسرخان قسم خورده به زلف خسرو

کازرون آتش زنم با دود برنو.))

فۆلکلۆر

٣٢. بێ ڕەحمی و

٣٣. نەمێنێ دراوییە.

٣٦. جیدی و جەلدی چاکە، نەڵێن ساوە ساوییە.

٣٨. قەدیمی

٤٠. باکی نەبێ تەناف و لەداری چەقاوییە

٤١. بێ لە ناوییە(؟)

٤٢. گەیی

٤٣. کێ دی (؟)

٤٤. لە پێچەك

٤٦. دەرك ئاواڵە، سفرە پڕ و

٤٧. دامێنی

٥٠. بەو سنگو باسکی ڕووت

٥١. چاوی نواوییە

٥٢. لە دووی خێڵی دێن، دەڕۆن

٥٣. گۆڵی بەرۆکێ و

٥٤. کیژۆڵەکانی سوار لەنێو باری وشتران

٥٥. ئیی مە کەون لە کێوو دەراندا کە دێو دەچین

٥٧. مەرارەتین/ ئەو حوکمڕانە، مێژوو لە ژێر دەس کلاوییە(؟)

٥٨. هەرچی کوتوومە/ نەك سوحبەتو

ئەم شێعرە لەنێو دوو نوسخە لە دەستنووسەکانی بەردەستی مندا نەبوو، بەڵام لە کەشکۆڵی مەلا بابەوەیسیدا هاتووەو ژمارەی فەردەکانی هەمان ٥٩ی ناو دیوانی چاپکراوی مامۆستا قازی ئەحمەدن.

بەهۆی ئەو ڕاستییەوە کە شێعر نووسینەوەکانی خوالێخۆشبوو مەلا بابەوەیسی هەندێ جار بە گوێرەی پێویست، وردو بێ هەڵە نین، باشترم زانی دەقی قازی ئەحمەد بکەمە سەرچاوەو جیاوازییەکانی لەگەڵ ئەمیاندا بخەمە پەراوێزەوە. سەرەڕای ئەو بۆچوونەم، دەبێ بڵێم دەقی مەلا بابەوەیسی هەندێ ناڕاستی دیوانە چاپکراوەکەی تێدا ڕاست کراوەتەوەو پێویستە سەرنجو بایەخی پێویستی پێ بدرێت.

فەزای شێعرەکە، فەزای دوای ڕووخانی ڕژێمی ڕەزاشاو ماوەی شەڕی دووهەمی جیهانی لە ئێرانەو بە ماوەیەکی کەم پێش دامەزرانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد بە ڕێبەرایەتی برازای سەیف، واتە پێشەوا قازی محەمەدی شەهید. هیوا بەستن بە حکوومەتی سۆڤیەتی و ڕێبەرەکەی- ستالین، هیواداریی بە یارمەتی کۆماری ئازەربایجان (ی باکووری)و ڕێبەرەکەی، داواکاریی بۆ مافەکانی گەلی کورد لە حکوومەتی ناوەندی، هێرش بردنە سەر فەرماندەی ناوچەیی سوپای ئێران- سەرتیپ هۆشمەند، کە دژایەتییەکی حەیوانیی لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کوردو پاشان لەگەڵ کۆماری کوردستان دەکرد. لە پێوەندی سەرتیپ هۆشمەندا سەیف دەڵێ:

نەمخوێندەوە لە "ناسر"و "خوسرەو" شکایەتێ

"زێرۆ" و "حەمە ڕەشید"ە سەری بەندو باوییە.

زێرۆ بەگی هەرکی و حەمە ڕەشید خانی قادرخان زادە هاوکاریی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردو کۆماری کوردستانیان دەکرد، بەڵام ئێرانییەکان بە "چەتە" و پیاو خراپیان ناو دەبردن. سەیف دەڵێ بۆچی سەرتیپ هۆشمەند باسی ئەوان دەکات بەڵام ناوێك لە "ناسر"و "خوسرەو"ە نابات. ئەو "ناسر"و خوسرە"وە ڕێبەرانی عێلی قەشقایی بوون کە لە ناوچەی فارس دژ بە حکوومەتی ناوەندیی ئێران ڕاپەڕیبوون. ناسر خانی قەشقایی برای خوسرەو خان بوو (بڕوانە شێعرە فۆلکلۆرە فارسییەکەی چەند دێڕ پێشتر).

قازی ئەحمەد لە سەرەتای شێعرەکەدا ئەم چەند دێڕەی وەك ڕوونکردنەوە نووسیوە: ((ئەم هەڵبەستە، دوایین شێعری سەیفە، کە دە ڕەمەزانی ساڵی ١٣٢٣ی هەتاویدا هۆندوویەتەوە. لە باری کێش و ناوەرۆکەوە، درێژەی هەڵبەستەکەی پێشوویەتی....)) (ل٧٢ تا ٧٧ی دیوانی چاپی).

ئەو هەڵبەستەی کە قازی ئەحمەد دەڵێ ئەم پارچە شێعرە لە درێژەی ئەودا گوترا بێت، پارچە شێعری پێشووتری ئەم دەقەیە بە مەتلەعی:

((کوردینە! ئەوڕۆ ڕۆژی گەپ و کەیف و شادییە

لەو نیعمەتەی کە بۆ مە "ستالین"ە حامییە))...

منیش لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا هەم، ناوەرۆکی شێعرەکانیش هەر ئەوە نیشان دەدات بەڵام بەهۆی ئەو ڕاستییەوە کە هەردووکیان بەشێوەی جیاجیا تۆمار کراون، نەمویست دەستیان تێ وەردەمو بیانکەم بە یەك.

نوسخەی قازی ئەحمەد ئەم زانیارییانەی خوارەوەشی ڕاگەیاندووە:

((قەفقازو ڕوس‌و ئوزبەك و تفلیس‌و ئێرەوان

تاجیك‌و تات‌و ترکەمەن‌و هەرچی ناوییە))*

لە هێندی نوسخە دەسنووسەکاندا نیوەی دوویەمی شێعرەکە ئەوەیە: ((تاجیك‌و تات‌و قرقزو قەومی سەراوییە)). بە بڕوای من مەبەست لە تات قەومی تاتارەو قەومی "سەراوییە"ش خراپ نووسراوەتەوە، دەبێ "سلاوییە" بێ کە مەبەست بەرەی سلاوە لە ڕۆژهەلاتی ئەوروپاو ڕۆژئاوای شورەوی.

* سەیف پیاوێکی گەورەی ناوچەی موکری بوو و دەرگای هەموو ئیدارەو دایرەو مەقامێك بۆ ئەو ئاواڵە بوو. دیارە دەردی وڵاتی خۆی بەکاربەدەستان ڕاگەیاندووەو داوای لێکردوون بە کاروباری وڵاتی کورد ڕابگەن.

* سەرتیپە شێتە: مەبەست ئەوەیە بە سەرتیپ هۆشمەند ناوێك گوتراوە کە دە زەمانی ملهوڕی ڕەزاشاداو لەدوای ئەویش زۆری زوڵم دەکردو هەڕەشەی کوشتنی لە خەڵك دەکرد.

* زیرۆ بەگی هەرکی: لە ئاغایانی دەست ڕۆیشتووی هەرکی ناوچەی ورمێ بوو کە بەهۆی هاوکاری دەگەڵ جەمهووریی خودموختاری کوردستان ناوبانگی ڕۆیشتبوو.

* حەمەڕەشید خانی قادر [خانزادە]: ئاغایەکی نێو بە دەرەوەی ناوچەی بانە کە لە ئێران‌و سنووری عیراق بەرانبەر بە دەوڵەتەکانی ئێران‌و عیراق سەربزێوی دەکرد.

لە کۆتایی دەقی مەلا بابەوەیسیدا ئەم دێڕە نووسراوە:

"هۆنراوەی ١٣ی زیحەجە، بەرانبەر تەئریخ ١٣٢٣ مرحوم سیف قاضی"

کە سەرەڕای جیاوازییەکی کەم لەگەڵ یاداشتەکەی پێشووتری قازی ئەحمەد، بۆچوونی ئەو پشت ڕاست دەکاتەوە کە "دوایین شێعری سەیف" بووبێت. کۆچی دوایی سەیف لە ڕۆژی ١٣٢٣/١١/٧ بەرانبەر لەگەڵ ١٩٤٥/١/٢٧دا ڕووی داوە. بە گوێرەی ڕۆژژمێری بەراوردکاریی ساڵی زایینی‌و کۆچی "مانگی"، زیحەجەی ساڵی

١٣٢٣ دەکەوێتە مانگی ١١ی ساڵی ١٩٤٤ واتە کەمتر لە دوو مانگ پێش کۆچی دوایی شاعیر. مانگی ڕەمەزانیش لە ئوگوستو سپتەمبری ساڵی ١٩٤٤دا بووەو ئەویش دەکاتە ٣ تا ٤ مانگ پێش مەرگی شاعیرو بە هەردوو حیساب، شێعرەکە دەتوانێ دواییێ یاخۆ یەك لە دواییێ شێعرەکانی سەیفولقوزات بێت.

بۆ بەراورد کردنی ساڵەکان کەڵکم لەم سەرچاوەیە وەرگرتووە:

فردنیاندو وستنفلد و ادوارد مار، "تقویم تطبیقی هزارو پانصد ساله هجری قمری و میلادی"، مقدمەو تجدید نظر از: دکتر حکیم الدین قریشی، فرهنگسرای نیاوران، تهران ١٣٦٠ [١٩٨٢].

نوسخەی حەسەنی قازی هەموو فەردەکانی ئەم شێعرەی گرتۆتە بەر.

## (٥)

... وەتەن

(بۆ شاگردانی مەکتەب یا نەوجەوان)

١. ئەی گوڵی گوڵزاری دین، ئەی نەوجەوانانی وەتەن!
ئەی لە نیعمەتدا بە قیمەت یەك بە یەك دوڕڕی عەدەن!

٢. ئەی نەوەی بازو شەهێن! بۆ تۆ جەلادەت فیترییە
سەیری ئەتڕافت بکە یەکبارە ڕاوی تۆ دەکەن

٣. حەز دەکەن جێی باب و باپیرتان بزانن کوێ بووە؟
دەرسی تاریختان کە خوێند، جوغرافیا دیققەت بکەن

**پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ٥:**

١. لە نیعمەتدا (؟) لە خوێندنەوەی وشەکە دڵنیا نیم.

ئەم پارچە شێعرە جگەلە یەك نوسخە، هیچ کۆپییەکی دیکەی لەناو دەستنووسەکاندا نییەو لە هیچ سەرچاوەیەکی دیکەشدا نەهاتووەو ئاماژەی پێ نەکراوە. وێ دەچێ شێعرەکە بۆ موناسەبەیەکی قوتابیان گوترا بێت و ئەگەری زۆر بەهێز هەیە کە ژمارەی فەردەکانی لەو سێ فەردە زیاتر بووبێت.

گەرچی لەبارەی ناوەڕۆکەوە لەگەڵ هێڵی فیکریی سەیفدا یەك دەگرێتەوە، بەڵام من ناتوانم بیر لەوە نەکەمەوە کە شێعری سەیف نەبێ و هی شاعیرێکی دیکە بێت. بۆ زانیاری خوێنەر دەڵێم کە لەناو دەستنووسەکاندا گەلێك جار شێعری شاعیرانی دیکەش دەبینرێت، بەڵام وەك گوتم ئەگەری شێعری سەیف بوونی بۆ من زیاترە لە نەبوون و بەم بۆنەیەشەوە لێرەدا هێنام، بەو هیوایەی کە دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکە، نوسخەی دیکەی شێعرەکە لە شوێنێك سەر هەڵبدات یاخۆ شارەزایان چارەنووسی پەیوەندی سەیف و شێعرەکە ڕوون بکەنەوە.

(٦)

١. زیارەتم کرد کاغەزی کوردی
پڕ لە ئیلتیفات، ڕاستیو مەردی
٢. پاکەتم هەڵگرت، شووشەی عەتری بوو
باڵی مەلایك، پەڕی پەری بوو
٣. چون لە دڵ ڕاهاتبوون مەعناکانی
زۆر شیرن و خۆش بوون کەلیمەکانی
٤. کەلیمەکانی دوڕی گەوهەر بوون
سەری شکستەی زولفی دڵبەر بوون
٥. وەك زولفی دڵبەر بوون "لام"ەکانی
وەك سەری مەمکان بوون "میم"ەکانی
٦. نوقتەی حەرفانی وەك خاڵەکانی
سەفحەی کاغەزی وەك سنگی پانی
٧. ئەلف قامەتی تازە نەمامان
لە باغان بەناز دەکەن خەرامان
٨. پرسیبووت "حەسەن" بێ تۆ چلۆنە؟
لە دووریت سووتا وەکوو کای کۆنە
٩. "عەزیز"! ژیانم بێ تۆ مردنە
شوغلم شەو و ڕۆژ ڕۆ، وای کوتنە
١٠. بەفری فیراقت دەست و پێی بردووم
لەسەرمای دووریت لە ژیانم بوردووم
١١. برنجی پیتەو بەڵمم بۆ چییە؟
لە جۆگەی لوتفت برشت یەك سیە!
١٢. سێڵاوی ئەشکم بەندی شکاندم
لەمپەرو بەندك، گوریسی پساندم
١٣. وێنجەو بەڵم و کا، گەلێك گرانە
کە لەتۆ دوورم، لەلام هەرزانە

١٤. خۆم بم بە قوربان دەست و قەڵەمت
یاخودا بەزیاد بێ لوتف و کەرەمت!

**پەراوێزەکانی پارچە شێعری ژمارە ٦:**

بۆ بەراوردکاریی ئەم شێعرە، کەڵکی تەواو لە نوسخەی حەسەنی قازی وەرگیراوە، نوسخەکە ئەم سەردێڕەی بۆ شێعرەکە داناوە: ((لە جوابی کاغەزی عەزیز ئاغادا)). سەیف لە شێعرەکەدا باسی گرانیی "یۆنجەو بەڵمو کا" دەکاتو بەم پێیە، دوور نییە ئەم شێعرەشی هەر ئەو ساڵە گوتبێت:

((عەزیز! ئارەزووت زۆری بۆ هێنام
فرمێسکم سوور بوو، زەردی ڕووی لێنام...))

کە لە درێژەیدا دەڵێ:

((زستانی ئەوساڵ، دیارە پێنج مانگە
مەڕو کاو گیاو جۆ بڕا لە دانگە....
قیمەتی کایە وەك کارەبایە
بوو بە قووتی ڕۆح وێنجەی سەحرایە...))

فەردی کۆتایی شێعرەکە، باسی ڕێکەوتی گوتنی شێعری دووهەم دەکات:

((تاریخ هەزارو سێسەدو دوازدە [١٩٣٣]
بیستی فەروەردین نەچێ لە یادە)) [= ٩ی مانگی ئەپریل]

ئەم شێعرە لە نوسخەی قازی ئەحمەد دا نابینرێت.

شێعرەکە وێدەچێ بۆ عەزیز ئاغای عەبباسی گوترا بێت و لە فەردی ژمارە ٩دا ناوی "عەزیز" و هەستە ناسیاوەکەی سەیف بەرانبەر بەو، خۆ دەنوێنێت.

٤. دورجی
٧. ئەلفی قمەتی
٩. ڕووداکەوتنە
١١. برینجی پیتەو
١٢. بەندك
١٣. یۆنجە
١٤. گەلێك هەرزانە کە لە تۆ دوورم/ لەلام گرانە

(٧)

١. یار کە دێتە سەر گۆل و ئەستێرە

سەیری وی دەکەن مانگ و ئەستێرە

٢. ڕووناکی ڕووی بوو یا ڕوونی عاسمان؟

کە دێ بۆ کێوی دەبا گاگێرە

٣. دەگەڵ یار، لە بن سێبەری پاڵان

چەن خۆشە دۆی سارد، دەگەڵ کولێرە

٤. خۆزگەم بەو شوانە لە دووی مێگەلان،

یارم بە زولفان دەکا هاوێرە

٥. شەرتە شوانیم ئەوەندە بەس بێ

یارم بێری بێ، بێتە بەر بێرە

٦. بە تیری نازت جەرگم بڕاوە

بۆچی بە تفەنگی لێم دەگری سێرە

٧. کوڵمە سوورەکەی گوڵە مێلاقە

لە دەورەی خاڵان بەڕیز بژمێرە

٨. لە باغی جوانیت وەختی زەکاتە

فەقیری خۆتم هەر بۆ من خێرە

٩. بە ڕشتەی زولفان دڵم نێچیرە

لە داروبەردی بەس دە، مەیگێڕە

١٠. هەرناڵەی منە لە دۆڵ و نواڵان

نەك فیتەی شوانەو دەنگی بلوێرە

١١. زولفی وەك شەوەی ڕۆژی کردمە شەو

چرای سەر کوڵمەم لە بۆ ڕادێرە

١٢. هەر کەس عیشقی تۆی لەسەردا نەبێ

بێ شك حەیوانە، ڕوو پانێرە

١٣. کردمە سەر باسکان: هەر ئاش بەتاڵمە

هەر بەو ئومێدەی یارم ئاشێڕە

١٤. هەر تەمادارم ئەورۆ و سبەینێ
زوو وەرە مەیکە بە دوێنێ و پێرە
١٥. وەك مەجنوون لە دووت کەوتمە کێوو دەشت
رەفیقم گورگ و پلنگ و شێرە
١٦. خەیاڵی غەمان مابێ غەم نابێ
بەتای زولفانی یارشەنە دێرە
١٧. عەزیز! ئەوانە شێعرن بە مەرگت
موخلیست بێ تۆ وەجاغی کوێرە
١٨. کوێستانی دووریت هەر زەردو ماهە
دەرت و لابەلا، ڕژدو هەڵدێرە
١٩. باری فیراقت پشتی شکاندووم
بەسەرمدا دێ، دەڵێی تاوێرە
٢٠. سەرباری دووریت شانمی جدەو کرد
بە تا و توورەکە، بە هۆڕ و تێرە
٢١. عیشقت لە سەرم قەت ناچێتە دەر
لەسەر سەریشم بگێڕن گێرە
٢٢. هەمیشە برسی سەر سفرەی وەسڵم
لە شەهدی لێوت قەت ناخۆم تێرە
٢٣. بۆ هەر جێ دەچی، دڵ بە دووتەوە
کۆنە ڕاوکەرە، دیارە شوێنگێرە
٢٤. هەر تۆوی مەیلی تۆم لە دڵدا چاند
تەرخانەکەی خۆت کۆنە جووتێرە
٢٥. گەنمە مەلای بێ زیزانەو زیوان
بێ پۆڵکەو چیۆدان، گورگەو گلێرە
٢٦. شینە، گوڵەی بەست، سەرمای دەرناوێ
ڕیشەی داکوتا چونکە سەردێرە
٢٧. لە ئەشکی زۆرم عەرزیش پەڵەیدا

بەندیش شکاندی، "حەسەن" ئاودێرە

۲۸. تەشك و دامێنم تەڕە کەشاوە
جۆگەی چاو خوڕە، سەر بەرە ژێرە

۲۹. خەرمانی عەیشم لە کای غەمدا، ما
کزەی شەماڵی مەیلت بنێرە

۳۰. لە ترسی سالاّن، زۆرم چاندووە
جۆشین و وێنجە، شەودەر، کەنێرە

۳۱. ئەگەر دەپرسی کاری ئەو بەینەم
ئاش و وشترخان، هۆڵ و سەرگێرە

۳۲. سێ چوار ڕۆژ بێ تۆ چوومە خانەقا
یادت شوغڵم بوو، هەر لەوێ و لێرە

۳۳. بۆ سەر مەرقەدێ، پێش نوێژان دەچووم
ڕێگاکەی قوڕ بوو، بەگێڕە گێڕە

۳٤. لە خزمەت شێخی یادم زۆر کردی
لەنێو خەتمیشدا بەخودام بسپێرە

۳٥. فەیزو بەرەکەت وەك باران دەڕژا
هەر کەس بەڕاست بێ، ئاخر بەخێرە

۳٦. هەر کەس لە پەنای شێخیدا نەبێ
حیزی نەفسیە، شەیتان پێی فێرە

۳۷. ئەگەر دەتەوێ دنیاو قیامەت
ڕووی خۆت لەو دەرکەی قەت وەرمەگێڕە

۳۸. نێوی شەمسەددین، ڕۆژەکە هەڵدێ
هەر وەك چەکچەکی هەڵدێ ئەو کوێرە

۳۹. هاتنی ئەو دەرکە لە دەست خۆت مەدە
سەرو ماڵی خۆت بێرە بسپێرە

٤۰. بۆ سەیری "دەروو" دەروونم خوێنە
بۆ "کانی سپی" فرمێسکم سوێرە

٤١. "کانی بەردینە" ئاوی حەیاتم
بە "کانی قازی" دڵم زەنوێرە
٤٢. لە "یەنگی دنیا" تاکو "کەڵتەگە"
هەڵاڵەو بەیبوون، سوێسن و شلێرە
٤٣. "کانی لەتیف"ی، "زنەی بەرباغی"
کانی گەوهەرە، مەعدەنی زێڕە
٤٤. لە دوور دیارە "چل ئەسحابە"کەی
بنەی "دوندی ڕەش"جێی لانی شێرە
٤٥. جێی دێی "کولتەپە" تەپەی گوڵانە
ڕێ پێڵگەی میوان، جێگەی جوامێرە
٤٦. بەندم کرمانجین، زۆرت پێ خۆش بێ
"حەسەن" کرمانجە گوێ ڕە وی دێرە

تحریر شد از روی نسخه‌ای که بدست شاعر در رمضان سال ۱۳۵۲ [= ۱۹۳۳]نوشته شده بود.

۱۳۳۷/٦/۱٦ [= ۱۹۵۸] خورشیدی

[ئیمزا]

**پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ۷:**

لە بەراورد کردن لەگەڵ نوسخەی چاپکراوی قازی ئەحمەددا چوار فەردی ناتەواو بوو، لێم زیاد کرد، فەردە زیاد کراوەکان ئەمانەن:

۳، ۲۵، ۳۰و ۳۸

۱. دەکەوتە بەر پێ مانگ و ئەستێرە

۲. ئەودەم بوو کێوی

۹. ڕستەی/ لە داروبەردی مەدە

۱۱. چرای عیشقتی لە بۆ ڕادێرە

۱۲. عیشقتی/ نابێ ئینسان بێ، بێ شك پانێرە

۱٦. خۆیانی خەیاڵ مابێ، غەم نابێ

١٧. عەزیزا/ شێعر ناوێ بە مەرگت

بەبێ دیدارت وەجاغی کوێرە

٢٨. جوانە چاو

٣٢. سێ ڕۆژ بەبێ تۆ چوومە خانەقا

یادی تۆم شوغڵە هەر لەوێو لێرە

٤٢. زنەیە باغی

٤٣. بنی دوندڕەشی

نوسخەی قازی ئەحمەد هەڵگری ئەم زانیارییانەیە لە سەر ئەم شێعرە:

((سەیف] هەڵبەستی ژێرەوەی لە تاریخی ١٣٥٢ی کۆچی [مانگی]، ڕۆژی شەشەمی ڕەمەزان [=١٩٢٣/١٢/٢٤ز] بەیادی عەزیز ئاغای کولتەپە گوتووە (ل٤٨)...))، دەروو، کانی سپی، کانیە بەردینە، کانیە قازی، زنەی بەرباغی، ناوی چەند سەرچاوەو کانێن لە گوندی/ کولتەپە [ی قورمیش]، کە سەیفو عەزیز ئاغا بۆ سەیرانو ڕابواردن دەچوونە ئەو جێگایانە (ل٥٠)....

گوندێك بەناوی "یەنگی کەند"یش لەو ناوچەیە هەیە (ل٥٠)....

"چل ئەسحابە" و "بنەی دوندی" ناوی دوو کێوی ئەو ناوچەیەن، (ل٥٠).

* نوسخەی حەسەنی قازیش ئەم دێڕە لێك دابڕاو و جیاجیایانەی سەبارەت بە شێعرەکە تۆمار کردووەو پێش هەموو شت، عینوانی شێعرەکەی بەم شێوەیە نووسیوە:

ششم صیام در خانقاه سعادت بەیاد

عزیز از جان عزیزترم گفته شد، ١٣٥٢ [١٩٢٣ز]

لە کۆتایی دێڕی ١٨دا ئەم عیبارەتەی نووسیوە:

((ششم صیام درخانقاه)) [١٩٢٣/١٢/٢٤ز]

لە کۆتایی شێعرەکەشدا ئەم دێڕە نووسراوە:

در رضائیه، ١٤ ذیحجه تحریر شد، ١٣٥٢ [١٩٣٤/٣/٣١]

(٨)

١. عەزیز! ئارەزووت زۆری بۆ هێنام
فرمێسکم سوور بوو، زەردی ڕووی لێنام
٢. دیسان بە ئاوری دووریت کەوتمە گیر
دنیام لیَ سارد بوو، بوو بە زەمهەریر
٣. دنیا هێند پڕ بوو لە بەفرو سیخوار
فرمێسکی سوورم بە سپی هاتنە خوار
٤. تا ناهومێد بووم لە هاتنی زووت
جەرگم بوە پۆلوو، هەناسەم بزووت
٥. هەوا بە حالّم وەك هەوران دەگری
بە تەرزە و بەفر و باران و هەوری
٦. عەرزیش لە بۆ من هێندی قوڕ پێوا
بەهاری لەگەلّ زستان لیَ شێوا
٧. گیاو گوڵی مێرگان بۆم سیس و زەرد بوون
بۆ شینی کێوان، کەوان هەمدەرد بوون
٨. داری مێشەو باغ بەفر داپپۆشین
لێك دەڵێی مردوون، کفنیان پۆشین
٩. شینی بەهارە، عاسمان هەر دەگری
هەوریش نالّە نالّ ڕووی خۆی دەپچڕی
١٠. با، لەکێوو دەشت خۆلّ وەسەر دەکا
گریانی کێوان بەحران پڕ دەکا
١١. کەوی کوێستانان لە قاسپە کەوتن
بێهۆش بوون یاخۆ، خەویان لیَ کەوتن
١٢. چیرەو زریوەی جوڕڕە و چۆلەکە
نایێ، نەیانما هێلانەو هێلکە
١٣. لەگلەگ لە گل کەوت، نەما تەق تەقی
سێرووش لە سیرەو فیتوو و چەق چەقی

١٤. پاك پەشيمانن لە بۆ گەرمێنێ،
بۆچ دەهاتنەوە؟ عەمروو نەمێنێ!
١٥. قاز لە شەتاوان قاڕەی لێبڕا
دوڕنای چۆماوان زوڕنای لێدرا
١٦. لە درزی عەرزی، هەوێردە دامان
بێهۆش بوونەوە، سڕبوون لە سەرمان
١٧. لە سەرمان، سەریان کێسەڵو ڕەقە
بردە بەر خۆیان، بێ تەقەو ڕەقە
١٨. وشك بوو دووپشك- ئەو کوێری ناڕاست
مشك کونی خۆی بە ئاوات دەخواست
١٩. بۆق- کە دەیقڕاند، لەوێی کردەوە
کەریش زەڕینی لەبیر بردەوە
٢٠. مار پاپۆکەی خوارد، خۆڵی وەسەر کرد
توێژی کۆنەو نوێی لەبەر خۆی دەکرد
٢١. ڕێوی کەوڵی خۆی ئاوەژوو دەکرد
ژووشك ئارەزووی کەوڵی مووی دەکرد
٢٢. لاڵ بم نابیبێم لە چیا و لە ڕازان
زیرەی هەڵۆیان، چریکەی بازان
٢٣. لە بن بەردان مان هەر سەرمازەڵە
لە باغو باغچان قەلو قشقەڵە
٢٤. پووشی داپۆشی، داڵدەی پاك بڕی
کەروێشکیش ڕیشەی پاك کردو بڕی
٢٥. بەفری بێ وەعدە ڕەشانگی بڕی
ڕەشانگو سپی پاکیان سەر بڕی
٢٦. سەر بڕا گاشین پاش مانگا بۆرە
لە باتی "گاران ڕۆیی" گا بۆرە
٢٧. شینو شەپۆڕە لەنێو ڕەعیەتی

بەبا چوو ڕەنج و سەعی و زەحمەتی

٢٨. شەماڵ و زریان دایم شەڕیانە

ئاغاوەت شڕن، کرمانج قڕیانە

٢٩. ڕۆژ هەتا شەوێ، گەورەو بچووکیان

خێزانی ماڵێ، گەورە کچ، بووکیان

٣٠. خەریکن لە باغ فریزوو دەردێنن

وەک شەونمی گوڵ ئارەق دەڕژێنن

٣١. ئارەق لە هەنیان بەڕیز بژمێرە

کێ دی لە عاسمان بە ڕۆژ، ئەستێرە؟

٣٢. لە دەوری سەریان، دەسرۆکەی هەوری

وەک مانگی چاردە، لەنێوان هەوری

٣٣. کەوتە سەر پیلیان چارەکەی نوێژێ

کەشە هەوری کرد لە دەورەی ڕۆژێ

٣٤. زولفان لە ڕوویان وەک ڕەشمار دەخشان

شەو، بوون وەک شەوە، بە ڕۆژ دەدرەخشان

٣٥. قەدو بالأیان وێنەی نەمامان

کێ دی نەمامان بگرن شەمامان!

٣٦. دەسماڵی ملیان، پشتێندی شلیان

چنارو لاولاو، چاوی بەکلیان

٣٧. زولفان لەسەر شان، لێک پرژان، ڕژان

لەشکری چین و ژاپۆن تێک چرژان

٣٨. بە لەرزە دەچنە فریزوو چنینێ

گریانە کاریان جێی پێ کەنینێ

٣٩. بۆ چنینەوەی جوان کەڵەکەی دەکەن

پۆلی کەوان وان، کە چینەی دەکەن

٤٠. پاچ و پێمەڕەو بێڵ لەسەر شاندا

وەک فەوجی حازر لە ژێر فەرماندا

٤١. هێندە لاوازن مەڕو ماڵاتیان

قوربانی ناکرێ، نادرێ زەکاتیان

٤٢. گا، لەبەر لەڕێ هەڵناگرێ نیری

نە مەڕ ماستی ما، نە مانگا، شیری

٤٣. لۆك چەمبەرەی بوو، ماین مشمشە

گا، گوێڕەپەی گرت، گامێش خشخشە

٤٤. کەڵ و گامێشان بوونە چەکچەکی

وشتریان بەعەین بێچووی لەگلەکی

٤٥. لەبەر بێ هێزی، لە ترسی سەرما

پشتێند لە پشتدا هەموو جل کرا

٤٦. بزن و مەڕ ڕووت بوون وەك سوورە ساقە

یەك دانوو دەیکوشت، یەك بەلە باقە

٤٧. زستانی ئەوساڵ دیارە پێنج مانگە

مەڕو کاو گیاو جۆ، بڕا لە دانگە

٤٨. نایە فیتووی شوان لەسەر شەوێنێ،

مێگەلان چێشتان لە کوێ دەنوێنێ؟

٤٩. کوان شەنگە بێری لە چیاو کوێستانان

شڵقەی مەشکەیان بەری بەیانان

٥٠. قۆڵیان هەڵدەکەن دەڵێی بلوورە

سینگیان دەردەخەن، پارچێك لە نوورە

٥١. دەرزی بەرۆکیان کە دێن دەربێنن

ڕۆژ لە عاسمانێ بۆ عەرزی دێنن

٥٢. زولفیان لابەلا دەکەن بەلادا

ڕۆژ هەوری لەسەر ڕووی خۆی وەلادا

٥٣. دێهاتی لێك دەی چادر و هۆبانێ

دەست ناکەوێ ڕۆن بۆ چەورەسانی

٥٤. وەدەست ناکەوێ ماست بۆ هەوێنی

دۆی هەڵگێڕیەوە، یا بیکوڵێنی

٥٤. پەنیر بو[ە]  ئیکسیر، شیر ئاوی حەیات

هەروەك ئەسکەندەر کەوتینە زوڵمات

٥٥. شەماڵ‌و زریان دایم شەڕیانە

ئاغاوەت شڕن، کرمانج قڕیانە

٥٦. زستانی ئەوساڵ دیارە پێنج مانگە

مەڕو کاو گیاو جۆ، بڕا لە دانگە

٥٧. تەویلە و هۆڵ‌و هەیوان هەڵوەشان

خرا بەر مەڕی لە دانگەو حەوشان

٥٨. پووش‌و ئالاش‌و قامیش دەرکشان

درا بە گاڕان وەك وێنجەی نوخشان

٥٩. کرمانج، دەوڵەتی پڕو پاتاڵ بوو

کۆچی دێ بە دێی بە مانگ‌و ساڵ بوو

٦٠. ئەویش لە دەس چوو، چیدی کۆچ مەکەن!

کای سەرەو نوێ کەن، جووتی چا بکەن!

٦١. قیمەتی کایە وەك کارەبایە

بۆ بە قووتی ڕۆح وێنجەی سەحرایە

٦٢. حاسڵی عومروو– لە زۆرو کەمی

داتان بەکاو گیا لەنێو عەجەمی

٦٣. باغان دابنێن، داران بنێژن!

نەجیب‌و ئەسڵن، کۆن‌و لەمێژن

٦٤. حەیفە میللەتێ شەش هەزار ساڵ بێ

نۆکەری ماڵان، ڕووت‌و ڕەجاڵ بێ

٦٥. چیدی دوژمنان بەخۆو خۆش مەکەن!

بووزو و کەپەنك بالا پۆش مەکەن!

٦٦. تاکەی لە دەرکان کزو بلاو بین؟

بێ مەزن‌و گەورە، سەر بێ کلاو بین

٦٧. نۆکەریی ماڵان شەرمە لە بۆمە!

کۆڵان هەڵگرین بە کۆمە کۆمە

٦٨. هەر کەس ئارەزووی ماڵانی هەبێ

وەجاغی کوێر بێ، منداڵی نەبێ!

٦٩. ئەو بەدبەختییەی لە کورد ڕووی دابوو

لەبەر نەخوێندن کۆزیان ساوا بوو

٧٠. واجبە خوێندن بۆ دنیاو دینێ

پێغەمبەر فەرمووی بۆ چوونی چینێ

٧١. بە کوتەو شانامان میللەت دەمێنن

بە مەزن و گەوران شان دەشەکێنن

٧٢. دەردی دڵ دەکەم کورت و کرمانجی

"حەسەن" کرمانجە، چی لە دیلمانجی!

٧٣. پووش و ئاڵاش و قامیش دەرکشان

دران بە مەڕی وەك وێنجەی نوخشان

٧٤. کای زەردو ڕزیو بەلیرەی سوورە

وێنجەی ڕەش و شین پێستی سەموورە

٧٥. ڕێی کاکێشانێ وەك کەهکەشانە

قەتاری وشتر وەك ئەستێرانە

٧٦. لاڵ بم نابینم خێڵ سەرەو خواران

تەقڵەو ڕمبازی و هەوهەوی سواران

٧٧. کوا "پیرۆت ئاغا"- سەرخێڵی کوردان؟

لە "قوڵە سەنی" ڕا بچێ بۆ کوێستان

٧٨. لە کوێیە "تاغی"- ئەو چادری جوانی؟

تیپ تیپ میوانی سەر سفرەو خوانی

٧٩. کوانێ "سەید سەمەد"- ئەو مەردی ڕەشید؟

بۆ "ماین بلاغ" بچێ بە تەمهید

٨٠. "خەسرەو"یش جوانەگا ڕەشی مندار بوو

خواردنی فریزوو، گەڵای بن داربوو

٨١. دەگەڵ "غونچێ" گیان شینیان دەگێڕا

"قادر"و "ساڵح"یان دە سەر دەگێڕا

٨٢. کەرە بۆزیشیان لەسەر وەستایە

کوڵی گریانیان لە ئەوکی دایە

٨٣. تازەماڵەکان داخودا چلۆنن؟

ئەوانیش خەریکی فریزو و کاکۆنن؟

٨٤. دڵت تەنگ نەبێ، تفاقت هەبێ

ئەوی تۆی نەوێ، یاخودا قەت نەبێ!

٨٥. "عومەر" و "عوسمان"، "بووبەکر"ی نازدار

بەناز گەورە بن، هانامە چوار یار

٨٦. جێژنی قوربانە، خۆم قوربان دەکەم

جێژنە پیرۆزەی عەزیز گیان دەکەم

٨٧. تاریخ هەزارو سێسەدو دوازدە

بیستی فەروەردین نەچێ لە یادە.

پەراوێزەکانی پارچە شێعری ژمارە ٨:

٣. دنیا وا پڕ بوو

٤. بۆ پۆلوو

٥. وەك کێوان

٦. دەگەڵ زستان

٧. گیاو گوڵی (؟)

٨. پاك دەڵێی/ کفنیانی

١٢. چیرەو جریوەی

١٣. لەگەڵ کەوت/ سێرووش

١٨. ویشك

٢٠. خۆی دەخۆڵ دەگرت

٢١. لەبەر خۆی دەکرد/ کەوڵی مووی ئارەزوو دەکرد

٢٢. نابيسم

٢٦. له باتى گاڕان، ڕۆڕۆى گا بۆره

٣١. بەڕێز

٣٧. زولفيان لەسەر شان تێك چڕژان، پرژان

لەشكرى چين و ژاپۆن تێك ڕژان

٣٨. فريزو و چنين/ پێكەنين

٣٩. بۆ چنينەوەى

٤١. ناكرێن

٤٢. لەبەر كزى

٤٥. پشتێنديان بەستن،

٤٨. نايێ فيتەى/ چێشتاو

٥٠. سينگيان

٥١. له عاسمان ڕا

٥٢. زولفان

٥٣. دێهاتى لێك دەى/ وەدەست ناكرێ ڕۆن

٥٤. پەنير بۆ/ سيرئاوى حەيات/ وەكوو ئەسكەندەر

٥٧. تەوێڵە و هۆڵ و هەيوان هەڵوەشان

پووش و ئالاش و قاميش دەركشان

٥٨. درا بە گاڕان وەك وێنجەى نوخشان

خرا بۆ مەڕى لە دانگەو حەوشان

٦٠. جووتى زۆر بكەن

٦١. بۆتە قووتى ڕۆح

٦٢. گياو كا

٦٣. عەسڵن

٦٤. حەيفە ميللەتێ هێندە هەزار ساڵ

نۆكەرى ماڵان، پێ ڕووت و ڕەجاڵ

٦٥. بەخۆ

٦٦. گەورەو

٦٩. ئەو بەدبەختییە

٧١. شاران دەستێنن

٧٣. لەتی یەکەمی ئەم فەردە لەتی دووهەمی فەردی ژمارە ٥٧ ە کە لە دەقی قازی ئەحمەد وەرگیراوە. لەتی دووهەمیشی لە ڕاستیدا لەتی یەکەمی فەردی ژمارە ٥٨ بوو، بەڵام لەبەر هۆی جیاوازییەکانیان بە باشم زانی هەردووکیان لێرەدا بهێنم.

٧٦. بەروو خواران

٨٠. خەسرەویش جوانە، گاڕەش مندار بوو

٨١. خونچە گیان/ ساڵح و قادریان

٨٢. ئەوکێ

٨٣. تازە ماڵی تۆ داخودا چۆنن؟/ خەریك

٨٧. تاریخ هەزارو سێسەت و چاردە

لە دەقی دەستنووسێکدا کە لای منە، "هەزارو سێسەدو دوازدە" نووسراوەو لە دەقی قازی ئەحمەددا "هەزارو سێسەت و چاردە"، بەڵام لە هەردووکیاندا٢٠ی فەروەردینە.

٢٠ی فەروەردینی ١٣١٢ی هەتاوی، دەکاتە ١٩٣٣/٤/٩

٢٠ی فەروەردینی ١٣١٤ی هەتاویش دەکاتە ١٩٣٥/٤/٩

ئەم فەردانە لە دەستنووسەکەدا نەدەبینران و من لە بەر دەقی چاپکراوی قازی ئەحمەدم نووسینەوە:

٤٣، ٥٥ تا ٥٨ واتە ٥ فەرد.

نوسخەی قازی ئەحمەد ئەم زانیارییانەشی سەبارەت بە شێعرەکە ڕاگەیاندووە:

"دیسان بۆ عەزیز ئاغای کولتەپە (ل٥١)..."پیرۆت ئاغا"، ئاغایەکی دەوڵەمەندو مەڕداری دێبوکری دانیشتووی گوندی قوڵەسەن و "سەید سەمەد" مەڕدارێکی ناوچەی میاندواو بووە. "ماین بلاغ"، کوێستانێکی زەنوێرو پڕ بەرەکەتە، کەوتۆتە نێوان میاندواو و ناوچەی هەوشار. "تاغی" مەڕدارێکی نێو بە دەرەوەی ناوچەی موکریان.... "خەسرو"و "خونچە"، ژن و مێردێك بوون لە گوێگجەلی و "ساڵح"و "قادر" مناڵی ئەوان بوون.... عومەرو عوسمان و بووبەکرو عەلی، کوڕی عەزیز ئاغا

بوون"[ عەزیز ئاغا کوڕێکی بەناوی عەلی نەبووە، بەڵام کوڕێکی دیکەی ناوی "ئەحمەد" بووە.] بەپێی قسەی حەسەنی قازی، ئەو خەسرەوە ناوبانگی خەسرەو کەڵوێیی و دانیشتووی گوندی "گوێگجەلی" بووە.

*نوسخەی حەسەنی قازی سەرجەمی فەردەکانی (٥٤)ە و ئەم یادداشتەی گرتۆتە بەر: ((ئەم مەسنەوییە لە ساڵی هەزارو سێسەدو دوازدەدا کوتراوە)). پاشانیش ئەم ڕستە فارسییە: ((٢٣/٧/٢٠ در زرین ده نوشته شد.))

سەبارەت بە خاڵی یەکەم، واتە ١٣١٢ سەرەوەتر، هەر لەم بەشەدا هەندێك ڕوونکردنەوەم ڕاگەیاندووەو لەمەڕ خاڵی دووهەمیش دەبێ بڵێم سەیف لەبەر نووسینەوەی شێعرەکەی خۆی بە فارسی ڕاگەیاندووەو ئەوەش بە ٧ ساڵ بەدوای گوترانی شێعرەکە بووە. سەبارەت بە "زرین ده" دەبێ بڵێم ڕژێمی پەهلەوی وەك ناوی کوردیی لەسەر شارو گوندەکان پاك دەکردەوەو ناوی داسەپاوی فارسیی دادەنا، هەر ئەم کارەی لەگەڵ ناوچەکانی دیکەی ئێرانو بە زۆری لەگەڵ ئازەربایجانیش دەکرد. گۆڕانی ناوی تورکی گوندی گوێگجەلیش بۆ "زرین ده" یەك لەو کارە چەپەڵانە بووەو وێدەچێ لەو سەردەمەدا، ئەم کارە وەك چارەنووسێك سەیر کرابێت کە نەتوانرێ دژایەتی لەگەڵدا بکرێت.

## (٩)

١. زۆر توولی کێشا، "عەزیز"، هیجرانت!
لاڵ بم نابینم مەیلی جارانت
٢. چ قەوما ئەوساڵ لەبەرچاو کەوتم؟
چلۆنت دڵ هات لە دڵ دەرکەوتم؟
٣. لە چێشتانێرا تا بانگی شێوان
چاوم لە ڕێدا، لە دەشتو کێوان
٤. چاوم هەر لە ڕێی "کانی کووزەڵە"
دنیام لەبەرچاو تەمو دووکەڵە
٥. سالآن هەر مانگێك، مایەی حەیاتم!
یا تۆ دەهاتی، یا من دەهاتم
٦. هەر هاتە هات بوو ئەوساڵ، نەهاتی
ئەویش بەدبەختیتم، مایەی نەهاتی
٧. شەوگاری دووریت وشکە سەرمایە
لە بەختی ڕەشمە، باش ڕەشە بایە
٨. هەمڕازی شەوێم فیکرو خەیاڵت
ڕەفیقی ڕۆژێم یادی جەماڵت
٩. ژینی بەبێ تۆم ناخۆشو تاڵە
وەتاغم زیندان، ماڵم پێ چاڵە
١٠. هەناسەی ساردم، فرمێسکی گەرمم
بەستوویە لەسەر ڕووی زەردی نەرمم
١١. شەوانم شینو گریەو ڕۆڕۆیە
ژیربوونی ڕۆژیم بە بۆنەی تۆیە
١٢. ڕاستت پێ بڵێم "عەزیز"، براکەم!
ناژیم، نامێنم، بێ تۆ هەڵناکەم.
١٣. موژدەی هاتنت "ئەولێ" پێی داوم
بەو بۆنە دەژیم، هەر بۆیە ماوم

١٤. هیلالی ئەبرۆت چونکە نەبینرا
جێژنمان تێك چوو، ڕۆژوو نەگیرا
١٥. ڕۆژووشم بێ تۆ لێ قەبووڵ نابێ
سەرفترەش بدەم، سەرم چا نابێ
١٦. نوێژو ڕۆژووی تۆ یاخودا قەبووڵ بێ
جێژنت مبارەك، حەجت وسووڵ بێ
١٧. لە ئینتیزاریت عەیشم نەماوە
هەر لەحزێك "حەسەن" سەد جار کوژراوە
١٨. زووتر نووسیبووت لە دەی دوایە
کە دێم و دەچین بۆ خانەقایە
١٩. ئەو دەیە ڕۆیی، ئەوا دەی دیش هات
دەی مانگیش گەیی لەسەرمان نەهات
٢٠. ئەوە دوو ساڵە مەحروومم لەوێ
بەحاڵی من بێ هەر کەس تۆی نەوێ
٢١. هەر کەس بە تەمای دین و دنیا بێ
دەبێ لەو دەرکە خاکی دەرگا بێ
٢٢. قیبلەیە بۆمە، زۆر لەمێژ ساڵە
ڕووی لێ وەرگێڕین، نوێژمان بەتاڵە
٢٣. فیکرو وەسوەسەو خەتەرەو خەیاڵ
نامێنێ لەوێ خواردنی حەلاڵ
٢٤. دڵ وەك ئاوێنە جەلای هەڵدێنێ
ژەنگی گوناح و ژاری نامێنێ
٢٥. جێگاو بارەگای شەمسی بورهانە
شەیتان وەك شێتان لێی سەرگەردانە
٢٦. ڕۆژ، لە عاسمانێ دنیا پاك دەكا
ئەو، لە ژێر عەرزی دین ڕووناك دەكا
٢٧. فەرقی دەگەڵ ڕۆژ، عەرزو عاسمانە

دنیا ڕادەبڕێ، مایەی دینمانە

٢٨. بۆ خۆی فەرموویە: "ئەو بستە خاکە

مەنعی بەرەکەت، قەت لەنگۆ ناکا

٢٩. لە پاش من خۆتان بە کەس مەسپێرن،

خوێنوو بڕێژن، ڕوو وەرمەگێڕن"

٣٠. چەن خۆشە خەتمی پاش نوێژی شێوان

فەیزو بەرەکەت، جەزبەو پەشێوان

٣١. نوێژی سبەینان، پاش خەتمی قورئان

لە سوورەی یۆسف یا ئالی عیمران

در تاریخ ١٣١٤/١٠/١٢ بدست شاعر نوشته شده بود که از روی آن نسخه برداشته شد. ١٥/٦/

**پەراوێزی شێعری ژمارە ٩:**

سەرجەم ٢٧ فەردە + یەك فەردی نوسخەی حەسەنی قازیو قازی ئەحمەد.

یەك لە نوسخەکانی بەردەستی من ئەم سەردێڕەی بۆ شێعرەکە داناوە کە من هێنامە پەراوێزەوە:

«فیدات بێ حەسەن بتاریخ ١٤/١٠/١١ [ ١٣] » ئەو ڕێکەوتە بەرانبەرە لەگەڵ ١٩٣٦/١/١.

١. بەینی جارانت

٥. سالآن هەر مانگێك

٦. ئەوساڵ

٧. دەورانی دووریت

٩. لێ چاڵە

١١. شەوانم شینو گریو ڕۆڕۆیە

ژیر بوونی ڕۆژم بۆ هاتنی تۆیە

١٤. ڕۆژم نەگیرا

٢٣. یانەی دینمانە

٢٦. جەزبەو پشتیوان

٢٨. دەرکی

نوسخەی قازی ئەحمەد:

((دیسان بۆ عەزیز ئاغای کولتەپە)).

نوسخەی حەسەنی قازی هەر ئەم عینوان و ڕێکەوتەی بۆ شێعرەکە داناوە.

فەردی ژمارە ٢٤ لە نوسخەی قازی ئەحمەد وەرگیراوە.

ئەم شێعرە، لە دیوانی چاپکراوی قازی ئەحمەد دا پاشماوەیەکی ٢٣ فەردی هەیە، کە لێرەدا جیا کراوەتەوەو بەشێوەی سەربەخۆ دانراوە. بڕوانە پەراوێزی شێعری "بۆ جێژنی ئازادی" بەم مەتلەعە:

((ئەگەر دەپرسی باسی ئەو ناوە
حوکمی ئازادی ئیعلان کراوە))

ڕێکەوتی ١٣١٤/١٠/١٢ بەرانبەرە لەگەڵ ١٩٣٦/١/٢ ی زایینی

١٣٣٧/٦/١٥ ش ئەگەر بە کۆچی هەتاوی وەربگرین بەرانبەرە لەگەڵ ١٩٥٨/٩/٦ی زایینی کە ١٤ ساڵێك دوای کۆچی دوایی سەیفەو ئەگەر بە کۆچی مانگیشی وەر بگرین بەرانبەر دەبێت لەگەڵ ١٩١٩/٣/١٩ی زایینی.

بەهۆی ئەو ڕاستییەوە کە ڕێکەوتەکە هی نووسرانەوەی نوسخەی شێعرەکەیە، هەردووکیان گونجاو دەبن. ساڵی ١٩١٩ کە هەندێك ویچووترە، بەڵام یەك تەنگژەی تەکنیکی هەیەو ئەویش ئەو ڕاستییە کە ڕێکەوتی کۆچی مانگی بەناوی مانگەکەوە دەنووسن نەك بە ژمارەی مانگ، کە لێرەدا مانگی ٦ بێت. مانگی شەشەمی ساڵی کۆچی مانگی "جمادی الاخر"ە.

(١٠)

١. ئەگەر دەپرسی باسی ئەو ناوە،
حوکمی ئازادی ئیعلان کراوە
٢. حوکمی دەولەتە ڕوو قەت نەگیرێ
پێچ بپێچنەوە، حیجاب هەڵگیرێ
٣. لایان دا خانمان، چادری ڕەش لەسەر
وەك ڕۆژ لەژێر هەور سەریان هێنا دەر
٤. چارشێویان لادا لەسەر گۆنای سوور
دەرکەوتن سینگ‌و باسکی وەك بلوور
٥. نێو سینگ‌و مەمك‌و قەدو باڵایان
چەند جوان دیارن ئاڵ‌و واڵایان
٦. بەو چلەی زستان ناخۆش بێ بێتۆ
هەرزان بوون سێوو هەنارو لیمۆ
٧. باسك دەرخران، بەرۆك هەڵدران
قەد باریك کران، کەفەڵ هەڵخران
٨. هەروەك عاسمانە ئەوڕۆ خیابان
ورشە ورشیانە مانگ‌و ئەستێران
٩. چوار چوارو سێ سێ، بەجووت دێنە خوار
تاوسن، بازن، شەهێن‌و شمقار
١٠. کەون، کۆترن، قورینگن، پۆڕن
مامزن، ئاسکی ناسکی چاو شۆڕن
١١. هەر عەیش‌و بەزم‌و شەوق‌و شادییە
وەك حۆرین، بیری مردنیان نییە
١٢. پەرچەم لەسەر ڕوو پرش‌و بڵاون
وەك مسك‌و کافوور تێکەڵ کراون
١٣. حەبەش‌و ڕۆم‌و زەنگی شەڕیانە
زولف‌و خاڵ‌و ڕوو، زەدوخوردیانە

١٤. له دواوه دەستەی زولفان سەر بڕان
سەر، شانە کران، پەرچەم هەڵکران
١٥. بۆ فوتباڵ دەچن، سیرك و تیاتر
کچ له پێشەوە، کوڕان له دواتر
١٦. کچ و کوڕ تێکەڵ، هەروەك شەکرو شیر
پیاو وژن، ژینیان وەك یەك جوان و پیر
١٧. وەرزشێ دەکەن، زۆرانێ دەگرن
عەیب و عار نەما، نابێ تێك فکرن
١٨. باسك ڕاست دەکەن، خۆ دادەنوێنن
سینگ ڕەپێش دەخەن، لاقان هەڵدێنن
١٩. ئەو جار هەر کەوتن بۆ کوڕ لایقە
له ژێر و له سەر، هەر ئەو فایقە
٢٠. ژن و پیاو وەك یەك زەحمەت بکێشن
فەرەنگی بەوەی لێمە له پێشن
٢١. سیلاح هەڵگیران، سجیل وەرگیران
بۆ دوو ساڵ خزمەت بە سەرباز گیران
٢٢. سەرڕووتی و مەستی، جەڵدی و تەڕدەستی
ڕەقس و هەڵپەڕین له بڵیندو پەستی،
٢٣. فوتباڵ و وەرزش، بازدان و پەڕش
له خیابان و باغ، سەیران و گەردش
٢٤. له دانیشتندا کڵاو نەماوە
کڵاو داگرتن له جێی سڵاوە
٢٥. ئەوانە مۆدن بۆ عەسری حازر
ویۆڵۆن و پیانۆ، ڕادیۆو تیاتر
٢٦. عەباو عەمامە کەمیان بمێنن
مەلایان چیدی خۆیان نەنوێنن
٢٧. نوێژو ڕۆژوو و حەج، سەرفیترەو زەکات

خەتمو تەهلیلەو خێرو حەسەنات

٢٨. تەکیەو خانەقا، مەدرەسەو مزگەوت
دەرکیان بەستران، پاکیان پەکیان کەوت

٢٩. نابینم نوێژو جومعەو جەماعەت
بۆچ نابینێم بانگو ئەوڕادو قامەت؟

٣٠. کوا حەڵقەی دەرسی مەلای لادێیان؟
کوا دەورو "ئالی بابا"ی فەقێ یان

٣١. کوا حەڵقەی زیکری دەروێشی غەوسی
کوا شوغڵو خەتمی سۆفی ئوەیسی؟

٣٢. وا ئیجاب دەکا ئەوڕۆ زەمانە
دنیا، ئاخری هیچو نەمانە

٣٣. تەئریخ هەزارو سێسەدو چاردە
دەی مانگە، دنیا زۆر وشكو ساردە

اشعار فوق از روی نسخەایکە بخط خود ابوالحسن سیف القضاة قاضی ظاب... ٣٧/٦/١٥ [ ١٣] [بەرانبەر لەگەڵ ١٩٥٨/٩/٦ی زایینی] نوشتە شد

پەراوێزی شێعری ژمارە ١٠:

٢. پیچی پێچنەوە

٥. نێو سینگو مەمك قەدو باڵایان
چەند جوان دیارن حوسنو کاڵایان

٦. هەرزان بوو

١٢. مشكو کافوورن تێکەڵ کراون/ وەك مشكو کافوور

١٣. حەبەشو ڕۆمو

١٤. هەڵدران

١٥. فودباڵ/ سەیرو تیاتر

١٧. عەیبو عار نییە

١٨. دەست بڵاو دەکەن/ وەپێش دەخەن
پێش ڕەپێش دەکەن
١٩. ئەوجار هەر گرتن/ هەر کوڕ فایقە
٢٠. دەکێشن/ ژن و پیاو
٢٢. سەنعەتی دەستی و/ ڕەقس و هەڵبەزین
٢٣. فودباڵ
٢٥. ئەوانە چاکن/ ڕادوێ و
٢٦. عەباو عەمامە/ مەلایان چی دی
٢٨. دەرکیان بەسترا/ تەکیەو خانەقاو
٢٩. نابینم بانگ و
٣٠. ئالی بابیەی
٣١. ئەم فەردەم لە کەشکۆڵی بابەوەیسی وەرگرتووە.
٣٣. ئەم فەردەشم لە کەشکۆڵی بابەوەیسی وەرگرتووە.

ئەم شێعرە سەرجەم، لە دیوانی چاپکراوی قازی ئەحمەددا وەك درێژەی شێعرەکەی پێشتر هاتووە:

((زۆر توولی کێشا عەزیز! هیجرانت...)).

بەگوێرەی دەسپێکی شێعرەکەش هەست دەکرێت درێژەی ئەوبێ، بەڵام هۆی ئەوەی من جیا لەوم تۆمار کرد ئەوە بووە کە لەناو دەستنووسەکاندا بەشێوەی سەربەخۆ دانراوەو لەسەرەتاکەشیدا نووسراوە:

"بۆ جێژنی ئازادی".

گەرچی شێوە خەتی ئەو عینوانە، لە شێوە خەتی نووسەرەوەی شێعرەکە جیاواز دەنوێنێت بەڵام من ویستم ئەمانەت بپارێزم و لێکیان جیا ڕابگرم. خوێنەر دەتوانێ پێوەندیان بەیەکەوە بدات و پێکەوەیان بخوێنێتەوە.

نوسخەی حەسەنی قازی ئەم عیبارەتەی لە کۆتایی شێعرەکەدا داناوە:

((بتاریخ ٢١/١/٢٠ [١٣] = [١٩٤٢/٤/٩] در تهران نوشته شد
اقل ابوالحسن سیف القضات قاضی))

(١١)

١. یادم بۆ ناکەی؟ یادت بەخێر بێ!

وەعدەی زوو هاتن وەختە زۆر دێر بێ

٢. هێندەم تەماشای ڕێی هاتنت کرد

چاو، خێڵ بوون لەسەر سەربان و سەرگرد

٣. ڕێگای "کولتەپە" دوورو درێژە

هاتنی "عەزیز"م یەکجار لەمێژە

٤. "حەسەن" لە دووریت نەخۆش و گێژە

تا مابووم نەمدی، هاتی بینێژە!

٥. دەردی بێدەرمان هەر دووری تۆیە

بە بایەك دەمرم، دەژیم بەو بۆیە

٦. دەردێکی دامێ دەرمانی نەکرد

شەماڵ بە بەفری کوێستانی نەکرد

٧. ژینم پێ خۆشە، دڵم پێی خۆشە

کە تۆم لێ دیار بێ لەبان و حەوشە

٨. فرمێسکم لە چاو دەڕژێن لە دوو دوو

ئەولام تەتەهوو، ئەم لام جەغەتوو

٩. ژینم بە بۆنەی "عەزیز"م خۆشە

هەر کەس تۆی نەوێ بێ هۆش و گۆشە

١٠. دۆستی و ڕاستی پارچێك بوو، کرا

بە بەژن و باڵای بەرزی تۆ برا

١١. لە دەردی دووریت خۆم دەغافڵێنم

چنار لێ دەدەم، پەل دەچەقێنم

١٢. لە "گوێگجەلی" ڕا جۆی جۆماڵ دەکەم

لە "مشیرئاباد"ێ ئاش بەتاڵ دەکەم

١٣. لە "عەبدوڵڵا باد" باغی بادامان

زۆرم چەقاندن دەستم بەدامان

١٤. "کانی کووزەڵە" هەروەك خۆیەتی
"حوسێنی حاجی" هەر بۆ خۆیەتی
١٥. شوکر کوڕەکان ئەوێستا چوارن
لە پەنای خوداو حیفزی چوار یارن
١٦. "عومەر" و "عوسمان"، "بووبەکر"و "رەحیم"
بیان بەخشێ پێمان ڕەحمانی کەریم
١٧. "بورجی بەڵەك"ی بەر دەرکێت ماوە؟
یا بەبای دوێنێ و پێرێ ڕووخاوە؟
١٨. خەڵوەتی ڕووخاو، چاکت کردەوە؟
"وەستا مەمەد"ت لێرە بردەوە؟
١٩. چت کرد؟ چەقاندت باغی بەرماڵان
ڕیشەم حازرن هەرزان و تاڵان
٢٠. ئەگەر دەپرسی وەزعی زەمانە،
میللەت پەرێشان، ئامان ئامانە
٢١. کاری کوردەکان، خۆزگە بە پارە
هەر کەس بە دەردێك چوو، گرفتارە
٢٢. جەمعێك بە بیانووی "تەجدیدی نەزەر"
سەرگەردان کران لە قاپی و لە دەر
٢٣. لەتاو مەشموولی، کوردی موکریان
کچیان ئارەزوو، لەباتی کوڕیان
٢٤. مەشموولی خۆشە، زۆر موقەددەسە
نەك بۆ کەسێکی بێ گەورەو کەسە
٢. لە خەڵکی دەدەن: «سجیللت کوانێ؟»
ماڵی قاچاغیت لەسەر دووکانێ
٢٦. یەکیدی دەگرن: «کوانێ کڵاوت؟»
بۆچ لەسەر دەنێی شەدەی بڵاوت؟
٢٧. تووتنی نووسراوت بۆ کوێ بردووە؟

ئیمزای ماڵیەت کوا وەرگرتووە؟

٢٨. بە یەکێك دەڵێن: کوڕەکەت هەڵات،

دەبێ پەیدای کەی، ڕێی هات و نەهات

٢٩. گەنمی دەستێنن بە بیانووی قشوون

وشتر بە بێگار دەگرن بێ قانوون

٣٠. هاوار لە زوڵم و زۆری ئەمنیان

نیەی نازانن، نابییێ گوێیان

٣١. ئەوانە هەموو بیانوون بۆ پووڵی

بەبێ قانوونی و بەبێ ئوسووڵی

٣٢. هێندە پووڵ درا بۆ دەفعی شەڕیان

بەتاڵ بوون جەعبە(؟) و گیرفانی پڕیان

٣٣. نە ئاغاوەت مان، نە میرو مەزن

"هەرزن و بزن، چیایێ مەزن"

٣٤. خودایا! مەگەر کورد ئێرانی نین؟

لە ئینسان خاریج، مەخلووقێکی دین؟

٣٥. لەتام چۆتە دەر مەزلوومیی کوردان

خودایا! ڕەحمێ، بە چکۆلەو وردیان

٣٦. دەردی دڵ بەس کەین لە دەس ناکەسان

چون هەر خودایە کەسی بێ کەسان

٣٧. هەر کەس لە خۆیدا سەرداری نەبێ

حاڵی هەر وایە، ئاخری وا دەبێ

٣٨. بخوێنن چاکە هەتا دەتوانن!

بەڵکە تەکلیفی خۆتان بزانن

٣٩. ئەگەر حەز دەکەن یەکجاری نەمرین،

بەیەك دی شاد بن، لە بۆ یەك بگرین!

٤٠. قەت بەخراپی نێوی یەك مەبەن!

ڕەنجی شان و قۆڵ بە هەدەر مەدەن[٢]!

٤١. چاوان لە نەویان هەرگیز مەگێڕن!
لە بڵیندان بانگ کەن، ئاوان هەڵگێڕن!
٤٢. گورگان بە کۆزی خۆتان فێر مەکەن!
سەی حیزو برسی بە دزی تێر مەکەن
٤٣. تاکەی لە دەرکان هەناسە ساردی؟
چاو لە دەس خەڵکی بە نامورادی
٤٤. هەڵناستن لە خەو هێند خەو گرانن
لە دوای مردنم قەدرم دەزانن.

١٦ شهریور ماه ١٣٣٧ [١٩٥٨/٩/٧] نوشته شد.

**پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ١١:**

٦. ئەم فەردە وێدەچێ فۆلکلۆر بێت، گەرچی دووریش نییە هەر شێعری سەیف بێ و نەمر محەمەدی ماملێ بە گۆرانی گوتبێتەوە. هەر چۆنێك بێت، ئەم فەردە لە دیوانی چاپکراوی قازی ئەحمەدیشدا، هاتووە.

٧. دڵم پێ خۆشە

٨. ئەم لا جەغەتوو، ئەولام تەتەهوو

٩. ژیان بەبۆنەی

١١. قەڵەم لێ دەدەم،

١٢. موشیرابات

١٣. عەبدوڵلابات/ چەقاندووە

١٥. ئێستا چوارن

١٧. یان بەبای

١٨. کردوە/ بردوە/ لەبیر بردەوە

٢٠. ئەمان ئامانە

٢٣. لە جیاتی کوڕیان

٢٤. خۆشەو/ بێ کارو کەسە.

٢٥. کوانێ کڵاوت؟/ بۆ چت لەسەر نا شەدەی بڵاوت؟

٢٦. سجیلت کوانێ؟/ماڵی قاچاغت لەسەر دووکانێ.

٣٠. لە دیوانی چاپکراوی قازی ئەحمەددا ئەم شێعرە نابینرێت.

٣٢. جیب و گیرفانی

٣٣. چیایە مەزن. ئەم نیوفەردەش وێدەچێ فۆلکلۆر بێت.

٣٤. خودایە!/ لە ئینسان بەدەر

٣٥. ڕوحمێك بەچووكەو/ وردان

٣٨. بخوێنین/ دەتوانین/ خۆمان/ بزانین

٣٩. یەگدی/ شادبین/ بمرین

٤٠. خراپی

٤١. بڵیندان

٤٢. زگی تێر مەکەن

٤٣. نامرادی

شێعرەکە، ئەم سەردێڕە فارسییەی هەبوو، من هێنامە پەراوێزەوە:

«از روی نسخەای کە در چهارم ذیحجە ١٣٥٣ [١٩٣٦/٢/٢٨] هجری کە بدست شاعر نوشتە شدە بود، نوشتە شدە است»

– کە دەبێ یادداشتی نوسخە هەڵگر بێت.

نوسخەی حەسەنی قازی لەجیاتی ئەو سەردێڕە فارسییە، ئەم سەردێڕەی هەیە:

"بۆ عەزیز ئاغای کولتەپە"

و لە کۆتاییشدا ئەم ڕستەیە دەبینرێت:

«ئەم شێعرە لە چوارومی زیحەجەی ساڵی ١٣٥٣ی هیجریدا هۆندراوەتەوە.» [١٩٣٦/٢/٢٨]

## (١٢)

١. "عەزیز" بەینێکە لێم بێ خەبەری
وەکوو بیستوومە لەم بەر ئەوبەرە
٢. جارێکی بیستم چووی بۆ "عەنبار"ێ
خۆشی خۆشیم بوو دێشی بۆ خوارێ
٣. پاشان وامزانی سوار بووی بۆ "سەرا"
ئەمنت هەڵبوارد لە خزمو برا
٤. مەگەر نازانی ئەمنیش براتم؟
ڕووناکیم هەر تۆی، مایەی حەیاتم!
٥. خۆزگەم بە زستان، بەفرو سەرماکەی
مژو سیخوارو کڕێوەو باکەی،
٦. کە هەمسەفەر بووین بەینێك پێکەوە
لەززەت ئەو وەختە، حەیات هەر ئەوە
٧. شەوی مەراغە چەن خۆش ڕابران،
چەندە سوحبەتی ڕۆحانی کران
٨. لە پاشان بە شەوق دەهاتم بۆ لات
بۆی خاکی دەرگات جار جار بۆم دەهات
٩. ئەو توف و بەندە لەکنم بەهار بوو
سەرمای ئێوارێی گەرمای نەهار بوو
١٠. کێوی "گامێشان" پردی سیڕات بوو
"کولتەپە"ش بەهەشت، جێگەی نەجات بوو
١١. هاتم، دابەزیم چوومە دیوانخان
بە کوورەو لامپا بوو بە چراخان
١٢. یادی بەخێر بێ کوورە گەرمەکە!
پاڵەوپشتکە، لێفە نەرمەکە
١٣. عەبدوڵڵا هەوای وەك بەهەشت لێ کرد
خۆش خۆش، بەخۆشی، هێند ئاوری تێ کرد

١٤. بەربانگ‌و پارشێو هەر نەوعە نیعمەت
دەگەڵ خوڵقی خۆش، بێ دەعیەو میننەت
١٥. زستان لە بەهار بۆ من خۆشتر بوو
گوڵی ئومێدم ئەودەم گەشتر بوو
١٦. "حەسەن" بە قوربان عەزیزەکانت
"عومەر"و "عوسمان"، "بووبەکر"ی جوانت

((تحریر شد روز یازده شهریور سال ١٣٣٧ خورشیدی=[ ١٩٥٨] ))
((نوشته گردید از روی نسخه‌ای که به خط شاعر در تاریخ ١٤/١٠/١٢ نوشته شده بود. =[ ١٩٣٦/١/٢]))

## پەراوێزی پارچە شیعری ژمارە ١٢:

١. لە دەستنووسەکەدا، "بێخەبەری" نووسراوە، کە لەگەڵ "لەمبەر– ئەوبەرە"دا نابێتە سەروا هەر بۆیەش من بە "بێخەبەرم"م نووسی، بەڵام شێوازی فەردەکانی دواتر نیشان دەدات کە دەبێ بێخەبەری بێت‌و بەم شێوەیەش بنووسرێت:

((عەزیز! بەینێکە لێم بێخەبەری))

هەر چۆنێك بێت، نووسەرەوەی شیعرەکە، هەڵەیەکی کردووە.

شاعیر شێعرەکەی لە ڕۆژی ١٣١٤/١٠/١٢، واتە ١٩٣٦/١/٢ دا گوتووە، بەڵام نوسخە هەڵگر لە ساڵی ١٣٣٧ی هەتاوی واتە ١٩٥٨ی زایینیدا شێعرەکەی نووسیوەتەوە.

نوسخەی حەسەنی قازی ئەم سەردێڕەی بۆ شێعرەکە داناوە:

((دیسان بۆ عەزیز ئاغای کولتەپە))

و لە کۆتاییشدا نووسیویە:

((ئەم مەسنەوی [المزدوج]ە لە ساڵی ١٣١٤/١٠/١٢[ ١٩٣٦/١/٢]دا هۆندراوەتەوە.))

لە نوسخەی قازی ئەحمەددا نەهاتووە.

(١٣)

١. چ خۆشە من نەخۆش‌و یاری دڵکەش
لە ڕێگەی لوتفەوە بمخاتە باوەش
٢. پەرێشانم لەبەر زولفی بڵاوت
نەخۆش‌و مەستی ئەو دوو نەرگسی گەش
٣. نیشانم دە، فیدات بم، جووتە خاڵت
لە ئەوەڵ نەردا چەن خۆشە دوو شەش!
٤. ڕوخی زەحمەت مەدە زولفی مەحەك ڕەنگ!
چ موحتاجە بەتۆ ئەو سیمی بێ غەش؟
٥. فیدای زولف‌و برۆو پیلوو و مژۆڵت
کەمەندە هەم کەمان، هەم تیرو تەرکەش
٦. بە دوودی ئاهی من ڕەشپۆشە گەردوون
بە ڕووتا خاڵ‌و پەرچەم بوون موشەووەش
٧. "حەسەن"! شوکری خودا ئەوڕۆکە وەسڵە
نەجاتت بوو لە دەستی تالعی ڕەش
٨. بەڵێ، بەو شەرتە خۆشە وەسڵی دڵبەر
کە دەم دەم دەم لەنێو دەم، دەس لە باوەش
٩. کزو زیزی لە کەم مەیلی، "عەزیز"م
عەیامێکە عەوامی، تەبعی سەرکەش!
١٠. هەتاکوو ساردو سڕ بوو مەیلی گەرمت
ئەدەم جنگڵ وەکوو ماری سەر ئاتەش
١١. لەسەر ڕوخساری زەردم ئەشکی خوێنین
هەتا کەی دێتە خوارێ؟ بەختەکەی ڕەش!
١٢. سپای دووریت لە سێ لا دەوری داوم
بە سانی مەنگوڕو پیران‌و مامەش
١٣. وەرە جارێ، بەجارێ لا مەدە لێم
دەبێ وابێ وەفای یارانی مەهوەش
١٤. سەرو ماڵم دەکەم قوربانی ڕێگەت

بەران و جوانە گا و لۆك و كەڵی ڕەش

١٥. بە كوردی شایەرێكی زێدە چاكم

لە شاباشی سەخای خۆت مەمكە بێ بەش

١٦. هەمیشە زیكرو فیكرم یادی تۆیە

لە شایی تۆیە خۆشم بوومە چاوەش

از روی نسخەای كە بدست شاعر (مرحوم سیف) نوشتە گردید- ٣٧/٦/١٤ كە در تاریخ ١٥/١٢/١٩ سرودە است.

**پەراوێزی شێعری ژمارە ١٣:**

١. یاری سەركەش/ بمكاتە باوەش

٣. لە ئەووەڵ نەردەوە

٤. زێڕی بێ غەش

٦. بە دەردی ئاهی من

١٠. دەدەم جینگڵ/ ساردو سڕ بوو

١١. لە دەوری بێتە خوارێ ..... ڕەش/

لە دووریت دێتە خوارێ وەك گوڵی گەش

١٢. لە وێنەی مەنگوڕو

١٤, كەڵی ڕەش

١٦. لە شاباشی تۆ خۆشم

نوسخەی قازی ئەحمەد ئەم زانیارییانەی سەبارەت بە شێعرەكە ڕاگەیاندووە: ((بەپێی یادداشتی شاعیر، ئەم هەڵبەستە لە تاریخی ١٣١٥/١٠/١٢ی هەتاویدا، پاش نیوەڕۆ، لە بن كورسیدا، گوتراوە. وەك یادداشتەكە دەڵێ، هەوا زۆر سارد بووەو كەس ئەو ماڵ ئەو ماڵی پێ نەكراوە.)) (ل٣٨). نوسخەی حەسەنی قازی هەمان ژمارە فەردی تۆمار كردووەو لە كۆتاییەكەیدا هاتووە: ((ئەم غەزە لە لە تەئریخی ١٥/١٢/١٩ [=١٩٣٧/٣/١٠]دا هۆنراوەتەوە.)) بەڵام دواتر هێڵێكی بەسەر ئەو دێڕەو هەندێك دێڕی دیكەی شێعرەكەدا هێناوەو لە ژێرەوەیدا نووسیویە: ((١٥/١٠/١٢ [=١٩٣٧/١/٢١] وقت عصر، پیش كرسی، در موقع شدت سرما نوشتە شد.))

١. غەمگینە دڵی مات‌و بە چاوت نییە هۆشی
تا ڕووبە تەمای جەورو جەفا لێمە دەپۆشی
٢. تا دیدە بە دیداری مونیرت نییە ڕەوشەن
وەك كانییەكەی "قوڵقوڵە" [یە] قوڵقوڵ‌و جۆشی
٣. هەر گوڵشەكەری لێوە شەفای دەردی نەخۆشان
سەر بێ بە فیدای كوڵمی گەش‌و چاوی نەخۆشی
٤. ئەی دڵ بە خەتا كەوتیە چینی سەری زولفی
لەم مارە عەجایب بە تەمای لەززەت‌و نۆشی
٥. هەروەك مەهی دوو هەفتە لە ژێر هەوری سیادا
ئەو دڵبەرە بۆ زینەتی نێو چادری پۆشی
٦. تا زولفی لەسەر ڕوو بە مەسەل هەوری بڵاوە
لەو تاوە دڵم ڕەعدە لەبەر بەرق‌و خرۆشی
٧. زوححاكە بەبێباكی لە تەخریبی دڵاندا
خوێنخواری گەلێ كردووە ماری سەری دۆشی
٨. هێندەت كوتووە وەعز و لە ئێمەی نییە تەئسیر
ماندووی‌و دەزانم بەخودا مەعتەلی چۆشی!
٩. لۆمەی "حەسەنی" نەفعی نییە، لابدە واعیز!
عاشق هەموو ئەعزای دڵە، ئەسڵەن نییە گۆشی.

پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ١٤:

١. تا ڕووت
٥. بۆ زینەتە، وا
٦. لەو ناوە
٧. زوححاكە/ خوێن خۆری
٨. لە دیوانە چاپكراوەكەدا نییە.
٩. هەموو گیانی

به حیسابی کانیەکەی "قوڵقوڵە"، وا هەیە ڕووی ئەم شێعرەش لە عەزیز ئاغای عەبباسی بێت.

نوسخەی قازی ئەحمەد تۆماری کردووە (ل٤٠) بەڵام فەردی هەشتەمی تێدا نابینرێت ئەوەش هەندێك گومان دەخوڵقێنێ. فەزای گشتی شێعرەکە فەزایەکی شاعیرانەو ئەفسووناویو جیددییە، بەڵام فەردی هەشتەم لەپڕدا شێعرەکە تووشی بەرزیو نزمی دەکاتو دەیخاتە هەوایەکی دیکەوە. دوور نییە ئەو فەردە شاعیر خۆی یا کەسانی دیکە لە دەرفەتی دواتردا لێیان زیاد کردبێت.

لە نوسخەی حەسەنی قازیدا نەهاتووە.

(١٥)

١. عەزیز ناردبووی بۆم سەر کڵاوە
دۆعای گەیاندبووم، دەگەڵ سڵاوە
٢. کەیفم زۆر خۆش بوو بە دۆعاو سڵاوی
سەرپۆش و سورپۆش بوو سەرکڵاوی
٣. سەرکڵاوەکەم وەقتێك لەسەر کرد
ترسی سەرمایەم لە سەرم دەرکرد
٤. سەرم بڵیند بوو، گەییە عاسمانێ
دەتوانێ چ بکا سەرمای زستانێ
٥. لە ئاوریشمێ بوو، یا لە تووکی قوو
گەرم و نەرم و ویشك، بێکرێژ، بێموو
٦. قوبوولی و دۆکلیو، شۆرباوی قازی
زۆر خۆشی کردن ناردنی پیوازی
٧. کێ دیویە پیواز بۆنی گوڵ بدا؟
وەکوو گوڵقەندی تام بە دڵ بدا
٨. لەو دوو سەوقاتە، بێ درۆو بێ بازی
ڕازی و مەمنوونم، خوالێت بێ ڕازی
٩. لەسەرمی دەکەم تا سەرمام نەبێ
لە چێشتی دەکەم تا بێتام نەبێ
١٠. دایم بەبێ تۆ غەمگین و ماتم
"عەزیز"! تۆی مایەی عەیش و حەیاتم
١١. ژیانم ناوێ تاوێ بەبێ تۆ
"حەسەن" ئارەزووی ڕووی تۆ لە دڵی تۆ
١٢. "عومەر"و "عوسمان" نووری چاوانم
فێنکایی دڵم "بووبەکر"ی جوانم.

**پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ١٥:**

**لە نوسخەی حەسەنی قازیدا، شێعرەکە بەم سەردێڕە دەست پێ دەکات:**

**((دیاری ناردنی عەزیز ئاغا بۆ سەیف))**

**نوسخەی قازی ئەحمەد تۆماری نەکردووە.**

١. کەسێ بەختی سەعیدی بێ دەبێ حازر لە دیوانت
مەلازی مەنزلی تۆیە نەسیبی وی لەسەر خوانت
٢. کە قووتی ڕۆحە میهری تۆ لەسەر سەفحەی موحەببەتدا
هەمیشە حازری وەقتە، جەسەد بۆچ بێتە میوانت!
٣. میسال تای چینی زولفی دڵبەرە "تاچین پلاو"ی تۆ
لە دووی هەر دانەیێکی دڵ هەزاران دێنە پێشخانت
٤. زریشکی ڕەشکی خالی دڵبەرو حەسرەتدەری میشکە
لە زیرەی عەتر بێزی ڕێزە ڕێزە جەرگی کرمانت
٥. وەکوو ئارەق لەسەر کوڵمی نیگارین یاری گەندمگوون
برنجی ڕەنجبەری کوردانە دانەی کەوتە سەر نانت
٦. تەواوی ڕانی بەرخێکی کە بەرخێکی تەواو دێنێ
بە سەد مەڕ ڕابرا ئەوڕۆ لەبەر چاوی دۆعاخوانت
٧. کەلامی بامەزەو خولقی خۆش‌و شیرین کیفایەتمە
بڵێ با دانەنێن قەنداو و دۆ، لابەن نمەکدانت!
٨. لەزەردو سووری سەردەوری، بەجارێ دڵ سپی بۆوە
لە ڕەغمی زەعفەران ڕەش هەڵگەڕا ڕەنگی ڕەقیبانت
٩. کە قاوە قاو دەکەی، تاڵیی میزاجم چا دەبێ شیرن
فیدای قەندی لەبت! ئاوی بەقا دەڕژێتە فنجانت
١٠. دەلیلی عاقیبەت مەحموودییە مەحموودە هاوخوانم
کە وەك شاپووری خوسرەو وایە بۆ تەدبیری کارانت
١١. نەکیساو باربەد وا چاکە بۆ ئەو بەزمە حازر بن
لە بەزمی خوسرەویی، مەحموو خان! کوا دەنگی جارانت؟
١٢. هەوای "حاجی عەلی کەند"ت لە بۆ دڵ، بوعەلی سینا
شەڕارەی دەردی دڵ تەسکینە ئاو و خاکی "دەرمان"ت
١٣. هەمیشە "حافز"و "سەعدی" بەرۆحانی دەبن حازر
ئەگەر "خان"و "حەسەن" بێن‌و بخوێنن نەزمی شێعرانت

١٤. "نیزامی" نەزمی بەرهەم، "ئەنوەری" نووری نەما شێعری
کە سەدری ئەنجومەن ئەوڕۆکەیە تەبعی سوخەندانت
١٥. لە عیرفان زایدە "عورق"، "سەنایی" نەزمی مەزموومە
"کەلیم" ئەوڕۆ کەلامی موهمەلە، زاهیر کە عیرفانت!
١٦. لە مەیدانی سەعادەت بوو، نەسیبی من سەعادەت بوو
بە عینوانی مەدیحی تاوبەتاوێ دێمە مەیدانت
١٧. کەلامی من وەکوو شێعری فلانی بێ سەرو پێ نین
بکەم تەقطیعی ئەوزانی، یەقین ڕاست دێتە میزانت
١٨. دەڵێن هەر کەس کە سفرەی بێ، بەهەشتی جێیە، ئەوڕۆ تۆ
ب، نەقدیی ساکینی خولدی لە سایەی جووتە جیرانت
١٩. لە هەر جێ، بۆ هەموو کەس جوودی تۆ بێ میننەتو مەنعە
وەکوو سەیلی بەهارانە سەخای وەك هەوری بارانت
٢٠. "عەلی"! مەشهووری شارە من کە "سەیف"ی زولفەقاری تۆم
هەمیشە "یا عەلی"مە، گەر قەبووڵم کەی لە شیعانت
٢١. ئەوا هات عیدی قوربان شوکری لیللا، خۆشی خۆشیمە
کە حەججی ئەکبەرە بۆ من کەوا خۆم کردە قوربانت
٢٢. هەتا موژگان، لەبۆ دیدە بێ حافز لە دیتن دا
لە ئەمر و نەهیدا تا ڕاستو چەپ بێ تیغی موژگانت
٢٣. لە ڕاستو چەپ بڕۆن سەف سەف سەوارانت لە دوویی یەك
هەمیشە حافزت [بێ] بۆ حەوادیس لوتفی یەزدانت
٢٤. هەموو عالەم لەنیكو بەد بە حیسسەی خۆی دەکا شوکرت
لە وەقتی بەزلدا گەر سەروەرا! دەس بەریە گیرفانت
٢٥. کە تۆی ئەوڕۆ لە زومرەی موخلیسانی شاهی شەمسەددین،
دەلیلێکی تەواوە بۆ تەواویی نووری ئیمانت
٢٦. کەلامم خۆشو شیرینە لە نۆشانۆشی بەزمی تۆ
خوسووسەن، گەر دەکەم ئەندەك بەیانی فەزلو ئیحسانت
٢٧. هەتا حەڵقەی دۆعاو تەهلیلو خەتمن ڕۆژو شەو دایر،

له دنیاو عاقیبەت یارو موعین بێ شەمسی بورهانت

٢٨. هەتا هەڵبێ له مەشریق ڕۆژو ئاوابێ له ڕۆژئاوا،

هەمیشه ماڵت ئاوابێ، پەنات بێ شەمسی بورهانت

٢٩. لەلام تەرکی ئەدەب کفره، ئەمن تەرکی ئەدەب ناکەم

لەبەروەی بوو که ڕاوەستام له کن "میسباحی دیوان"ت

٣٠. فزوولی ئاوری شەیتانه، هەوای شەیتانی قەت ناکەم

له بابەت ئاوی "خۆش گەلدی" لەسەر خاکی "رەحیم خان"ت

٣١. "سمایل بەگ" لەگەڵ من کەی شکستی کاری وی فەرموو؟

له بۆ خدمەت "ئەدەب" ئەوڕۆ "حەسەن" هەر وەك "حسێن خان"ت

٣٢. که "کانی قوڵقوڵه"ی تەبعم له بەندی عەوق ئازاده

ڕەزام مەدحو دۆعایه بۆ عەزیزان و مەریزانت

"زرین دە"- گوێگجەلی سابق ٢٣/٧/٢٣=[ ١٥/١٠/١٩٤٤]

در زرین ده نوشته شد که نسخه‌اش از بین نرود حیف است سیف القضاة قاضی

**پەراوێزی پارچه شێعری ژماره ١٦:**

له بەراورد لەگەڵ نوسخەی قازی ئەحمەددا ٣ فەردی کەمه بەم شێوەیه:

٢٤، ٢٥ و ٢٦.

٣. میسالی

١٠. هاوخوانت

١٥. [وا هەیه وەك "خانه" بخوێنرێتەوه]

١٨.ساکنی

٢١. شوکرڵڵا

٢٣. له دوو دووی یەك

٢٨. هەڵدێ

٣٢. عەزیزانی مەریزانت

ئەم شێعرە لە دیوانی چاپکراوی قازی ئەحمەددا کراوەتە دوو پارچەی جیاواز، یەکەمیان:

((کەسێك بەختی سەعیدی بێ دەبێ حازر لە دیوانت...))

کە ٢٠ فەردە، و دووهەمیان:

((لە مەیدانی سەعادەت بوو، نەسیبی من سەعادەت بوو...))

کە ١١ فەردە.

لە نوسخەکانی بەردەستی مندا، گەرچی شێواوی‌و پاش‌و پێشی فەردەکان دەبینرێن بەڵام لای کەم دوو نوسخەیان نزیك بە هەموو فەردەکانی هەر دوو پارچەیەیان بەبێ دابڕاوی بە شوێن یەکدا هێناوە. کێش‌و ڕەدیفی شێعرەکانیش هەر ئەو شێوەیە پشت ڕاست دەکەنەوە. هەر بۆیەش من پێکەوەم هێنان بە یەکم دانان.

شێعرەکە بۆ عەلی بەگی حەیدەری گوتراوەو وێدەچێ سەرەڕای کێبەرکێی سیاسی بۆ هەڵبژێرڕانی مەجلیس، هەردوولا نێوانێکی خۆشیان بووبێت. سەیف لەم شێعرەدا ستایشی توانای شاعیری‌و "عیرفان"ی عەلی بەگ دەکات، ئەوی ئاشکرا بێت هەردوولا موریدی خانەقای بورهان بوون.

لە نوسخەی قازی ئەحمەددا بۆ بەشی یەکەمی شێعرەکە – واتە ((کەسێك بەختی سەعیدی بێ...)) نووسراوە: ((دیسان بۆ عەلی بەگی سالار سەعید گوتراوە.))

سەبارەت بە بەشی "لە مەیدانی سەعادەت..." یش نووسیویە: ((بۆ عەلی بەگی حەیدەری کە بە "سالاری سەعید" مەشهوور بووە گوتراوە)).

و لە پەراوێزی هەمان شێعر یشدا هاتووە: ((میسباح شاعیری پایە بەرزو سەودا سەری ئەوین، دە زەمانی ژیانی سەیفدا ژیاوەو نازناوی "ئەدەب" بووە. سەیف دەم هەڵبەستەیدا دەڵێ: "من تەرکی "ئەدەب"– یانی میسباح، ناکەم‌و ئەو مەبەستەی لە بەشی دوایی شێعرەکەیدا دووپات دەکاتەوە.))

نوسخەی حەسەنی قازی لە شوێنێکدا تەنیا دوو فەردی پارچەی یەکەمی تۆمار کردووە ((کەسێ بەختی سەعیدی بێ))و ((میسالی تای چین)) کە دووهەمیان شێواوەو لەگەڵ فەردی سێهەم تێکەڵ کراوە. بەڵام لە لاپەڕەیەکی دیکەدا ١٢ فەردی هەمان شێعری نووسیوەتەوە: (فەردی ١ تا ١٢)، وشوێنی فەردەکانی ٩ تا ١١ لەچاو دەقی ئەم کتێبە هەندێك پاش‌و پێش کراون.

(١٧)

١. دڵی وێران له هیجران بۆوه مەعموور

" حەسەن" دووباره بوو خۆش کەیفو مەسروور

٢. به تەنها ئەو غەمەم ماوه لەدڵدا

که بووم لەو بەزمەدا مەحرومو مەهجوور

٣. "سەعیدولمولکی دیوان" شوکری لیللا

دەڵێن مەشغووڵی شایی و شادیەو سوور

٤. بەڵێ، جێی شادمانی و ئینبیساته

که مایل بووی به مەتڵووبو به مەنزوور

٥. دەڵێن دەستبەندیانه ماهڕوویان

لەسەر سینه دەلەرزن زولفو بەرموور

٦. وەکوو پۆلی قورینگو تاوسو کەو

که دێن بۆ هەڵپەڕین خووبان به جەمهوور

٧. که دەس دەگرن بەڕیز بۆ هەڵپەڕینێ

وەکوو قازو قورینگی سەر بەره ژوور

٨. کچۆڵەو پیاو و ژن دەستیان له دەس یەك

وەکوو عیقدی سورەییا وان، جەمو جوور

٩. لەسەر سمتانه پشتێندی شەدەی شل

لەبەر پێیانه لفکەی پووڵەکەی دوڕ

١٠. له ((ڕۆینه)) کۆترن، ((لەنجه)) مراوی

بەبازی هەڵپەڕین، ئاسکی کەفەڵ کووڕ

١١. گوڵ و گەردنلغ و گواره و قەتاره

له ئەستۆ و دەوری سەر، "نووری عەلا نوور"

١٢. بەڕوو سوورو سپی، چاوی گەشو ڕەش

بەبێ سووراو و سپیاو و کلی توور

١٣. دەڵێن ئەورۆ وەتاغی تۆ بەهەشته

که پێیدا دێو دەچن غیلمان وەکی حوور

١٤. لەسەر ڕوودا بڵاو بوون خاڵو پەرچەم

دەڵێی تێکەڵ کراون میشكو کافوور

١٥. لەسەر کوڵمان عەرەق وەك شەبنەمی گوڵ

که هێشتا لێی نەدابێ شیددەتی نوور

١٦. خشەی شەڵواری خاراو ئەتڵەسە دێ

زرەی خرخاڵی زێڕ و زەنگی پاموور

١٧. کراسی مەخمەڵی زەرد بوون لە تۆزا

تکەی ئارەق ڕەشی کرد چەکمەیی سوور

١٨. لەلایێ هەڵکراون قۆڵی "زێوین"

لە لایێ دەرخراون پووزی بلوور

١٩. قەدو ئەندامو سمتو پووزو پاشن

خڕو باریكو گردو شووشو ئەستوور

٢٠. کەنیزی وا دەبێ ڕەقسو سەما کەن

که بەو ئەوسافە بن مەخسووسو مەشهوور

٢١. "ئەدەب" نابێ لەنێو ئەو بەزمەدا بێ

هەتا لادەن [کچان] ڕووبەندی فەخشوور

٢٢. جلیت بازان لە لایێ هاتە هاتە

لە ترسی داری وان پشتی فەلەك کووڕ

٢٣. لە لایێ نێزەبازان حەملەوەر بوون

لە هێرشدان، دەدەن چەرخی فەلەك سووڕ

٢٤. دەبێ بێن "حاجی بابا"و "ڕەحمەتوڵڵا"

بڵێن ڕاك و حیجاز و شوور و ماهوور

٢٥. بڵێن "خانە و" "حەسەن" بابێن بە جووتە

بە دایم نەغمەخوان بن، مەست و مەخموور

٢٦. لە لایەك نرکەیی زوڕناو دەهۆڵە

لەلایێ ناڵەیی نەی دێتو تەنبوور

٢٧. لە دەوری شایی‌دا، دوژمن بە حەسرەت
وەکوو گوڵی مەڕی دەس کەن بە سەگلوور
٢٨. وەکوو ڕێی کەهکەشان، ڕیزی مەجۆعمان
کە دێنن، دادەنێن بەو داب و دەستوور
٢٩. بە ئومێدی عەتان خەڵکی لە دەورەت
سولەیمانی دەڵێی، ئەو عالەمە موور
٣٠. لەبەر شەهدی سەخات ئیجماعی عالەم
دەبینم دێیەکەت وەك شارە زەنبوور
٣١. لە هەر لایێ دەڵێن هەر عەیش و نۆشە
هەزار خۆزگەم بە میوانی دەرو ژوور
٣٢. لە دەوری مەنقەڵی جەمعێك بە دەورە
دەکێشن، دادەنیشن بەنگ و کافوور
٣٣. دەبێ تەختێ دروست بکرێ لە سەندەڵ
دەبێ وەستا لە هیندێ بێ و لەلاهوور
٣٤. لە ژێر تەخت ئێستری دوڵدوڵ سیفەت بێ
دەبێ ببنە یەدەك شەبدیزو لاهوور (؟)
٣٥. دەبێ قەیسەر سەری مەحمیل بکێشێ
دەبێ مەیدان بماڵێ ئیمپراتوور
٣٦. خەدێوی میسر ئەبێ شەربەت بگێڕێ
دەبێ بێڵداری ڕێ بێ شاەو فەغفوور
٣٧. دەبێ موتریب "نەکیسا"و "بار بەد" بێ
بە نۆرە دانەنێن قەت، سازو سەمتوور
٣٨. دەبێ "شیرین"و "شەککەر" ببنە ساقی
لە زومرەی نازران "پەروێز"و "شاپوور"
٣٩. "ئەسەد" دەیکا قرانی هەردوو "سەعد"ەین
لەنێو بورجان بووە بەم بۆنە مەغروور
٤٠. دەبێ بۆ گاوو گەردوونی، کەڵ و گا

دەبێ بۆ سەربڕین بێنن شەك و کوور

٤١. خوا بکا دائیمەن وا شادمان بی

عەزیزی ئارەزووت خۆی بێ لە ڕێی دوور

٤٢. هەمیشە دێیەکەت وا ئاوەدان بێ

ولاتی دوژمنت وێران و خاپوور

٤٣. لە "داشالووجە"ڕا حوجرەی فەقێیان

لە دووریی مەوتەنی تۆم زار و ڕەنجوور

**پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ١٧:**

١. لە میهران (؟)

٢. لەو بەرزانەدا (؟)

١١. لە ڕۆینە کۆترن،

١٣. بەڵێ ئەمڕۆ وەتاغی

١٥. شەونمی گوڵ، شیددەتی هوور

١٦. زەنگی پاموور

١٧. کراسی مەڵحەمی ڕەش بوون دەتۆزدا/ تکی ئارەق/ زەردبوون لە تۆزا

١٨. زێون

١٩. "لف و نشرمرتب"، گەرچی وێدەچێ هەندێکیش موشەووەش بووبێت

٢٠. مەعرووف و مەشهوور

٢١. وشەی "ئەدەب" ئیهامی تێدایەو نیازی میسباح الدیوانی ئەدەبە/ چەوقچوور

٢٢. لەلایەك

٢٣. لە هەیبەت وان دەدەن چەرخ و فەلەك سوور

٢٤. بلا بێن

٢٥. قەرەنی و مستەفا بابێن بە جووتە

لە نووسینەوەو ڕاگواستنی نوسخەی ئەم شێعرەدا ئاڵۆزی دروست بووەو هەندێ لە نوسخەکان چەند فەردێکیان لێ پەڕاندووە.

نوسخەی دەستنووسی حەسەنی قازی سێ دەقی ئەم شێعرەی گرتۆتە بەر:

١. یەکەمیان بەم دێڕە فارسییە دەستی پێکردووە:

((از داشالوجه به آقای سالار سعید نوشته که شنیدم مرزه خانم را عروسی میکند.))

ئینجا شێعرەکان هاتوون، کە ٣٣ فەردن‌و فەردی ٢٧و ٢٩و ٣٠ ناتەواوییان هەیە. لە کۆتاییەکەشیدا نووسراوە: (٢٣/٨/٤) [=١٩٤٤/١٠/٢٦] نوشته شده.

٢. نوسخەی دووهەمی شێعرەکە، نیوەی بە قەڵەمی ڕەش (ڕەساسی) نووسراوەو ئەویتر بە مەرەکەب. ئەم نوسخەیە ٢٧ فەردەو فەردی ١١ی ناتەواوە، جێگەی فەردی ١٢ بەتاڵ ماوەتەوەو فەردی ٢٦ لەتی دووهەمی نەنووسراوە.

لەسەرەتای ئەم دەقەدا ڕستەیەکی فارسی نووسراوە کە دووپات بوەوەی ئەوی سەرەتای دەقی یەکەمیانە.

٣. نوسخەی سێهەمی شێعرەکە، لە کۆتاییەکانی ئەم دەفتەرەدا نووسراوەو بە فەردی ژمارە ٢٩ی ئەم دەقەی ئێستای ئێمە دەست پێ دەکات، تا فەردی ٣٦ دەچێت، ئینجا فەردی ژمارە ٤٠و پاشان ٣٩، ٤١ تا ٤٣.

بەڵام لەتکەی دووهەمی فەردی ٣٠ ناتەواوەو نەنووسراوە.

ئەم دەقەیان هیچی لە سەرەتاو کۆتاییدا بۆ نەنووسراوە.

دەستنووسێکی تر کە لەبەر دەستی مندایە، تەنیا فەردی ١ تا ٦، ١٣ تا ٢٤، ٢٧، ٣٧و ٣٨ی تێدا دەبینرێن‌و من پاشماوەی شێعرەکانم بە یارمەتی دەقی قازی ئەحمەدو حەسەنی قازی نووسییەوە، تەرتیبی فەردەکانیش لەسەر بنەمای کاری قازی ئەحمەدە.

٢٦. لەلایێ نالەیی نەی دێت‌و سەنتوور

٢٧. لە دەوری شاییدا

٢٩. بە ئومێدی سەخات

٣٠. نوسخەی حەسەنی قازی نیوەی دووهەمی شێعرەکەی تێدا نییە

٣٩. گەرچی ئەسەد ناوی بورجێکە، وا هەیە ئیهامی بۆ "ئەسەد" ناوێکیشی تێدا بێت. بە هەمان شێوە، من ئیهام لە وشەی "سەعدەین"یشدا دەبینم‌و "سەعد" جگە لە واتای بەخت‌و بەرانبەری "نەحس"، کە بۆ بورجەکانی مانگ دەگوترێت، ئاماژەی بە "سەعد" ناویش تێدا یە، کە سالار سەعید واتە عەلی بەگی حەیدەرییە.

٤١. نیوەی یەکەم: خودایا دایما وا.....

٤٢. هەمیشە موڵکی تۆ

٤٣. لە داشاڵووجە ڕا

نوسخەی قازی ئەحمەد:

((بە بۆنەی زەماوەندو شایی‌و گوێزتنەوەی ژن بۆ کوڕی سالار سەعید (عەلی بەگی حەیدەری) لە داشاڵووجە (گوندێك لە ناوچەی سەقز)، [سەیف] هەڵبەستی ژێرەوەی بۆ سالار ناردووە (٦٦)..... ئەدەب، مەبەستی "ئەدەب" (میسباح)، شاعیری دڵ سووتاوی ئەو سەردەمەیە... ڕەحمەتوڵاو حاجی بابا- دوو کەس لە دەنگ خۆشەکانی ناوچەن (٦٣))).

نوسخەی حەسەنی قازی:

نوسخەکە، فەردی ١١، ١٢٢، ٢٨، ٣١ تا ٣٧و ٣٩و ٤٠ی تۆمار نەکردووە.

لەسەرەتای شێعرەکەی نوسخەی حەسەنی قازی دا ئەم عیبارەتانە هاتوون، بەڵام من هێنامنە پەراوێزەوە:

"بسمه تبارك و تعالی"

"یا شمس الدین"

"من کلام آقای سیف القضاة"

(١٨)

١. ڕووناکیی چاوم، "ئەحمەدی سەیفی!"

لە شێعر کوتننت دیارە بە کەیفی

٢. کەیفت لە سایەی "حەزرەتی قازی"؟

وەقتێك لێت ڕازیم "قازی" بێ ڕازی

٣. لە شێعر گوتننت زۆر کەیف خۆش بووم

چونکە ناخۆش بوو خەتت، نەخۆش بووم

٤. زیاتر هومێدم هەر بۆیە پێتە

"سەدر"یشت ئوستاد، گوێی لە دەرسێتە

٥. ئەگەر حەز دەکەی هەر سەرفراز بی

لە باب و برات هەر بێ نیاز بی،

٦. ئەخلاقت چا [ك] کە، بۆ خۆت بخوێنە

درۆیان مەکە، کەمان مەدوێنە

٧. لە سایەی "قازی"، جێژن پیرۆزە

جێژنی مە قوربان، نەکوو نەورۆزە

٨. سایەی لە سەرمان یا خودا کەم نەبێ

دنیامان هەیە گەر ئەومان هەبێ

٩. ئەنعامت ویستبوو، ئەوا بۆم ناردی

دۆعام بۆ بکە، بەخودام ئەسپاردی

١٠. ئەنعام بە عەدەد چواریاری نەبی

بووبەکرو عومەر، عوسمان و عەلی

١١. تا لێت یەقین بێ، هەر چوار بە حەقن

گوێ مەدە خالان، عەجەم ئەحمەقن

١٢. لەبەر بێ پوولی دنیا بێ ڕەنگە

چ وەقتی سەعات ئەو زرینگەو زەنگە؟

١٣. هەمیشە بەرگت هەر فاسونیا بێ

مەرگت نەبینم، زەرد یا سیا بێ

١٤. خێزانی ماڵێ ئارەزووت دەکەن

مەیلی هاتنی زوو بە زووت دەکەن

١٥. دۆعای گەیاندبووم "عەزیزی مامەش"

زۆرم پێ خۆش بوو، لە دڵم برا غەش

١٦. لەنێو مامەشان مەزن "عەزیز"ە

سوارێکی شۆڕو شۆخ و تەمیزە

١٧. ڕان و ڕکێفی دەڵێی ڕۆستەمە

لە مەیدانێدا شێری بێ غەمە

١٨. دۆستی و ڕاستی و هەم عەهدو وەفا

هەرچی خووی چاکن، بە بابی برا

١٩. تا نێوی کوردان بە چاك بمێنێ

"حەسەن" لەلاوە نێوی وی دێنێ

## پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ١٨:

لە سەرەتای شێعرەکەدا ئەم ڕستە فارسییە نووسراوە، بەڵام من هێنامە پەراوێزەوە:

«اشعار جناب مستطاب اجل عالی سیف القضاة قاضی طاب ثراه به فرزندش میر احمد نوشته است.»

٦. کەم = نزم و کەم قیمەت.

سەیف لە شێعرێکی دیکەشدا ئەو چەمکەی هێناوە:

«مەغبوونی هەر موعامەلە، مەحکوومی هەر کەمێك

شاهان بە مەحوی ئێمە دەبەستن گرێ و گرێو...»

١١. هاوسەری سەیف واتە دایکی ئەحمەد، تورکی ئازەربایجانی بووە.

١٢. ئەو زەنگ و دەنگە/ ئەو ڕەنگ و زەنگە

١٧. شێر (؟)

ئەم شێعرە لە دیوانی چاپکراوی قازی ئەحمەددا نییەو تاقە نوسخەیەکی لەناو دەستنووسەکاندا دەبینرێت، کە دەبێ بووبێت بە دوو کوتەوەو درەنگتر بە نەوار چەسپ پێکەوە درا بێتنەوە. شوێنی ئەو چەسپە لە کۆپیەکەدا ڕەش بۆتەوەو ناخوێنرێتەوە. بەهۆی پچڕانی پەیوەندیی نێوان بەشی سەروو و خوارووی لاپەڕەکەوە، پەیوەندی مەنیتقی بەشەکانیش بڕاوەو هەندێك جار هەست دەکەم دوو بابەتی جیاواز بن. بەڵام نوسخەهەڵگر وەك سەرەتا بۆ شێعرەکە، ئەم ڕستەیەی نووسیوە:

((سەیف لە جوابی کاغەزی کوڕی- ئەحمەدی سەیفی قازی نووسیویە.))

ئەحمەد، کوڕی سەیف بووەو لە مەهاباد لە ماڵی پێشەوا قازی محەمەد دەرسی خوێندووە، هەر لەوێشەوە شێعرێکی بۆ باوکی ناردووە، کە ئەم شێعرە وەڵامەکەیەتی.

نوسخەی حەسەنی قازی سەرجەم ١٨ فەردە و فەردی سێهەمی نەگرتۆتە بەر. فەردی سێزدەهەمیشی ناتەواوە.

وەك سەرەتاش، ئەم دێڕانەی نووسیوە:

((سەیف لە جوابی کاغەزی کوڕی- ئەحمەدی سەیفی قازی نووسیویە.))

(١٩)

١. نامەی گرامیت حەزرەتی "نامی"!
پێم گەیشت لە دەست شەخسێکی نامی
٢. نامەی گرامیت وەقتێك پێم گەیشت
هێند کەیف خۆش بووم، عالەم تێم گەیشت
٣. لە قەولی "ئەحمەد" چەند شێعرت گوتبوو
ئەلحەق لە دەهەن بابیشی زیاد بوو!

٤. حەیرانی کردم "مولەممەعات"ی
"موحەسسەنات"ی، "بەدایعات"ی
٥. تەسدیقی دەکەم شێعر دەبێ وابن
کەلامی "نامی" دەبێ وا چابن
٦. یاوەریم بدەی موژدە پێدراو!
پێنجی بن عەبا، دوازدە نێو براو
٧. گەر بە عەدەد وان ئینعام بنێرم
دەبێ لە پاشان، مێشان بژمێرم!

٨. ئاشی "کولتەپە"ت کارێکی چا بوو
ئەو کۆچی ئاخریت یەکجار بەجابوو
٩. سایەی "عەزیز"ی هەر کەس لەسەر بێ
لەنێو هاوسەران دەبێ سەروەر بێ
١٠. خزمەتت دەکەین ئێمەش تاکوو هەین
تۆش دەرسان بڵێ بەبێ کەین و بەین
١١. "عومەر"، "ئەبووبەکر"، یاری غاری بێ
"عوسمان"یش عەلی ئاگاداری بێ
١٢. "بووبەکر"یش یا خودا هەر چوار، یاری بن
خوداو پێغەمبەر ئاگاداری بن
١٣. لبادێکیشم ئەوا بۆ ناردی

پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ١٩:

٥. تەسدیقت دەکەم/ ئەبێ وابێ/ چابێ

٦. نیاز لە "پێنج تەنی عەبا"، محەمەد، عەلی، فاتمە، حەسەن و حسێنە.

دوازدەی نێو براو ١٢ ئیمامی شیعەی اثنی عشری وموژدە پێدراویش پێغەمبەری ئیسلامە.

٧. وا هەیە "نامی" ویستبێتی سەیفولقوزات بە ژمارەی ئەو پێنج و دوازدەیە خەلاتی بۆ بنێرێت.

٩. هەوسەران (؟)/ گشت سەران

"نامی" لە پەیوەندی عەزیز ئاغای عەبباسیدا بووەو زۆر وا هەیە مامۆستای کوڕەکانی بووبێت و دەرسی بە ئەحمەدی کوڕی سەیفیش گوتبێتەوە، وا دەردەکەوێت کە لە زمان ئەحمەدی سەیفەوە شێعری گوتبێت و بۆ خەلات وەرگرتن ناردبێتی بۆ سەیف، بەلام ئەو، کە شێعرناس بووە، بەوەی زانیبێت.

سایەی "عەزیز"، نیاز لە عەزیز ئاغای کولتەپەیە، کە ئاغای گوندەکە بووە.

نوسخەی قازی ئەحمەد ئەم زانیارییانەمان دەداتێ:

((ئەحمەد کوڕی سەیف بووە، کە دە سەردەمی لاوەتیدا کۆچی دوایی کردووە. وەك دەردەکەوێ هەستی شاعیرانەی بووەو یەك – دوو هەڵبەستیشی لێ بەجێ ماوە کە بە داخەوە دەس نەکەوتن (٦٨) عومەر، ئەبووبەکرو عوسمان کوڕانی عەزیز ئاغای عەبباسی بوون)).

لە نوسخەی حەسەنی قازیدا تۆمار نەکراوە.

(٢٠)

١. خەياڵی هيجری ئێلخانی کە دەکرێ

دڵی گەورەو بچووکی مە، گڕ ئەگرێ

٢. ويسالت چون نييە بۆ من مويەسسەر

سڵاوت بۆ دەنێرم لێرە تا دێ

**پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ٢٠:**

ئەم چوارينەيە لەناو دەستنووسەکاندا نەبينرا، نوسخەی حەسەنی قازيش تۆماری نەکردووەو لەبەر دەقی چاپکراوی قازی ئەحمەد نووسرايەوە (ل٥٦).

قازی ئەحمەد لەگەڵ چاپی چوارينەی سەيف، چوارينەيەکی "حاجی کاکە ڕەحمانی فەيزوڵڵا بەگی (ئێلخانی)" چاپ کردووەو نووسيويەتی:

حاجی کاکە ڕەحمان ئەو دوو شێعرەی بۆ سەيف ناردووە:

لە دووريت دڵ دەناڵێنێ وەکوو تار

لە هيجرت پێچ دەخۆم دايم وەکوو مار

ويسالت چون نييە بۆ من مويەسسەر

سڵاوت بۆ دەنێرم لێرە تا شار

"سەيف"يش بەو دوو شێعرە وەڵامی داوەتەوە.

قازی ئەحمەد لە پەراوێزی شێعرەکەدا نووسيويەتی:

((ئەم شێعرانەم لە جەنابی عەليخانی ناهيد (لە پياوە ماقووڵەکانی بەرەی بەگزادەی سەقز) بيستو نووسيمەوە. عەليخان پياوێکی زاناو مێژووزان و شێعرناسە و زۆری ئاسەواری نووسەرانو شاعيرانی لەلايە کە بە هيوام بڵاويان بکاتەوە.)) (ل٥٧).

وا دەردەکەوێت لەکاتی نووسينی نامە شێعرييەکانياندا، سەيف لەشاری [مەهاباد؟]و حاجی کاکە ڕەحمانيش لە گوند [ی شاريکەندی بۆکان؟] بووبێت. بۆ زانياريی خوێنەران دەڵێم ناوچەی دەوروبەری گوندی شاريکەند لەو کاتەدا، هەمووی بەدەست دێبوکرييەکانەوە بوو و تەنيا شاريکەند مڵکی بەگزادەکان بوو.

* نوسخەی حەسەنی قازی ئەم شێعرەی تێدا نابينرێت.

١. هەتا عەیش‌و تەرەب بێ ڕۆژی نەورۆز
هەتا گوڵ بێ لە باغدا مەجلیس ئەفرۆز
٢. هەتاکوو زولفی مەحبووبان بێ ئاڵۆز
هەتا موژگانی خاڵ خاسان بێ دڵدۆز
٣. هەتاکوو خاڵی سەر کوڵمان جگەر سۆز
هەتا نەوروستەگان بن عیشوە ئامۆز
٤. هەتا شەڵوار لەبەر لەنجە دەکەن تۆز
هەتا بکرێ لە ئەسپان زینی ئوڵدۆز
٥. لە دەشتی یەکشەوە تا گا دەکا مۆز
هەتاکوو مام "نەسوڵڵا" پێی دەڵێن بۆز
٦. هەتا وشتر مەهار دەکرێ بەلمبۆز
هەتا دێژن بە قەڵپۆز سەقزی کەڵپۆز
٧. هەتا بەرغەل بەهاران بچنە ناو کۆز
هەتاکوو کارژیلە بکەن هەڵتۆز هەڵتۆز
٨. خودا بکا دوشمنت هەر سەر نیگون بێ
لە سەرتا بێ هەمیشە تاجی فیرۆز
٩. لەبەر زوڵمی زەمانە قەت نەناڵی
لە باوەشتا بێ دایم دڵبەری قۆز

**پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ٢١:**

**نوسخەی قازی ئەحمەد:**

«[سەیف] هەڵبەستی ژێرەوەی بۆ یەکێك لە ئاغایانی بەگزادەی یەکشەوە کوتووە. بەڵام نێوی کەسی نەبردووە. بە گومانی من بۆ ئاغا شێربەگ کە موریدی "بورهانی" بوو، کوترا بێت.»

بەڵام بەبۆچوونی من شێعرەکە نابێ ڕووی لە ئاغا شێربەگ بووبێت کە یەکەم خەزووری بووە. ئەم شێعرە هەندێك گاڵتە ئامێزەو بۆ کەسێکی هاوتەمەن‌و هاودەم‌و

هاو مەجلیسی سەیف گوتراوە، بە تایبەت کە ئاغا شێربەگ لەسەردەمێکدا کە سەیف خوازبێنی زبێدە خانمی کچی کردووە، لە ژیاندا نەماوە.

نوسخەی حەسەنی قازی ئەم شێعرەی تۆمار نەکردووەو بە حیسابی ناوەرۆکی شێعرەکەو ئەوەی کە وەك پاشماوەی شێعرەکانی سەیف جیددی نییە، ئەو گومانە بەدوور نازانم کە شێعری کەسێکی دیکە بێت، بەڵام ئەوە تەنیا گومان کردنێکی بێ بنەمایەو بەڵگەم بۆی نییە. وا هەیە قازی ئەحمەد گوتەنی، شێعرەکە بۆ ئاغا شێربەگ گوترا بێتو بەم پێیە، هی سەردەمی لاویەتی سەیف بێت، خۆ فەقێو موستەعیددی حوجرەکانی کوردستان زۆریان قسە خۆشو دڵتەڕنو گەلێك ئاساییە شێعری زۆر لەوە "گەنجانە"تریش بڵێن.

١. قاسید کە لە دەر ھاتو بە تەبلیغی وەفا کرد
حوجرەی منی حەسرەت دەیی سەد چین‌و خەتا کرد
٢. پیم وت لە خەتا دێیەوە یا خیتتەیی تاتار؟
یا ئەھلی بەھەشتی کە دڵت پڕ لە سەفا کرد؟
٣. یا خزری کە ھاتی بە دووجام ئاوی بەقاوە
ئەم موردەیی ھیجرەت بە تەمای عومری بەقا کرد؟
٤. یاخۆ لە تەرەف یارەوە دێی حامیلی نامەی
خاسییەتی ئاهووی خوتەن‌و چینی ئەدا کرد؟
٥. خاسییەتی بۆ چاوی منی خەستە و ڕەنجوور
وەك جامەیی یۆسف کە بە یەعقووبی عەتا کرد
٦. ئەستاری وەکوو زولفی عەرووسانە موسەلسەل
ئەلفازی هەموو گەوهەرە، چەن جوانی ئەدا کرد!
٧. نوختەی بە مەسەل، خاڵە لەسەر ڕوومەتی یارم
یا وەك عەرەقی کوڵمی، کە مەیلی بە جەفا کرد
٨. هەر خۆم بە فیدای ئەو خەتو ئەو ڕەبتو بەیانە
عیجزو غەم‌و دەردی لە دڵم مەحوو فەنا کرد
٩. ئەم دەستە گوڵە، بەستەیی ئەم دەستو بەنانەن
بۆیە وەکوو بولبول، حەسەنی نەغمە سەرا کرد.

پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ٢٢:

٢. پیم کوت لە خوتەن دێیەوە
٣. یان خدری
٤. یاخود

تەنیا چوار فەردی یەکەمی ئەم شێعرە لەناو دەستنووسەکاندا هەیە. پاشماوەی ٥ فەردەکەم لە دیوانی چاپکراوی قازی ئەحمەد وەرگرتووە. نوسخەی حەسەنی قازی تۆماری نەکردووە.

(٢٣)

١. ئەو زوڵمە لە سەر چی کە دەکەی لێمە بە ناحەق
هەر عیشقە گوناهم بوەتە باعیسی نەستەق

٢. سەر، گۆیە لە مەیدانی غەمت، پێی بکە بازی
ئەزیەت مەکە زولفت بە شەقێ لێی بدە سەر شەق

٣. قەوس و قوزەحە تاقی برۆت ئەورۆ بە وەسمە
بۆیە دڵەکەم لەت لەتە بۆ خەنجەری ئەزرەق

٤. خۆم خستەوە بەرپێ بە ئومێدی سەری زولفت
دەخولێمەوە بەو ڕیشتەیی گیسو وەکوو مەزرەق

٥. دەرژێنێ بە یەك غەمزە نیگات خوێنی سپاهێ
دەشکێنێ بە ڕووی تۆبەشکەن تاقی خەوەرنەق

٦. بەو زولفی سەرازیر لەسەر چاهی زەنەخدان
ئاوێزە دڵم هەر وەکی هاڕووتە موعەللەق

٧. هاتم بە خەیاڵ سەیری گوڵستانی ڕوخت کەم
پێگیری خەیاڵیشی نەدا لووسی و ڕەونەق(؟)

٨. بەو زولفی سەراپا وەکوو ئاهوویی موقەییەد
یا شەهپەڕی تاووسە لە دووی کەبکی موتەووەق

٩. تا بەخت ڕەشی بۆ "حەسەن"ە باعیسی دووری
ڕووی زەردی بە سووراوی سریشکی بووە ئەبڵەق

پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ٢٣:

٢. لێی بدە بەسەر مەشق

٣. وەسمە/ ئەورۆ دەبووسم/ بەو خەنجەری (؟)

٤. خستووە

٥. دەرژێنێ/ سپایەك/ دەشکێنێ

٦. سەرازیری

٧. گوڵزاری ئیرەم بوو لە هەمووی جیلوەو ڕەونەق/ پەیگیری

٨. وەك ئاهووی/ لەویێ کەبکی موتەووەق
٩. تا بەختی ڕەشە بۆ "حەسەن" باعیسی دووری

نوسخەی حەسەنی قازی هەمان ٩ فەردی تۆمار کردووەو لە دەستپێکی شێعرەکەدا نووسیویەتی:

((وله ایضا رحمة الله تعالی))

دەقی قازی ئەحمەدیش تۆماری کردووە.

## (٢٤)

١. دەبا ساتێکی ساکین بێ لە ناڵین قەلبی خونخوارم
دەبا تاوێکی فاریغ بێ لە گریان چاوی خوونبارم
٢. هەتاکەی غەرقی سێڵاوی سریشكو ئەشکی خوێنین بم؟
دەبا جارێ بە گۆشەی چاوی مەیلێکی بکا یارم
٣. بە نای ناڵە و بە سینەی چەنگ وتاری غەم موهەییا بووم
بڵێن بۆ سەیری ئەم بەزمە دەمێ باوابێ دڵدارم
٤. دەرمکەی گەر لەلای خۆت، یا جوێنم پێ بدەی، ناچم
بە زنجیری دوو گیسووت چونکە پێبەندو گرفتارم
٥ نییە تەئسیری وەعزت واعیزا! دەس هەڵگرە لێمان
کە موددێکە بە بادەی چاوی مەستی مەستو خەممارم
٦. شەتی ئەشکم هەتاکەی بێ، مەگەر سەیحوونو جەیحوونە؟
بە چاوم کوت دەبا بەس بێ، وتی ڕۆبارو جۆبارم
٧. لە تاوی زولفی چین چینت ئەسیری چینو ماچینم
لە سایەی زولفو ڕووت، گەهـ ڕۆژپەرست، گەهـ بەستەزوننارم
٨. ئەگەرچی حیکمەتە دەرسم، لە حەڵقەی مەدرەسەی عیشقت
گەهێ دەرسم گوڵستانە، گەهێ مەشغووڵی تۆمارم
٩. ترازا دوگمەکەی سینەت، سپیدەی سوبح زاهیر بوو،
لە یەك مەشریق دوو ڕۆژم دی، بەجارێ بەو شەوی تارم
١٠. بڵێسەی ئاهی سەردم ئاسمانی شینو تاریی کرد
یەقین گوێی ئاسمان کەڕبوو لەبەر فیغانو هاوارم
١١. "حەسەن"! چەن خۆشە ناڵینت، ئەگەر یار بێتە باڵینت
بە شەرتێ بێتە سەر قەبرم، بە مردن زۆر منەتبارم.

**پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ٢٤:**

٢. خونین

دەقی قازی ئەحمەد هەر ئەو ١١ فەردەی تۆمار کردووە.

نوسخەی حەسەنی قازی ئەم شێعرەی نەگرتۆتە بەر.

١. تا سەری زولفت ڕفاندی دڵ لە بۆ نێو ئاوری ڕووت
سۆزشم خوارد و وەکوو ماری سەر ئاور خەم دەخۆم
٢. بۆ تەواف کەعبەیی کۆی شەمسی دینە، وا "حەسەن"!
هەروەکوو مزرەق بە هەر مەرزو دیارێ خول دەخۆم
٣. بۆ تەمای ئاوی بەقا، دڵ کەوتە نێو زوڵماتەوە
دەستی من دامانی زولفت، پێم بڵێ بۆ کوێ بڕۆم؟
٤. قووەتی قەلبم کە تۆی و قووتی ڕۆحم عیشقتە،
بۆ چ دەبێ باکم لە ماسیوا ببێ، خەم بۆ چی بخۆم؟
٥. یۆسفی میسری ویلایەت! ئەی خەلیلی باغی قودس!
ناری نەمروودە دەرون بێ تۆ، دووچاوم بۆتە چۆم
٦. من بەسەر کەوتوومە بەر پێ، زولفی چەوگان بادەوە!
هەر لە تفلّی، من ئەسیری لوعبەتی چەوگان و گۆم
٧. من لە گوڵزاری ئەزەل گیراوی داوی زولفی تۆم
بەس بدە چەرخم لەسەر، بازم! کە تەیری دەستەمۆم.

**پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ٢٥:**

٢. بۆ تەواف کەعبە گەردی شەمسی دینە، وا حەسەن!
هەروەکوو مەزرەق بەهەر مەرزو دیارێ خول دەخۆم
٣. لەسەر فەردی ژمارە ٣ بە هەمان شێوە خەت نووسراوە:
((دڵ لە بۆ ئاوی بەقای لێو)) و پاشان: ((بۆ تەمای...))
وێدەچێ ئەم دوو دڵییە هی شاعیر خۆی بێت.
دەقی چاپکراوی قازی ئەحمەد
دڵ لە بۆ ئاوی بەقای تۆ بۆ کوێ بچم؟
٦. زولفی وەك چەوگانی تۆ

دەقی ئەم شێعرە لە نوسخەی حەسەنی قازی‌دا نابینرێت. لە دەستنووسەکانی بەردەستی منیشدا تەنیا یەك جار هاتووە. دەقی چاپکراوی قازی ئەحمەد (ل٤٣) شەش فەردە و فەردی یەکەمی ئەم نوسخەیەی نییە.

خاڵی گرنگ لە پەیوەندی شێعرەکەدا ئەوەیە کە وێدەچێ ناتەواو بێت و لای کەم فەردی یەکەم واتە مەتلەع یا چەندین فەردی لێ فەوتابێت. هۆی بۆچوونەکەش ئەوەیە شێعرەکە غەزەلەو ڕەدیف یا سەروای کۆتایی هەموو فەردەکان یەکتر دەگرنەوە، بەڵام فەردی یەکەم کە بەشێوەی عادەت دەبوایە هەردوو میسراعی یەکەم و دووهەمی خاوەنی یەك سەروا و ڕەدیف بن، وا نییەو نیشان دەدات کە فەردی یەکەمی غەزەلەکە نەبووە.

هەر لەم پەیوەندییەدا دەبێ دەست نیشانی نازناوی شاعیر بکەم – کە "حەسەن"ە و لە جیاتی ئەوەی لە کۆتایی غەزەلەکەدا بێت، هاتۆتە فەردی دووهەم. لە شێعری کلاسیکدا بینراوە کە تەخەللوسی شاعیر لە دوو یا سێ فەردی پێش کۆتایی شێعرەکەدا بێت، بەڵام بە دەگمەن شتی وا ڕووی داوە شاعیر لە غەزەلێکی ٧ فەردیدا، نازناوی خۆی بخاتە فەردی دووهەمەوە. بە کورتی، شوێنی فەردەکان شێواون. دەقی چاپکراوی قازی ئەحمەد هەمان ئەو فەردی (٧) ەی لە کۆتایی غەزەلە شەش فەردییەکەیدا هێناوە.

١. عەنبەری زولفت بەدەم سەبادە
لەسەر مانگی ڕووت هەوری مووت لادە
٢. تا ڕۆژ وەکوو شێت ڕوو لە کێوان کا
تۆزێ غوسەو غەم هەستە بە با دە
٣. لە عیشقت مردم، وەسییەتت بێ:
بۆ خۆت بمنێژە، تەڵقینم دادە
٤. تا بڵێن زوحاك مار لەسەر شانی
تا یەك لە زولفی چین چینت بادە
٥. بە جامی دیدە، جەمشیدی جەمە
بە تەختی سینە، وەك کەیقوبادە
٦. کوتم کوشتوومت بە غەمزە، فەرمووی
شێوەی شیرینە، ڕەسمی فەرهادە
٧. لە دووری باڵات شەو هەتا سەحەر
کارم گریانە، پیشەم فەریادە
٨. تاکوو پامالْ بێ خوێنی مەزلوومان
پەنجەی شمشاڵت ڕەنگو حەنادە
٩. بە ئومێدی وەم بێیە سەر قەبرم
بۆیە وا "حەسەن" بە مردن شادە

**پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ٢٦:**

ئەم شێعرە لەناو دەستنووسەکانو هەروەها دەفتەری حەسەنی قازیدا نەبینراو من لەبەر دەقی قازی ئەحمەد نووسیمەوە.

٧. فریاد

١. قەدی یار سەروی جۆبار و ئەتۆ ئەی زولفی لاولاوی!
سەراپا، حەڵقە حەڵقە، وا لە باڵای بەرزی ئاڵاوی
٢. هەموو ئەعزام بریندارە لە حەملەی تیغی موژگانی
دڵم شەیداو پەرێشانە لەتاوی زولفی شێواوی
٣. خراپم کردوە ڕۆح و دڵم دانا لە پێناوت
دەسا قوربان! لەبەرچی، بۆچی ئەمڕۆ لێمە تۆراوی؟
٤. کەلام و عیشقی تۆ بوو باعیسی مەشهووریی حوسنی وی
کەچی وێستا وەکوو زولفی لەبەرپێدا فرێدراوی
٥. بەتوندی، یار چ شیرینە جەبین وەك عیقدەیی پەروین
دوو کوڵمی لالەیی حەمرا، برۆی وەك تیغی خوێناوی
٦. دڵم ڕێی کەوتە نێو ئەگریجەو یاریش برۆی داخست
سەمەندەرنی، لەنێو ئاور عەجەب ماوم چلۆن ماوی!
٧. بەخاڵی لێوی بردوومی، بە زولفی خاوی گرتوومی
چ زوو ئەی مورغی زیرەك! بوویە سەیدی دانەو داوی
٨. بیساتی عەیش بەرپاکە لە ژێر پێ تا نەسووڕاوی
لە مەستی بادە بشکێنە هەتا وەك شیشە نەشکاوی
٩. "حەسەن"! وا دیارە دیسان موبتەلای هیجرانی یاری تۆ
بە ئەشکی سوورو ڕەنگی زەردو ئەو دوو لێوی باراویی!

پەراوێزی پارچە شیعری ژمارە ٢٧:

١. قەدی یا سەروی جۆباری ئەتۆ ئەی زولفی لاولاوی!
٢. هەموو گیانم
٣. خراپم کرد ڕوح و ماڵم، دڵم دانا دەپێناوت
دەسا قوربان بفەرموو بۆچی
٤. حوسنی ئەو
٥. لەبی وەك قەندی شیرینە، جەبین وەك عەقدی پەروینە

**دوو کوڵمی لالەیی حەمرایە، ڕووی وەك تیغی خوێناوی**

**٦. ئاور**

**٨. عەیشی/ نەسووتاوی/ بە مەستی**

**٩. ئەشکی سوور**

**نوسخەی قازی ئەحمەد (ل٤٢) هەر ٩ فەردەکەی تۆمار کردووەو تەرتیبی شێعرەکانیش لەگەڵ ئەم دەقەدا یەك دەگرنەوە، بەڵام لە وشەو تێرمدا جیاوازییان هەیە.**

١. له عالەم فاش و مەشهووره که من مەستی مەیی عیشقم
بە حوققەی دەم، بە جامی دیده، مەمکی تونگی مینابێ
٢. له حوجرەی عیشقدا ئەمشەو موتالآم "حاشیه"ی زولفه
بەلالەی کوڵمی گوڵگوونی بە دوو شەمعی هەڵایسابێ
٣. له ئاهی عاشقی ڕووته غوباری عاریزی سافت
دەنا جامی بلووری خەددی تۆ کێ دی خەتی دابێ
٤. خەیاڵم شەونخوونی برده سەر دەستەی سپای زولفت
دەبێ ئەمشەو لەبەر وی بێ کەوا مەغشووش و شێوا بێ
٥. تەناف گەردنم که زولفی زوننارت، که بێزارم
چ خۆشه گەر بڵێن عاشق به زولفی یار خنکابێ
٦. کەنارم جۆیبارو دامەنم پڕ گوڵ له ئەشکی سوور
ئەگەر مەیلی قەدیمیشی نەمابێ بۆ تەماشابێ
٧.عەیارێکی نییه دڵ دڵبەرا! کێشانی پێ ناوێ
کەبابی جەرگ سووتاوه، یەقینه قیمەتی نابێ
٨. تەن و ڕۆحم له تەحت و فەوقەوه مەشغووڵی جولآیین
دەبێ بەو ساعیدی سیمین تەناف زولفی هەڵدابێ
٩. دوو چاوی من تەمی هێنا که تۆ زولفت بەڕوودا خست
شەوی یەڵدایه ئەوڕۆ یا مەگەر خورشیده گیرابێ
١٠. لەنێو زوڵماتی ئەگریجەت شوعاعی ڕووته دەنوێنێ
تەجەللی نووره، یا زاهیر له جانب تووری سینابێ
١١. ستارەی بەختی من ئەوشۆ تللووعی کرد که تۆ هاتی
سبەینێ و ڕۆژه لەم عیده، بلێ نوورو سەفای وابێ
١٢. له سایەی هیمەتی پیره "حەسەن"! دوشمن موتیعی تۆ
دەنا سەی بەد تەرەس کێ دی بەبێ زەحمەت پەتی دابێ؟

پەراوێزی پارچە شێعری ژمارە ۲۸:

شێعرەکە لە نوسخەی حەسەنی قازیدا نەهاتووە بەڵام قازی ئەحمەد لە لاپەڕە ٦٦ی کتێبەکەدا هێناویەتی.

لەم شێعرەشدا، مەتلەع واتە فەردی یەکەم کە دەبێ بەپێی نەریتی شێعری کلاسیك هەردوو میسراعەکەی هەڵگری سەروا و ڕەدیفی هاوچەشن بن، دیار نییە. یا فەردەکەو چەند فەردی فەوتاون، یاخود سەیف گوێی نەداوەتە ئەو نەریتە دامەزراوە کۆنەی شاعیری کلاسیك ڕەچاوی کردووە.

۲. بە لالەی شەمعی

٤. خەیاڵم شەو هوجومی

٥. تەناڤ

٦. ئەگەر مەیلی قەدی بێ میسلی نابێ،

٨. تەن و ڕۆحم بەترس و لەرزەوە

٩. هەڵدابێ؟

١٠. دەنوێنی؟

١١. سبەینێ ڕۆژی ئەم عیدە

١٢. دەنا "سەی لا مەزەب"

(٢٩)

١. دایم دڵم بەناڵەو زاریو فیغان ئەڵێ
خۆش بەو شەوەی کە ڕۆژی ڕوخی دڵبەرم هەڵێ
٢. تفلی دڵم گرووی شەکەری لێوی گرتووە
بەو دوو هەنارە ژیریکەوە، بیخە باغەڵێ!
٣. زولفت وەلا دە، ڕووت بنوێنە بە دەفعەیێ
شەو ڕابرێ، ستارە نەمێنێ، قەمەر هەڵێ
٤. بەو زولفە میروەحەت مەکە مەنعم لە شەکری لێو
تەیریکە دڵ، زەعیفە، دەترسێ لە داوەڵێ
٥. ئەو قافیەت بە سانی دڵی موددەعی، حەسەن!
تەنگە، درەنگە، مەیلی بە جەنگە، هەڵێ، مەڵێ!

**پەراوێزی پارچە شیعری ژمارە ٢٩:**

ئەم پارچە شیعرە لەناو دەستنووسەکاندا نەبوو و من لەبەر دەقی چاپکراوی قازی ئەحمەد نووسیمەوە (لاپەڕە ٣٣)، بەڵام دواتر لە نوسخەی دەستنووسی حەسەنی قازیدا چاوم پێی کەوت، کە لەسەرەتاکەیدا نووسراوە: "غەزەلی عیشقی"و ئینجا بەم فەردە دەستی پێکراوە، کە هەندێك جیاوازە لە دەقی چاپی قازی ئەحمەد:

((تیفلی دڵم بەناڵەو زاریو فوغان دەڵێ...

وهەر لە سەرەتادا نووسیویەتی:

"ئاغای عەلی سەیفی قازی دیکتەی کرد.))

ژمارەی فەردەکانی ئەم شیعرە، کەمە بەڵام بە حیسابی مەقتەع- واتە دێڕی کۆتایی کە تێیدا شاعیر باسی "تەنگ بوونی قافیە" بۆ خۆی دەکات، دوور نییە هەر لە ئەسڵدا لەو پێنج فەردە زیاتر نەبووبێت.

هەردوو دەقەکە ٥ فەردیان تۆمار کردووە، بەڵام شوێنی فەردەکان لەگەڵ یەکتردا یەك ناگرنەوە.

١. تیفلی دڵم/ فوغان
٢. بێتە باغەڵی

**شێعرێکی لاواز**

**که ئێمه بەگومانین هی سەیف بێ**

ئەم پارچه شێعره له ناو دەستنووسەکاندایه، که ناوی خاوەنەکەی به سەرەوه نییه، لاوازیی شێعرەکه بۆ ئەوه نابێ که به کاری سەیف بزانرێ. هاوکارم قازی که شێعرەکەی نووسیوەتەوه و ساغی کردووەتەوه، هەر ئەو بۆچوونەی هەیه و دەڵێ بۆ شێعری کوردی سەیف، لاوازه. لەگەڵ ئەوەشدا هەر به باشی دەزانم لێرەدا بڵاو ببێتەوه. دیاره تا ئەو دەمەی که خاوەنەکەی دەست نیشان دەکرێ دەتوانین به شێعری سەیفی دابنێین:

کوردان که جاران له ئێران شا بوون،

ئێستا ژێردەست و پەست و گەدا بوون

جێی ڕاو و سەیری کاری کوردان بوون

له ڕەوەی کێوان نەڕەی شێران بوو

تا پێکەوه بوون هەموو برا بون

که لێك دابران، جەرگ بڕاو بوون

ئێسته یەك یەکیان له خەو ڕا ڕابوون

که ساحێب فیکر و تەگبیر و ڕابوون

ئەمڕۆ بزانن که بەش خوراوین

له بورجی خۆمان وەدوور خراوین

تا کەی ژێردەستی و ئیتاعەت کێشی؟

لازمه بۆمه مەئال ئەندێشی

بۆ زانیاریی زیاتر دەبێ بڵێم شێعرەکە- چ له باری ناوەرۆك و چ لایەنی داڕشتن و تەنانەت کێشەوه، له شێعرێکی ئەبولقاسمی لاهووتی کرماشانی دەچێ. دیاره شێعرەکەی لاهووتی ئێرانچییەتی تێدا کراوەو هەوڵی ئەوەیەتی کورد به کلکی ئێرانەوه ببەستێ.

لەکاتێکدا ئەم شێعره، لایەنی نەتەوایەتی کوردیی تێدا بەهێزه، بۆ بەراوردکاریی چەند فەردێکی شێعرەکەی لاهووتی لێرەدا دەهێنمەوه. لاهووتی و

سەیف هاوسەردەم بوون و بە حیسابی هاودڵی و هاوتەریبی بیریی سیاسی سەیف لەگەڵ شێخ محەمەدی خیابانی و ئەو ڕاستییەی کە لاهووتی ماوەی ساڵێك دوای تێکشکانی بزووتنەوەی خیابانی و کوژرانی ڕێبەرەکەی، لە شاری تەورێز "شۆڕشی سوور"ی بەرپا کرد بکوژی خیابانی- واتە "موخبیروسەلتەنە"ی دەست بەسەر کرد، بە دووری نابینم چەشنە پێوەند و نزیکایەتییەك لە نێوان سەیف و لاهووتیدا بووبێ، یان لانی کەم سەیف شێعری لاهووتی ناسیبێ کە ئەو دەم ناوی زۆر دەرکردبوو و تەنانەت یەکەم کۆمەڵە شێعریشی لە شاری تەورێز چاپ کرابوو، ئەوەش شێعرەکەی لاهووتییە، کە لە ژمارە ٢٥ی گۆڤاری ژین (ساڵی پێنجەم)، لە ئەستەنبووڵ چاپ کراوە:

### بۆ نەژادی کورد

لە دەر دا وەتەن جەرگم بریانەن
هەناسەم سەردەن، دیدەم گریانەن
هەی داد، هەی بێداد، کورد بێدار نییەن
لە نژاد خۆ خەوەردار نییەن
ئێران شەهانشای هەموو دنیا بی
حوکمش لە هەموو عالەم ڕەوا بی
وەها زەلیل بین ئێران نەژادان
کورد و لوڕ وْ فارس، نیکو نیهادان
کو نەسل خویان فەرامۆش کەردەن
لە جەهلا حەرفی دوژمن گۆش کەردەن
ئێران بە مەسەل وەکوو جیسمابوو
کورد و لوڕ و فارس لەوی ئەعزا بوو
ئەگەر ژ بەدەن ئەعزا جودا بوو
ئەڵبەت ئەو بەدەن مەحو و فەنا بوو

بۆ سەرجەمی شێعرەکەی لاهووتی، بڕوانە: ئەنوەر سوڵتانی، "لاهووتی کرماشانی شاعیری شۆڕشگێڕی کورد"، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٦، لل٢٦٠-٢٦٤.

## شێعری عەرەبی و تورکیی سەیف

لێزانی و پسپۆرایەتی سەیف تەنیا لە ئەدەبی کوردی و فارسیدا بەربەست نەماوەتەوە و وەك زۆر شاعیر و ئەدیبی دیکەی کورد، زمانی داگیرکەرانی کوردستانیشی بە باشی زانیوە. هۆکاری ئاشکرای کارەکەش ئەوەیە سەیف مەلا بووە و بە ڕەسمی سەردەم لە سەردەمی فەقێتیەتی دا زانستی باوی ناو حوجرە و مزگەوتەکانی کوردستانی بە عەرەبی خوێندووە و لە زمانی عەرەبیدا شارەزایی تەواوی پەیدا کردووە. هەروەها بە گوێرەی شوێنایەتی ژیانی لەسەر چۆمی جەغەتووی بن گوێی میاندواو، زمانی تورکی ئازەربایجانیشی بە باشی زانیوە و وەك ئاگادارین، دوو هاوسەری ژیانیشی تورکی ئازەربایجانی بوون، کە وابوو پێکهاتەی مرخی شاعیری لەگەڵ شارەزایی ئەو دوو زمانە، بوونەتە هۆی ئەوەی بە عەرەبی و تورکی شێعری خوێندبێتەوە و شێعری گوتبێت. ئەوەی دەڵێم شێعری خوێندبێتەوە لەسەر ئەو بنەمایەیە کە یەك لە شێعرە تورکییەکانی ڕەدیفی "بەنی" واتە "من" /بۆ من/ لە من"ی هەیە، کە لە باری ڕێزمانییەوە جێناوە. ئەو جێناوە لە تورکی ئازەربایجانیدا هەمان بیچمی فارسی و کوردی هەیە و وەك "مەن" دەکوترێت، لە کاتێکدا ترکییە عوسمانی (ئانادۆڵی) یەکەی "بەن"ە. جا کاتێ دەبینین سەیف "بەنی" لە شێعرەکەیدا بەکار دەهێنێ نەك "مەنی"، دەتوانین بگەینە ئەنجامی ئەوەی کە شێعر و زمانی ترکی (عوسمانی)شی زانیوە، ئەوەش تەنیا لە ڕێگەی خوێندنەوەی کتێب و بابەتەوە بۆی گونجاوە، دەنا ئێمە زانیارییەکمان لەسەر ئەوە نییە کە سەیف چووبێ بۆ خاکی عوسمانی یان تەنانەت باکووری کوردستان و لەوێ ژیابێ. کەوابوو، هەڵە نابێ ئەگەر بڵێین سەیف شێعری ترکیی عوسمانی "خوێندووەتەوە" و هەر بەو زمانە یا ترکی ئازەربایجانی یان بە پێکهاتەیەکی هەردووکیان شێعری گوتووە، بەداخەوە، ژمارەی ئەو شێعرە عەرەبی و ترکییانەی سەیف کە کەوتوونەتە بەردەستی من گەلێك کەمن و دڵنیام چەند قاتی هەردووکیانی هەبووە بەڵام مخابن لای من نین. با هیوادار بین کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ژمارەی زیاتری ئەو شێعرانە لە شوێنێك دەربکەون.

هەرچۆنێك بێ، ئەو شێعرە عەرەبی و ترکییانەی سەیف کە لەناو دەستنووسەکانی بەردەست دان، بریتین لە:

عەرەبی:

١- پارچە شێعرێك بەم مەتلەعە:

غداير حول الوجه　　سحب على البدر

غداير فوق الخد　　عود على الجمر

کە سەرجەم ١١ فەردە و لە مەقتەعەکەیدا نازناوی شاعیریی خۆی هێناوە:

فمت "حسن" يوم الوداع تاسفا

لعل حبيبى قد تمر على القبر

سێ نوسخەی ئەم شێعرە لەناو دەستنووسەکاندا دەبینرێن:

یەکەم و دووهەم بە شێوەی "نەستەعلیق" نووسراون و سێهەمیان کە ناتەواوە بە شێوەی نەسخ:

ئەلف- نوسخەی یەکەم، لە لاپەڕەیەکی تەواودا نووسراوە، دەستخەتی سەیف خۆیەتی و لە ژێریدا ئەم دێڕە فارسییە نووسراوە: ((١٢ شهر جمادى الثانى گفته و تحرير شد)).

ئینجا بە شێوە خەتێکی گەلێك هاوچەشن، خۆی یا کەسێکی تر (؟) نووسیویانە:

((١٢ شهر جمادى الثانى گفته و تحرير شد)).

شێوازی خەتەکە، نەستەعلیق و سەرجەمی ١١ فەردە کە لەو لاپەڕەیەدا جێگەی کراوەتەوە.

بێ- نووسخەی دووهەم، لە دوو لاپەڕەدا نووسراوەتەوە، هەمان ١١ فەردە و لە بەرایی شێعرەکە، لە لای دەستەچەپی سەرەوەی لاپەڕەکە نووسراوە:

((٢٩ خرداد وارد رضائيه شدم ١٣١٤))

لە کۆتایی شێعرەکەشدا ئەم ڕستەیە هاتووە:

((يكشنبه ١٥ تير ٥ ع ١٣٥٤/٢ در رضائيه تحرير شد.))

سەبارەت بە ڕستەکە دەبێ ئەم ڕوونکردنەوانە بدرێن:

١- ژمارەی ٥١ هەڵەیە و دەبێ ١٥ی مانگی تیر پووشپەڕ بێ،

٢- ساڵی ١٣٥٤ی مانگی بەرانبەرە لەگەڵ ١٠ مانگی ساڵی ١٩٣٥ و دوو مانگی ١٩٣٦ی زایینی، بەڵام "٥ ع:" نەزاندرا چییە.

هیچ مانگێکی کۆچی مانگی بە پیتی ع دەست پێ ناکا. بەڵام ئەگەر یادداشتی لای سەرەوەی شێعرەکە لەبەر چاو بگرین، ٢٩ی خوردادی ١٣١٤ی هەتاوی دەکاتە ١٩٣٥/٦/١٩ ئەویش بە گوێرەی "تقویم تطبیقی" بەرانبەر دەبێ لەگەڵ ڕۆژی ١٩٣٥/٧/٢.

٣- جا ئەگەر ٥١ی تیر هەڵە بێ، کە هەڵەیە و ١٥ تیر ڕاستە، سەیف لە کۆتاییەکانی بەهاری ساڵی ١٣١٤ی هیجری /١٣٥٤ی مانگی/ و ١٩٣٥ی زایینیدا گەیشتووەتە ورمێ و شێعرەکەی هەر لەو ماوەیەدا واتە دوای پازدە بیست ڕۆژێك گوتووە یان نووسیویەتەوە، بۆیە دەڵێم نوسیویەتەوە چونکوو سەیف لە شێعرە کوردی و فارسییەکانێشدا هێندێك جار شێعرێکی پێشتر گوتراوی خۆی سەرلەنوێ لە شوێنێکی دیکە نووسیوەتەوە و ڕێکەوتێکی نوێی ڕاگەیاندووە.

٤- تاقە بۆچوونێك کە سەبارەت بە کۆدی ٥ ع هەمبێ ئەوەیە ئامارەیەك بێ بە مانگی ربیع الثانی واتە ع بۆ "ربیع" و ٢ بۆ "ثانی" بوەستێ.

**پەخشانی سەیف**

سەیف قەڵەمێکی ڕەوان‌و بێ گرێی هەبوو جگە لە شێعر، گەلێك بابەتی "مونشییانە" و میرزایانەی نووسیون کە مۆرکی ئەدەبی ئەو سەردەمەی کوردستان‌و ئێرانیان بە سەرەوە دیارە. پەخشانی سەیف بە گشتی بە فارسی نووسراون‌و دەزانین لەو بڕگە زەمەنییەدا لە هەموو لایەك تەنانەت لە دەرەوەی ئێرانیش، کوردان بە زمانی فارسی خوێندوویانەو بە تایبەت نووسیویانە. گوڵستانی سەعدی لە حوجرەی فەقێیاندا بە دەرس گوتراوەو نامەی شەخسی بە فارسی نووسراوە. تەنانەت ئەگەر سەیری هەندێ شێعری شاعیران- بۆ نموونە چیرۆکە شێعری وەك خوسرەو شیرینی خانای قوبادی‌و لەیلی‌و مەجنوونی کەوکەب، و ئەوانی تر بکەین دەبینین پەخشانی سەرەتای فەسڵ‌و ڕاگەیاندنەکان بە فارسین، بەڵام شێعرەکان کوردین. واتە پەخشان نووسین بە فارسی دیاردەیەکی ئاسایی نێو خوێندەوارانی کورد بووە.

لە پەخشانی سەیف ئەوەی کەوتبێتە بەردەستی من‌و لێرەدا بتوانم ئاماژەی پێ بکەم، هەندێك وتارن کە وێدەچێ بەبۆنەی جیاواز وەك وەعزو خیتابەی مزگەوت یاخۆ وتاری فەرمی هەندێ دانیشتنی ئیداری- بۆ نموونە وتاردان بۆ قوتابیانی قوتابخانەو ڕووداوی ڕۆژانەی هاوچەشن، نووسیبنی و زۆر وا هەیە بەشێکیان هی ئەو سەردەمە بن کە سەیف بەرپرسیایەتی "ئیدارەی فەرهەنگ"ی مەهابادی لە ئەستۆ بووەو هانی خەڵکی داوە منداڵیان بنێرنە قوتابخانەو هانی قوتابیانیشی داوە دەرس بخوێنن.

بەشێکی دیکە لە پەخشانەکان "اخوانیات" واتە نامەی دۆستانەن بۆ دۆست‌و برادەری خۆی یاخۆ لە پەیوەندی کاروباری ناو خێزان‌و بنەماڵەی خۆیدان بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش‌و کاری ڕۆژانەو هەر هەمووشیان بەڕەسمی سەردەم بە فارسی نووسراون. من بەداخەوە هیچ پەخشانێکی کوردیی دوورو درێژی سەیفم لەناو بەڵگەنامەکاندا نەبینی‌و وەك گوتم، هۆکاری مەسەلەکەش ڕوونە، لەو سەردەمەدا نامەگۆڕینەوە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەگشتی بە فارسی بوو گەرچی ڕەحمەتی ئایەتوڵڵا مەردووخ کاتێ باسی نەمر دوکتۆر سەعید خانی کوردستانی دەکات دەڵێ نامەگۆڕینەوەمان بە کوردی بوو. بە کوردی نووسین زیاتر لە شێعردا خۆی نواندووەو کوردی زمانی شێعر بووە نەك پەخشان، کاتێکیش کەنامەیان بە کوردی بۆ یەکتر نووسیبێت، نامەی شێعری بووەو نموونەیەکیش کە مەردووخ لە

نامەگۆڕینەوەی خۆیو دوکتۆر سەعید خان دەیدات، هەر نامەی شێعرییە، سەیرێکی ساکاری نامەی کەسایەتی گەورەی کورد- بۆ نموونە، شێخ مەحموودی نەمر، ئەو ڕاستییە زیاتر دەسەلمێنێت، نموونەکەی ئەو نامانەیە وا بۆ شێخی دوزەخدەرەی لای سەقزی نووسیون.

سەیفیش نامە کوردییەکانی خۆی بۆ شەهید حەمە حسێن خانی کوڕیو "ئەحمەدی سەیفی"- کوڕی دیکەی خۆی، بە شێعر نووسیوە، هەروەها بۆ عەزیز ئاغای عەبباسیو عەلی بەگی حەیدەریو نامی (لەناو شێعرە فارسییەکانیشیدا چەندەها نامەو وەڵامی شێعری بۆ خەڵکانی جیاواز دەبینرێت).

نامە شێعرییەکانی سەیف لە بەشی شێعرەکاندا هاتوون، لێرەدا چەند نموونەیەك لە پەخشانەکانی دەهێنمەوەو دەقی ئەسڵی بابەتەکان دەخەمە بەرچاوی خوێنەر. هەروها لە گەڵ کاك حەسەنی قازی وەرگێڕاوی کوردی چەند دەق ئامادە دەکەین بۆ ئەوەی خوێنەری کورد شارەزای بیروبۆچوونی ناو بابەتەکانو هەروەها شێوازی نووسینو ڕاگەیاندنی سەیف ببێت.

**لیستەی پەخشانەکانی سەیف:**

١. نامەی ڕۆژی ١٣١٠/١٢/١٢ [=١٩٣٢/٣/٣] بۆ محەمەد حوسێن خانی کوڕی خۆی؛

٢. نامە بۆ عەزیز ئاغای عەبباسی لە کولتەپەی قورمیش؛

٣. نامە بۆ بانگهێشتنی ئاغای عەزیز خان و کاکە ڕەحیم لەلایەن سەیفەوە

٤. نامەی ڕۆژی ١٩ی ڕەبیعولسانی ١٣٤٦ی مانگی بۆ میرزا خەلیلی فەتتاحی قازی لەگەڵ وەرگێڕاوی کوردی (ئەم نامەیە لە کتێبی بیرەوەرییەکانی میرزا خەلیلدا چاپ کراوە و لە ژێریدا نووسراوە ((دەستخەتی ڕەحمەتی سەیفولقوزات)) [=١٩٢٧/١٠/١٦]؛

٥. نامە بۆ وەزارەتی جەنگی ئێران ١٣٢٠/٩/٦ [١٩٤١/١١/٢٧ز]

٦. دوو نامە بۆ ئۆستانداری ئۆستانی ٣و ٤. ئەودەم هەردوو ئۆستانی ٣ (ئازەربایجانی ڕۆژهەلات)و ئۆستانی ٤ (ئازەربایجانی ڕۆژئاوا) یەك بەڕێوەبەرایەتی ئیداریو یەك ئۆستاندار (موحافیز)یان هەبوو؛

٧. خوتبەی ڕۆژی هەینی (عەرەبیو فارسی)

٨. وەستا چراغ

۱۰/۱۲/۱۳ [۱۳] [= ۱۹۳۲/۳/٤]

**فرزند دلبند عزیزم حفظك همم تعالی**

**مکتوب دومی مورخه ۱۰/۱۱/۲۹ شما لای پاکت حضرت مستطاب قاضی مد ظله تعالی رسید از مژده سلامتی شما و اهل بیت فوق الغایه مشعوف و مسرور شده خدا را شکر گذاردم تعجب کردم که چرا مکتوبات شما بمن نرسیده حتی از کاغذ نداشتن بسیار اوقات تلخ شده در کاغذ ماقبل که از رضائیه بشما نوشتم گله کرده و بد گفتم که بمن کاغذ نمینویسید بعد معلومم شد که باعث کثرت برف و مسدود شدن راهها بوده است معذلك میبایست پست مکتوبات را دیر یا زود برساند بهر صورت دیروز جناب دکتر قاضی زاده مصطفی شوقی بگ زید اجلاله العالی بطرف ولایت مراجعت فرمودند توسط ایشان کاغذ بشما نوشته و دو جعبه پسته و پسته بادام وفندق هم فرستادم که به قره‌ویران بدهد از آنجا برای شما بفرستند بدستورالعملی نوشتم در محلی که معین نموده بکارید همینکه هوا مساعد شد قلمه‌هائیکه پایز کاشتیم و اکثرش خشك شده طرف دیگر خندقهاشرا قلمه بزنید و بیلکاری تمیز کرده از چایرش پاك نمائید جای چنارستان قدیم که چنار سیاه را همین یکطرف خندقهایش زده بودید چون اکثرش را خسرو تنبلی کرد آب نداده خشك شدند از نو طرف خالی مانده‌اش را قلمه سیاه بزنید راستهء باغ توت را هم از سر تا پائین قلمهء سیاه فعله دستش بیل بگیرد شروع به جویمال نمائید بطوریکه خودت مصلحت**

میدانید و البته تاحال شلگه را باز کرده‌اید که سیل جوب را پاك کند نمیدانم زمستان بعداز من با عرابه گمرهء گوسفند بجهت باغ کشیدید هرگاه نکشیده‌اید فوری بدهید بکشند بلکه باغ را این بار قوت بزنیم و باید در فکر برگرداندن باغ عبدالله آباد هم باشیم امسال ادارهء پرسخلوبگ کنترات نمیبندد و این پنبهء آخر را هم که حمل کرده‌بودید نمیخرند در اینجا برئیس اداره هم گفتم فایده نداشت لازم است پنبه‌ها را عودت داده یکنفر امین سرش بگذارید که باماشین پنبه دانه‌اش را برای کاشتن در آورند پنبه را خودمان لازم خواهیم داشت مالیات هر دو طرف را پیش از همه چیز مفروغ و پرداخت نمائید یکصد تومان آقای آقا میرزا رحمت شافعی را داده باشید بجاست بنده هم در اینجا یکصد تومان طلب صدیق الممالك ارومی را که بعدلیه از پارسال عارض شده ناطق وکیلش بود داده‌ام چهل و نه تومانش میماند آنهم قرار است بموعد سرخرمن تمسیك بدهم که نصفش را میبایست حضرت قاضی بدهد که از طلبهای قبل از تقسیم است هشتاد و سه تومان هم طلب حریر فروش پس داده هشتاد تومانیش میماند یکصد و پنجاه تومان دیگر هم که خورده قرض داشتم خدا را شکر همه را این سفر رد کرده‌ام حالا چهارصد و چهل تومان پیش آقای آقا میرزا هاشم خان از حقوقات باقی میماند دیروز هم شازده خانم پیغام داده بود که پنجصد ششصد تومان خشکه عوض لباس و غیره بفرستد که خودشان تهیه خودشانرا ببینندمنهم پیغام داده‌ام که این مبلغ زیاد است قوه ندارم دیگر هنوز تکلیف قطعی معین نشده است و آقا میرزا هاشم خان و شازده خانم بسیار مایلند آقای مجید خان تشریف بیاورد دیروز به دکتر قاضی زاده سفارش کردم که آقای مجید خان تشریف بیاورد لازم است خودت قره ویران رفته خواهش کنید که بنا بتقاضای آقای میرزا هاشم خان و علیه عالیه شهزاده خانم آقای کاك مجید تشریف بیاورد ولی ازش خواهش نمائید که سخاوت و حاتمیرا کنار بگذارد و مثل مسئلهء عقدکنانی نکند که هرچه آنها میگفتند قبول میفرمود و بماهم می قبولاند و مخارجهای بیموردی کردیم ولی حالا وضعییات طور دیگر وعده وعدهء اقتصاد است نباید حرف ایشان را گوش بدهد خدا شاهد است قرضهای آن سفر تا این سفرمانده بودند گندم و جو که از مال افتاد سبزه هم اینطور شد بنده هم خیال دارم در نظر گرفته‌ام تا سیصد سیصدو پنجاه تومانی در بسته براشان بفرستم که هرچه لباس و تدارك میخرند و لازم دارند

خودشان بخرند و قرار گذاشته‌ایم که هروقت حاضر شدند عروس را میان اتومبیل گذاشته بیاوریم دیگر لازم نباشد از آنجا کسی بیاید یا والده‌هات بیایند نهایت آقا میرزا هاشم خان فرمود بی مناسبت نیست جناب امیر امجد از اینجا همراه عروس باشد منهم دیروز خدمتشان رسیده عرض کردم فرمود بسیار بقاعده من برادر داماد هستم خودم و خانواده‌ام هم حاضریم همراه عروس باشیم حالا لازم است اطاقها را زودتر مهیاو جابجا نمائید یعنی درو پنجره‌شان بگذارید در معیت جناب دکتر دو قوتی پیچ در قیمت چهارده هزار فرستادم و لازم است استاد عزیز آقشقهای طرف حیات [ط] که سابق درست شده بودند و چشمهاشان بزرگ است چشمهاشان را کوچك نماید برسم قدیم مختصری بزرگتر از این یکورق کاغذ باشند خلاصه از چشمه آقشقهائیکه خودش درست کرده است کمکی کوچکتر باشند و امروز وفردا شیشه هم خریده میفرستم که زودتر شیشه هم بگذارید در فکر سفیدکردنشان هم باید باشیم نمیدانم وجه زیرچانه تلای [طلای] والدهء محترمه‌ات را آقا میرزا احمد میرزا حاجی چند فرستاد و قیمتش چند بوده است یکصد تومان والدهء احمد را هم البته پس داده و برایش به شك بدهید اینکه ذغال برای دولتمنزل حضرت قاضی فرستاده‌اید بسیار کار بقاعده و با موقع کرده‌اید باید خیلی خدمت باین دستگاه کرد که خداوند بهم نزند چهارپوط برنج عنبربو سوقات با بیست سی تومانی بجهت جناب حاجی ملا احمد دندانساز بفرست استاد احمد ریان سراج دو پوط برنج میبایست بدهیمش یك پوطش را حواله به آقا میرزا احمد حاجی حواله داده میدهد اگر پوط دیگرش را نداده‌اند او را هم برایش بفرستید برنج را زیاد نمك بزنید و زیاد بکوبند بواسطه نکوبیدن و سفید نشدن برنجهای ما قیمت نمیکند و کساد است بلی در اینجا برای من هم دویست تومانی لازم است بفرستید که بهجت مخارج لازم میشود چون در این موقع برای اهل بیت هم لباس و غیره لازم است که با خود بیاورم کره مادیان سرخ را بفرست از اسب آقای صدر فحل بدهند مادیان کهر (گوله) هم از اسب آقای باباخان بیگ بیشتر از این نمیدانم چه بنویسم هرگاه دور و بر گندم را برعایای خودشان خروار[ی] از قرار ده‌تومان داده‌اند شماهم بدهید که پول لازم داریم همسایه‌ها چه طور و به چه میزان داده‌اند شما هم هرمقدار و هر طور مصلحت میدانید بدهید انسانیت که ندارند امسال باید شلتوك زیاد بکاریم و خیلی زود هم

بکاریم بفرست حمه گده آمده تخم پاك کند دستور داده‌ام ده پوط شلتوك صدری بیاید بکاریم بیشه را درآورید برای بوستان و پنبه دو قطعه زمین کلشجار جنوب و شمال چنارستان دره را زودتر بدهید شخم بزنند بجهت ؟ که علفهایش خشك شود بستانچی به ؟ زیاد بگیرید مثل پارسال قاطی نشوند حه‌مه خوری با یکنفر برای بستانچی کفایت است ولی چهار پنج نفر ؟ باشی بهتر است سلطان آدم خوبیست جفتیارهم زیاد بگیرید چارکدار را بلکه از اطراف خانه‌شان بیاورید مناف جای کربلایی عبدالله ؟ باشد جناب دکتر قاضی زاده را هم چهل تومان دادم ایشانهم دوربین خوبی باسم شما سوقات آورده‌اند والسلام

سیف القضات قاضی

وەرگێڕانی کوردیی:

ڕۆڵەی بەندی دڵی خۆشەویستم، خودا بتپارێزێ !

نامەی دووهەمتان کە هی ڕۆژی ١٠/١١/٢٩ [١٣] [ = ١٩٣٢/٢/١٨] بوو، دە ناو پاکەتی (زەرفی) حەزرەتی موستەتابی قازی- خودا سایەی درێژ کا، گەیشت. لە مزگێنیی سەلامەتیی ئێوە و کەس‌وکار گەلێك شادمان و خۆشحاڵ بووم و شوکری خودام کرد. پێم سەیر بوو بۆچی نامەکانتان نەگەیشتوونەتە دەستم، تەنانەت نەگەیشتنی نامەم گەلێك پێ ناخۆش بوو و لە نامەی پێشوودا کە لە ڕەزائییەوە بۆم نووسین گلەییم کرد و گوتم بۆ نامە نانووسن. پاشان لێم ڕوون بووەوە کە هۆکارەکەی بەفری زۆر و بەسترانی ڕێگاکان بووە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبوایە پۆستخانە، دەرنگ یان زوو، نامەکان بگەیێنێ.

هەر چۆنێك بێ، دوێنێ دوکتور قازی زادە مستەفا شەوقی بەگ خودا شەوکەتی بەرز کا بەرەو وڵات گەڕانەوە و بەودا نامەم بۆ ناردوون و دوو قوتوو پستەو بادام و فندقیشم نارد کە بیدا بە قەرەوێران و لەوێوە بۆ ئێوەی بنێرن. دەستوورلعەمەلێکیشم نووسیوە کە لەو جێگەیەی دیاری کراوە بیانچێنن، هەر کە هەواش خۆش بوو، ئەو قەڵەمانەی پاییزێ نابوومانەوە و زۆربەیان وشك بوون، لە لای دیکەی خەندەکەکان قەڵەمە دابچەقێننەوە و باشی پێمەڕەکاری بکەن و لە گیای چایر پاکی بکەنەوە. لە جیاتی چنارستانی کۆن، کە چناری ڕەشتان لە لایەکی خەندەکەکان نابووەوە، لەبەر

ئەوەی خەسرەو تەنبەڵی کردو ئاوی نەدان، زۆریان وشك هەڵگەڕان، جا ئەولایەی وا بەتاڵ ماوەتەوە سەرلەنوێ قەڵەمەی ڕەشی لێ بدەن. ڕاستە باغی توووەکەش لە سەرەوە تا خوارێ، قەڵەمەی ڕەشی لێ بنێژن. شوێنی تووتن [؟]ی قەراغ جۆگەکەش زووتر قەڵەمەی ڕەشی لێ بدەن، هەر کە کرێکاریش دەستی پێمەڕەی گرت [واتە هەوا خۆش بوو]، دەست بکەن بە جۆماڵ ئەویش بە شێوەیەك کە خۆتان پێتان باشە. دیارە تا ئێستا شەلەگەتان کردووەتەوە بۆ ئەوەی سێلاو جۆگە پاك بکاتەوە. نازانم لە زستانی دوای من بە عەرابە گەمڕەی مەڕتان بۆ باغەکە بردووە یان نا ؟ ئەگەر نەتان کێشاوە، بەدەست بەجێ بیدە با بیکێشن بەڵکوو ئەمجارە باغەکە بەهێز بکەین. هەروەها دەبێ دەبیری هەڵگێڕانەوەی باغی عەولاباتیش دابین. ئەمساڵ دایرەی پرسخلوبەگ [؟] کۆنترات نابەستێ و ئەو لۆکەیەش ناکڕێ کە لە دواییانە دا ڕاتانگوێستبوو. لێرە بە سەرۆکی دایرەکەشم گوت سوودی نەبوو، پێویستە لۆکەکە بگەڕێننەوە دواوە و کەسێکی جێی متمانەی لەسەر دابنێن بۆ ئەوەی بە مەکینە دەنکە لۆکەکانی دەربهێنێ بۆ چاندن. لۆکەکەش خۆمان پێویستمان پێی دەبێ. ماڵییاتی [=باج] هەردوو لاش بەر لە هەموو شت بدەن. ئەگەر سەد تمەنەکەی میرزا ڕەحمەتی شافیعیتان دابێتەوە لە شوێنی خۆیدا بووە. لێرەش سەد تمەنی قەرزی سەدیقولمەمالیکی ورمێییم داوەتەوە کە پارەکە شکایەتی عەدلییەی کردبوو و پارێزەرەکەی ناتیق بوو، چلو نۆ تمەنی ماوەتەوە بڕیار وایە بە وەعدەی سەرخەمان بیدەمێ، بەلام دەبێ نیوەی حەزرەتی قازی بیداتەوە لەبەر ئەوەی لە قەرزەکانی پێش دابەشکردن[ی میرات]ـە، هەشتاو سێ تمەنیش قەرزی حەریر فرۆشم داوەتەوە، هەشتا تمەنی ماوە. سەدو پەنجا تمەنی دیکەشم وردە قەرز هەبوو، کە لەم سەفەرەدا داومنەتەوە، ئێستاش چوارسەد و چل تمەن لەلای ئاغای ئاغا میرزا هاشم خان ماوەتەوە، دوێنێش شازادە خانم وەلامی ناردبوو کە پێنجسەد تمەنی نەغدی بۆ جلوبەرگ و ئەوانە بۆ بنێرم کە خۆیان دابینی کەن، منیش پەیامم بۆ نارد کە ئەو بڕە، زۆرە و لە وزەی مندا نییە. ئیتر هێشتا تەکلیف تەواو ڕوون نەبووەتەوە و ئاغا میرزا هاشم خان و شازادە خانم زۆریان پێ خۆشە کە ئاغای مەجید خان تەشریف بهێنێ. دوێنێ بە دوکتور قازی زادە دا ڕامئەسپارد ئاغای کاك مەجید تەشریف بهێنێ. پێویستە بۆ خۆت بچی بۆ قەرەوێران و لە ئاغای کاك مەجید بخوازی لەسەر داوای

ئاغای میرزا هاشم خان و ڕێزداری پایه بەرز شازادە خانم تەشریف بهێنێ، بەڵام تکای لێ بکە دڵنیاوایی و حاتەم سیفەتی بەلاوە بنێ و نەیکاتە مەسەلەی مارەکردنەکە، کە هەرچی ئەوان بیانگوتبایە قەبووڵی دەفەرموو و بە ئێمەشی دەقەبووڵاند، مخاریجێکی بێجێمان کرد، بەڵام ئێستا بارودۆخ بە چەشنێکی دیکەیە و زەمان زەمانی ئابوورییە. نابێ گوێ بداتە ئەوان، خودا ئاگادارە قەرزی ئەو سەفەرە هەتا ئەم سەفەرە هەر مابوو، گەنم و جۆ لە برەو کەوت و سەوزەواتیش هەروەها. منیش بە تەمام و وام لەبەرچاو گرتووە تا سێسەدو پەنجا تمەنیان بە سەربەستراوی بۆ بنێرم کە هەرچی جلوبەرگ و تەداروکە و دەیکڕن و پێویستیان پێیەتی، با خۆیان بیکڕن و وامان داناوە کە هەرکاتێك ئامادە بوون بووك لەناو ئوتومبێلێك نێن و بهێنین و ئیتر پێویست نەکا لەوێوە کەس بێ یان دایکەکانت بێن. نیهایەت، ئاغای میرزا هاشم خان فەرمووی بێجێ نییە جەنابی ئەمیر ئەمجەد لێرەوە لەگەڵ بووك بێ، منیش دوێنێ بە خزمەتیان گەیشتم و عەرزم کردن، فەرموویان زۆر بە قاعیدەیە من برای زاوام، خۆم و هاوسەرم ئامادەین لەگەڵ بووکدا بین. ئێستا پێویستە هەرچی زووتر دیوەکان ئامادە و جێ بەجێ بکەن، واتە دەرك و پەنجەرەیان تێبگرن. بە دوکتور [قازی زادە]دا دوو قوتوو پێچی دەرگا بە قیمەتی چاردەهەزار [!]م نارد و پێویستە ئاگردانەکانی [؟] لای حەوشە، کە پێشتر دروست کرابوون و چاویان گەورە بوو، وەستا عەزیز چاویان بچووك بکاتەوەو بە دابی کۆن هێندێك گەورەتر بێ لە قەبارەی ئەم پەڕە کاغەزەدا، بە کورتی لە چاوی ئاگردانەکانی کە خۆی دروستی کردوون بچووکتر بن، ئەمڕۆ و سبەی شووشەش دەکڕم و دەینێرم کە شووشەی پەنجەرەکان زووتر تێبخەن. لە بیری سپیکاری [دیوارەکان]یشدا بن نازانم ئاغای میرزا ئەحمەدی میرزا حاجی چەندە دراوی لە بری ژێرچەنەی زێڕی دایکی بەڕێزت ناردو نرخەکەی چەند بووە. سەد تمەنی دایکی ئەحمەدیش هەڵبەت دەبێ بدەنەوە و بۆی بدەن بە شەك. ئەوەی ڕەژیتان بۆ ماڵی حەزرەتی قازی ناردووە، گەلێك کارێکی بەڕێوجێیە و لە کاتی خۆیدا کراوە. دەبێ زۆر خزمەتی ئەم دامودەزگایە بکرێ کە خودا تێکی نەدا، چوار پووت برینجی عەنبەربۆ لەگەڵ بیست سی تمەن بنێرە بۆ جەنابی حاجی مەلا ئەحمەدی ددانساز. دەبێ دوو پووت برنج بدەین بە وەستا ئەحمەدی ڕەیانی سەراج، پووتێکیانم حەواڵە کردووە ئاغای میرزا ئەحمەدی مێرزا حاجی بیداتێ، ئەگەر

پووتەکەی دیکەیان نەداوەتێ ئەویشی بۆ بنێرن. خوێی زۆر لە برینجەکە بدەن و زۆری بکوتن، برینجی ئێمە لەبەر نەکوتران و سپی نەبوونەوە نرخیان نییە و کەسادە. بەڵێ، لێرە دووسەد تمەنێکیش پێویستە بۆ خۆم بنێرن کە بۆ مخاریج پێویستم پێی دەبێ. لەبەر ئەوەی ئێستا بۆ خاو و خێزانی ماڵێش جلوبەرگ و شتی تر پێویستە لەگەڵ خۆمدا بهێنم. ماینە سووریش لە ئەسپی ئاغای سەدرفەحل بکەن. ماینە شێیەش (گوڵە) لە ئەسپی باباخان بەگ. لەوە زیاتر نازانم چ بنووسم. ئەگەر دەوروبەرەکەمان هەموو گەنمیان خەرواری بە ١٠ تمەن داوە بە رەعیەتەکانی خۆیان، ئەوا ئێوەش بیدەن کە دراومان پێویستە، دراوسێکان چۆن و چەندەیان داوە ئێوەش چەندی و چۆنی بە سەڵاحتان زانی بیدەن خۆ ئینسانییەتیان نییە.

ئەمساڵ دەبێ چەڵتوکێکی زۆر بچێنین و زووش ئەو کارە بکەین. بنێرە با حەمە گەدە بێ و تۆو پاك بکا. گوتوومە دەپووت چەڵتووکی سەدری بێ و بیچێنین. مێشەکە دەربهێنن بۆ بێستان و لۆکە، دوو پارچە زەوی کلۆشەجاری باشوور و باکووری چنارستانی نێو دۆڵی بدە با زوو بکێڵدرێن بۆ ئەوەی گیایەکانی وشك بن. بێستانچی بە ... ... زۆر لەبەر کاربنێن با وەکوو پارەکەی لێ نەیە. حەمە خوری لەگەڵ کەسێکی دی بۆ بێستانچێتی بەسە بەڵام چوار پێنج کەس ... باشی هەبن باشترە. سوڵتانی دارکێش [و] کورەکانی، گاوان بن" سوڵتان مرۆیەکی باشە. جووتێریش زۆر لەبەرکار بنێن، چارەکدار بەڵکوو لە دەوروبەری ماڵەکانیان بێنن. مەناف لە جیاتی کەربەلایی عەبدولا... بێ. چل تمەنم دا بە جەنابی دوکتور قازی زادە، بەرێزیان دووربینێکی باشی بە ناوی تۆ بە دیاریی هێناوە، وەسەلام

سەیفولقوزاتی قازی [ئیمزا]

**هێندێك ڕوونکردنەوە سەبارەت بەو نامەیە:**

ئەو نامەیەلە کۆتایی زستانی ساڵی ١٣١٠ی هەتاوی بەرانبەر ساڵی ١٩٣٢ی هەتاوی نووسراوە. نامەکە ڕووی لە محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازییە. لە نامەکەدا بە دوورو درێژی باسی ئەرك و کاری کشتوکاڵی کراوە.

١- سەیف ئەو نامەیەی لە تەورێزەوە نووسیوە، وا دیارە ماوەیەکی زۆر لە گوێگجەلی دوور بووە. مەبەست لە دوکتور قازی زادە مستەفا شەوقی بەگ، دوکتور مستەفای قازی کوڕی قازی لەتیف و ئامۆزای سەیفە کە لە ترکییە خوێندوویە و بە سەفەر هاتووەتەوە بۆ کوردستان. دوکتور مستەفای شەوقی لە چوونەوەی لە ترکییەوە بەرەو سابلاغ لە تەورێز چاوی بە سەیف کەوتووە.

٢- سەیف گشت ئەو وردەکارانەی ڕوون کردووەتەوە کە لە نەبوونی ویدا دەبوو بەڕێوە بچن. وەرزی نووسینی نامەکە زستانە و سەیف دەڵێ هەرئەوەندە دەستی کرێکار پێمەرە بگرێ جۆماڵ دەست پێبکەن.

٣- وەك لە نامەکەدا دەبیندرێ باسی بووك گوێستنەوەیەك دەکرێ و ئەوەش مەبەست لە گوێستنەوەی فەروخلەقای مەلیك قاسمی کچی ئیمام قولی میرزای قاجار بۆ محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازییە. ئەو ئاغای میرزا هاشم خانەی کە دەمڕاستی ماڵی بووك بووە، خاڵی فەروخلەقا خانم [شازدە خانم] و بۆ خۆی بە ڕەچەڵەك خەڵکی سابلاغ بووە. مەبەست لە مەجید خان، مەجید خانی قەرەوێران (میرموکری)یە کە وەکوو لایەنی ماڵی زاوا باسی لێوە کراوە. مەجید خان هاوڕێیەکی نزیکی حەمە حوسێنی سەیفی قازی بووە. قەرەوێران دێیەکە کەوتووەتە بەری عەجەمستانیمیاندواو و ئێستا لەگەڵ شاری میاندواو تێکەڵ بووەتەوە. ئەو دێیە، ئی مەجیدخان و فەتاح خان بووە، یەکێك لە کچەکانی سەیف، تووران دواتر مێردی کردووە بە براچکۆڵەی مەجید خان، فەتاح خانی میرموکری. ئەو ئەمیر ئەمجەدەی کە لە نامەکەدا نێوی هاتووە، ئەمیر ئەمجەدی مەولەوی یەك لە خاوەنمولکانی بەری عەجەمستانی جەغەتوو بووە کە دۆستایەتییەکی نزیکی لەگەڵ سەیف بووە.

٤- مەبەست لە حەزرەتی قازی کە لە چەند جێی نامەکەدا باسی کراوە قازی محەمەدە، کە وەك لە نامەکە ڕا دەردەکەوێ سەیف ڕێزی تایبەتی لێ ناوە.

قربانت جانم

قاصد رسید و نامه رسید و خبر رسید
در حیرتم که جان بکدامین کنم نثار

باعتماد اظهارات آقای میرزا حسین عزیزی زیده عزه که از کلتپه بمهاباد برگشته اینده‌وسه ماهه شب و روز در غایت اشتیاق چشم براه ومنتظر مقدم مبارك بوده تا اینکه برادری کاك مجید وارد و تعلیقهٔ مبارك را رسانید باور فرمائید من مایوس از تشریف فرمائیتان بحدی متأسف و متأثر شدم که مافوق بران متصور نیست که اینهمه انتظار واشتیاق بباد رفت باز در عین حال بمفاد (ما لایدرك کله لا یترك کله) از طرف دیگر بزیارت تعلیقه یکدنیا مسرور و خوشوقت گشته دستخط عمر عزیزم را زیارت و مژدهٔ صحت و سلامتی آنوجود عزیز [را] دریافت نمود و باز تا اندازهٔ بغیرت و همتت امیدوار گشتم که توانسته و جرئت کرده‌اید بارسال تعلیقه یادم فرموده‌اید قربانت آنهمه عهد وفا و صمیمیت و صفا کجا رفت چرا بنده را مورد شماتت اطرافیانیکه همیشه غبطه بعوالم یگانگی واتحاد ما میخورند قرار دادید چند نفر مغرور و وحشی باهم دعوا و قیل و قالی کرده‌باشند بما چه مربوط است که آنمرحمت و محبتهای حضرتت سرد بشود و رخنه به بنیان مودت واخوت ما وارد بیاورد و عجب روزگار ناپایداریست و همینقدر عرض میکنم قلب وباطن من بحال خودش باقیست فقط افسردگی وتعجیل در احوالم تفاوت کرده است. عهد من با تو نه عهدیست که تغییر پذیرد بوستانیست که هرگز نوزد باد خزانش در خواست احوال فرموده بودند قریب یکماهی بشدت هرچه تمامتر بمرض درد زانو و بواسیر و سیاه صرفه مبتلا شده بالاخره مجبور برفتن مراغه گشته دکتر ملك رستمیان دستورات و دواهائیرا داده که بزودی موثر واقع الحمدالله الساعه بکلی بهتر است و اینمدت استفاده از هوای مساعد نموده بیشتر اوقات مشغول درختکاری و قلمه کاشتن بوده بعداز اینکه یك یخچال عمده راهم ساخته و از خود بیادگار گذاشته یکماهیست شب و روز مشغول پذیرایی و مهمانی مهمانهای محترم عزیزالوجود میباشد الساعه آقای آقا میر سلیمان دام اجلاله که تشریف دارند بعرض سلام وارادت مصدعند ایام عزت و اجلال مستدام باد باز قربانت

به قوربانت

قاسید گەیشتو نامە گەیشتو هەواڵ گەیشت

تێماوم گیانم پێشکەش بە کامیان بکەم؟(١)

بە گوێرەی قسەی ڕێزدار میزرا حسێن عەزیزی- عیززەتی زیاد دەبێت، کە لە کولتەپەوە هاتۆتەوە مەهاباد، لەم دوو سێ مانگەدا شەو و ڕۆژ بەوپەڕی شەوقەوە چاوەڕوانو چاو لە ڕێی هاتنی بەخێرتان بووم، تا ئەوەی کاك مەجید هات و نامەی پیرۆزتانی ئاراستە کرد. باوەڕ بفەرموون بەهۆی ناهومێد بوون لە هاتنتانەوە بە ڕادەیەك خەفەتبارو خەمبار بووم کە زیاد لەوە لە خەیاڵدا ناگونجێت، ئەو هەموو چاوەڕوانیو شەوقە بەبادا چوو. بەڵام لە عەینی کاتدا بە گوێرەی "مالایدرك کله لایترك کله" لەلایەکی دیکەوە بە گەیشتنی نامە، دنیایەك شادمانو خۆشحاڵ بووم. دەستخەتی عومەری(٢) خۆشەویستم زیارەت کردو هەواڵی خۆشی ساغیو سەلامەتی وجوودی ئازیزتانم وەرگرتو تا ڕادەیەك بە غیرەتو هیمەت[تان] هیوام پەیداکرد کە توانیوتانەو وێراوتانە بەهۆی ناردنی نامەکەوە یادم بفەرموون. قوربان [گیان]! ئەو هەموو پەیمانو وەفاو نێوان خۆشیو سەفایە چی لێهات؟ بۆچی ئەم بەندەیەتان خستە بەر لۆمەی خەڵکانی دەوروبەر کە هەمیشە ئیرەییان بە پەیوەندی یەکیەتیو یەکگرتوویی ئێمە دەبرد. [ئەگەر] چەند خۆبەزلزان و دڕندە لەگەڵ یەکتردا شەڕو هەرایان کردووە، بە ئێمە چی، کە ئەو مەرحەمەتو خۆشەویستییانەی جەنابت [ان] سارد بێتەوەو کەلێن بکەوێتە بناغەی برادەریو برایەتی ئێمەوە؟(٣) چ ڕۆژگارێکی ناپایەدارە؟ من هەر ئەوەندەتان عەرز دەکەم [کە] دڵو باتینی من هەروەك خۆی ماوەتەوەو تەنیا دڵساردیو پەلەکردنە کە لە ئەحواڵمدا تووشی گۆڕانکاری هاتووە.

پەیمانی منو تۆ پەیمانێك نییە تووشی گۆڕان بێت.

ئەوە بێستانێکە هەرگیز بای پایزە لێی نادات.(٤)

پرسیاری ئەحواڵ [ی من]تان کردبوو. نزیکەی مانگێك زیاترە بە توندوتیژییەکی زۆر تووشی نەخۆشی ئازاری ئەژنۆو بێوەسیریو کۆخە ڕەشە هاتوومو لە ئەنجامدا مەجبوور بووم بچم بۆ "مەراغە" دوکتۆر "مەلیك ڕۆستەمیان" هەندێك دەستوورو دەرمانی پێداوم کە بەم زووانە شوێنی خۆیان دادەنێنو شوکری

خودا ئێستا حاڵم بە تەواوەتی باشترەو لەم ماوەیەدا کەڵکم لە هەوای سازگار وەرگرتووەو زۆرتری کات خەریکی دارنانەوەو قەڵەمە ناشتنمو دوای ئەوەی چاڵە سەهۆڵێکی گەورەم بنیات ناوەو وەك یادگارێك لە خۆمی بەجێ دەهێڵم. ماوەی مانگێکە بەشەو و بە ڕۆژ خەریکی پێشوازیو میوانداری میوانانی بەڕێزو خۆشەویستم. هەر ئێستاش ڕێزدار "ئاغا میر سلێمان"— گەورەیی بەردەوام بێت، تەشریفی لێرەیەو بە ڕاگەیاندنی سڵاوو ئیرادەت، ژانە سەرتان بۆ دەخولقێنێت. ڕۆژانی عیززەتو گەورەیی بەردەام بێت. دیسانەکە بە قوربانت.

**تێبینی:**

نەمزانی شاعیری شێعری فارسی ((قاصد رسیدو نامه رسیدو خبر رسید
در حیرتم که جان بکد امین کنم نثار؟)) کێیە؛

نامەکە، بەدڵنیایی بۆ عەزیز ئاغای عەبباسی، خاوەن مڵکی گوندی کولتەپەی قورمیش لە نزیك مڵکەکانی سەیف، نووسراوە. عومەر، کوڕی عەزیز ئاغایە. میرزا حسێن عەزیزی نازانم کێ بووە؟

دەبێ کێشەو هەرایەك لەنێوان ڕەعییەتی سەیفولقوزات و عەزیز ئاغای عەبباسیدا ڕووی دابێت، کە بووبێتە هۆی زوێریی عەزیز ئاغا لە سەیف.

شێعری فارسی ((عهد من با تو، نه عهدیست که تغییر پـذیرد
بوستانیست که هرگز نوزد باد خزانش)) هی سەعدییە.

(۳)

## بانگهێشتی ئاغای عەزیز خان و کاکە ڕەحیم لەلایەن سەیفەوە

بشرف عرض میرساند          باکمال اشتیاق منتظر تشریف آوردن جنابعالی و سرکار شوکتمدار آقای عزیز خان و کاکه رحیم بوده و هستم چه عجب که تا ایندرجه تاخیر شد یقین عقب سرکار خان فرستاده و تشریف هم آورده لذا علی ای حال تا غروب باید اتفاقا تشریف بیا[و]رند پلو صبیح باگوشت بره هم حاضر است  وقت تنگ و خیلی هم تاخیر پیدا شد محتاج نیست تاکیدا عرض نمایم منتظرم جناب کاك خالق هم تشریف دارند و بجنابعالی عرض سلام تقدیم مینماید ایشان هم برای سفر خیرت .... همراهی کند .... سیف

## بانگهێشی ئاغای عەزیز خان و کاکە ڕەحیم لەلایەن سەیفەوە

بە شەرەفی عەرز دەگەیێندرێ بەوپەڕی شەوقەوە چاوەڕێی تەشریف هێنانی جەنابی بەرزتان و سەرکاری خاوەن شەوکەت ئاغای عەزیز خان و کاکە ڕەحیم بووم و هەم. جێی سەرسووڕمانە کە تا ئەو ڕادەیە وەدرەنگی کەوتوون. بە دڵنیایی‌یەوە لە دووی سەرکاری خانتان ناردووە و تەشریفیشیان هێناوە، بۆیە هەرچۆنێك بێ هەتا سەرلەنگۆرێ دەبێ بەیەکەوە تەشریف بهێنن، پلاوی سەبیح بە گۆشت بەرخەوە ئامادەیە. کات تەنگە و زۆریش وەدرەنگی کەوتوون، پێویست ناکا جەخت بکەمەوە، چاوەڕێم. جەنابی کاك خالەقیش تەشریفیان هەیە و سلاوتان پێشکێش دەکا. ئەویش لە سەفەرە بەخێرەکەت.. هاوڕێیت دەکا ... سەیف

* * *

ئەمەی لێرەدا دەیبینن نامەیەکی دۆستانەیە سەیف بۆ برادەرێکی خۆی نووسیوە کە بڕیار بووە لێی میوان بێ بەڵام وەدرەنگی کەوتوون. دەرناکەوێ نامەکە کەنگێ و لە کوێوە نووسراوە، بەڵام بەوەی ڕا کە نووسیویە تا سەرلەنگۆرێ [رۆژئاوا] بگەنێ نابێ میوانەکان لە جێیەکی دوورەوە هاتبن. گەلۆ سەیف ئەو نامەیەی لە "گوێگجەلی"یەوە نووسیوە، بە داخەوە ئەوەش ڕوون نییە، باسی پلاوی سەبیح کراوە، بلێی ئەوە چ جۆرە پلاوێك بووبێ. بە نێوەکانیان ڕا وێدەچێ میوانەکان کورد بووبن: عەزیز خان، کاکە ڕەحیم، کاك خالەق.

(٤)

## نامەی سەیف بۆ میرزا خەلیلی فەتاحی قازی [میرزا خەلیلی کوڕی میرزا ڕەسووڵی باغچەی].

ئەم نامەیە لە کتێبی میرزا خەلیلی فەتتاحی قازی وەرگیراوە:

۱۹ ربیع الثانی ۱۳۴٦

جناب نورچشم مکرم آقا میرزا محمه‌دخلیل سلمك الله تعالی

مکتوب مورخه ۱ مهرماه جنابعالی از پست واصل از یادآوری و مژده‌ء سلامتی شما خوشوقت شدم موفق و برخوردار باشید گله از جواب ننوشتن کرده بودید کذب فرموده‌اید با ایندفعه هردوسه دفعه جواب عرض کرده‌ام راجع باضافه حقوق شما ابدا غفلت و قصور نکرده‌ام وهیچهم از محالات نیست بسیار امیدوارم انشاالله تعالی بطوریکه بندگان حضرت اشرف آقای وزیر معارف دامت شوکته وعده فرموده‌اند چندی طول نکشد برقرار گردد که بنده از گله و تاخت آوردن شما خلاص بشوم سفیه چه تصور میکنی من اگر کاری از دستم براید برای شما مضایقه کنم امکان عقلی نیست چون من تا درجهٔ بشما امیدوارم که در میان طائفه آدمی بشوید آنهم مشروط بآنشرط که همیشه مشغول شده بخوانید بخصوص عربی شرع بعد از آنها فرانسه والا اگر بهمینقدر که خوانده‌اید اکتفا کنید دیگر مشغول نشوید ترقی نکنید بکردی (ملای بره مشکان) خواهید شد یعنی هیچی نمیشوی اظهار کرده بودید که در طهران برای شما در یکی از مدارس جابجات کنم که مخارج شما را هم مدرسه متحمل شود چیزی محالیست چندیست شاگردان مدرسهٔ دارالفنون و بعضی از متوسطه اعتصاب کرده‌اند مدارس نمیروند که بلکه مجانی قبول شوند شهریه ازشان نگیرند هنوز قبول نشده است و خاطر جمع باشید اینگونه مساعدتها در مرکز برای احدی نیست امریکائیها ماهی سی تومان با حق خوراك و محل شبانه‌روزی از یکنفر شاگرد میگیرند مجانی قبول کردن ابدا مرسومشان نیست این است نباید بامید مساعدت و کومك های مرکز شد از محالات است پس چاره منحصر بآن است که در ولایت جدا مشغول تحصیلات شده ترقی کنید رسمیت در مدرسه را هم از دست ندهید و بطوریکه انتظار اضافه حقوق از مدرسه دارید باید مدرسه هم از ترقیات شما بهره‌مند شود انتظار بشاشت و تبریك ورود از طرف شما بحضرت آقای دکتر قاضی مد ظله معروض داشته ممنون شدند بجناب پدر بزرگوارت عرض سلام مرا برسانید زیاده بخدایت میسپارم

سیف القضات قاضی

### نامەی سەیف بۆ میرزا خەلیلی فەتاحی قازی

۱۹ ڕەبیعولسانی ۱۳٤٦

جەنابی نووری چاوی بە کەرامەت ئاغای میرزا محەمەد خەلیل سڵاوی خودات لێ بێ

نامەکەت بە تاریخی ۱ی مانگی ڕەزبەر لە پۆستخانەوە بە دەستم گەیشت، لە وەبیرهێنانەوەم و موژدەی سلامەتی ئێوە دەمخۆش بووم، هەر سەرکەوتوو و بەرخوردار بی.

گلەییەت کردبوو لە وڵام نەنووسینەوە، درۆت فەرمووە، بەم جارەوە هەر دوو سێ جار وڵامم عەرز کردووە. زۆر هیوادارم ئینشاڵا بەوجۆرە بەندەکانی حەزرەتی ئەشرەف ئاغای وەزیری معاریف شەوکەتی زیاد بێ بەڵێنیان فەرمووە ماوەیەك نەکێشی جێبەجێ ببێ، کە ئەم بەندەییە لە گلەیی و پەلاماری ئێوە ڕزگارم بێ، گەوجە ! چۆن پێت وایە من کارێکم لە دەست بێ بۆ تۆی بکەم و دەستی لێ بگێڕمەوە. ئەوە بە عەقڵدا نایە، چونکو من تا ڕادەیەك هیوام بە ئێوەیە کە لەناو تایفەدا ببیە پیاوێك و ئەمەش بەو مەرجە بەستراوەتەوە کە هەمیشە خۆت خەریك کەی و بخوێنی بە تایبەتی عەرەبی [و] شەرع، دوای ئەوان [زمانی] فرانسە. دەنا ئەگەر هەر بەوەندەی خوێندووتە پێت بەس بێ [و] ئیتر خەریك نەبی، پێش نەکەوی، بە کوردی دەبی بە "مەلای بەرمشکان"، یانی نابی بە هیچ. گوتبووت لە تاران لە یەکێك لە مەدرەسەکاندا داتمەزرێنم کە مەخاریجی ئێوەش مەدرەسەکە بە ئەستۆوەی بگرێ. ئەوە شتێکی محاڵە، ماوەیەکە شاگردانی مەدرەسەی "دارولفنوون" و هێندێك [شاگردی] دواناوەندی مانیان گرتووە ناچنە مەدرەسەکان کە بەڵکوو بێ بەرانبەر و بە خۆڕایی وەریان بگرن و مانگانەیان لێ وەرنەگرن، هێشتا ئەو داوایەیان قبووڵ نەکراوە، دڵنیا بە ئەو جۆرە یارمەتییانە لە مەرکەز (تاران) بۆ هیچ کەس نییە. ئەمریکاییەکان مانگی سی تمەن لەگەڵ حەقی خۆراك و جێی لێمانەوەی شەوانە ڕۆژی لە یەك نەفەر شاگرد وەردەگرن، ڕەسمیان نییە بە هیچ جۆر، بە خۆڕایی شاگرد قبووڵ بکەن. بۆیە هیوا بە یارمەتی و کۆمەکی مەرکەز لە محاڵاتە. کەوابوو تاقە چارە ئەوەیە لە وڵات بە جیدی خەریکی خوێندن بی، پێش بکەوی و ڕەسمی بوون لە مەدرەسەش دا لە دەست نەدەی و ئەو جۆرەی کە چاوەڕێی مووچەی زیادی لە

مەدرەسە دەکەی دەبێ مەدرەسەش لە پێشکەوتنەکانی ئێوە کەڵك بستێنێ. خۆشحاڵی دەربڕین و تەبریکی هاتنەوەیەم لە لایەن ئێوەوە بە حەزرەتی ئاغای دوکتور قازی سێبەری درێژە بکێشی، ڕاگەیاند، مەمنوون بوون عەرزی سڵاوی من بە جەنابی بابی جێگەورەت بگەیێنە.

ئیتر بە خودات دەسپێرم

[ئیمزا] سەیفولقوزاتی قازی

## هێندێك ڕوونكردنەوە لەسەر ئەم نامەیە:

١- میرزا خەلیلی فەتتاحی قازی ئەو کاتەی کە سەیف لە تاران بووە، ئەو نامەیەی بۆ نووسیوە و داوخوازی لێکردووە حەول بدا مووچەی زیاد کەن. وادیارە ئەو دەمی دەبێ بە ڕەسمی مامۆستا بووبێ لە مەدرەسەیەکی سابلاغ. میرزا خەلیل هەروەها داوای لە سەیف کردووە، بەڵکوو بە مەبەستی درێژە دان بە خوێندن، بتوانێ لە تاران شوێنێکی بۆ وەبینێ.

٢- سەیف لە تارانەوە ئەم وڵامەی بۆ نووسیوەتەوە و باسی دەرفەت یان نەبوونی دەرفەتی بۆ کردووە. ئەوەی چاوراکێش بێ، داوای لە میرزا خەلیل کردووە زمانی فرانسە بخوێنێ.

٣- مەدرەسەی "دارالفنون" لە زەمانی ئەمیرکەبیر لە سەروبەندی حوکمی بنەماڵەی قاجار دامەزراوە.

٤- کالێجی شەوانەڕۆژی ئەمریکاییەکان، دوایە بوو بە دەبیرستانی ئەلبورز.

لایەنی سەرنجڕاکێش بە دواداچوون و ئاگاداری سەیف لە مەجال و دەرفەتی خوێندنە لە تاران.

٥- مەبەست لە دوکتور قازی، دوکتور جەوادی قازی، کوڕی قازی شێخ جەلال و ئامۆزای سەیفە کە دەبێ لە سەروبەندی نووسرانی ئەو نامەیەدا دوای خوێندنی حقووق لە ئاڵمانەوە گەڕابێتەوە ئێران.

٦- کلێشەی ئەم نامەیە لە کتێبی خەلیلی فەتتاحی قازی "تاریخچەی خانوادە قاضی در ولایت موکری"، تاریخ و محل نشر: تبریز- ١٣٧٨ [ی هەتاوی] لاپەڕەی ٢٢٣دا بڵاو کراوەتەوە.

## (٥)

## نامەی سەیف بۆ وەزارەتی جەنگ

پیشگاه منیع وزارت عظمی جنگ دامت عظمه

پیشگاه منیع وزارت عظمی جنگ دامت عظمه

همیشه از درگاه قادر متعال عظمت و اقتدار بندگان حضرت اشرف دامت عظمه تمنا نموده و مینماید عرض دیگر در خصوص معرفی و توصیه سروان جاوید چندی قبل عریضه به پیشگاه مقدس عرض کرد متاسفانه بجوابش سرفراز نشده بعدا که مشار الیه بمرخصی بیست روزه برای انجام سیله ٔ رحم بملاقات همشیره‌اش بنده منزل آمده بود در غیابش متصدیان امور بواسطه اینکه بیچاره بیکس و بی پارتی و غریب میباشد بلشکر شش انتقال داده‌اند دعاگو در آنموقع که خبر داشته از آنجائیکه همیشه مراحم و مکارم بندگان حضرت اشرف را شامل حال خود میداند تلگراف به پیشگاه مقدس معروض داشته متاسفانه آنوقتها در قشقایی تشریف

داشتید و عین تلگراف بسرهنگ انصاری هم رسیده است استرحام مینماید امر فرمایند در پست خودش باقی بماند که چون این افسر ماموریتش در کردستان و مخصوصا در بخش مریوان بوده است مبتدا این دعاگو از هردو لشکر ٤ و ٥ باین مضمون تقاضا نمودم افسر نامبرده برضائیه منتقل شد در آنجا در قضیه شهریور داروندارش رفته از هستی بکلی ساقط شد و از مهاجرت به ترکیه که مراجعت بمرکز نمود در آنموقع دعاگو تهران بودم از ستاد ارتش استدعا نمودم در وزارت جنگ در بازرسی پیاده نظام پستشرا معین کردند این است جسارتا باز در پیشگاه مقدس کتبا بمقام استدعا و تمنا بر می‌آید که امر و دستور فرموده افسر نامبرده را باز بمرکز احضار در پست خودش مستقر و معین شود که موجب امیدواری و شکرگذاری کلی این دعاگوی قدیمی خواهد شد امر امر مبارك است

### وەرگێڕانی کوردیی:

٢٣/٩/٦ دەرگانەی بەرزی وەزارەتی مەزنی جەنگ گەورەیی بەردەوام بێ

[لە ڕەشنووسی نامەکەدا ئەم ڕستەیەی سەرەوە دووجار نووسراوە]

بەردەوام لە دەرگای قادری پایەبەرز، گەورەیی و بەهێزیی بەندەگانی حەزرەتی ئەشرەف- گەورەیی بەردەوام بێ، خواستوومە و دەخوازم. عەرزێکی دیکە سەبارەت بە ناساندن و پێسپاردنی سەروان جاویدە. ماوەیەك لەمەوپێش عەریزەیەکم ناردە خزمەتی پیرۆزتان بەداخەوە بە وەرگرتنی وڵامەکەی سەرفراز نەبووم. پاشان کە ناوبراو بۆ پشوویەکی ٢٠ ڕۆژە و بۆ بەجێهێنانی سیلەی ڕەحم بۆ چاوپێکەوتنی خوشکی هاتبووە ماڵی من، کاربەدەستان لە ئامادەنەبوونی ئەودا، لەبەر ئەوەی کە هەژار، بێکەس و بێپشتیوان و غەریبە بۆ لەشکری شەشیان ڕاگواستووە، دۆعاگۆتان هەر ئەو دەمەی کە ئەو خەبەرەم پێگەیشت، لەبەر ئەوەی کە هەمیشە مەرحەمەت و گەورەیی بەندەگانی حەزرەتی ئەشرەف دەمگرێتەوە، تێلگرافێکم ناردە دەرگانەی پیرۆزتان. بەداخەوە ئەودەمی تەشریفتان لە [ناوچەی] قەشقایی بوو، هەمان تێلگراف بەدەستی سەرهەنگ ئەنساریش گەیشتووە.

تکایە، ئەمر بفەرموون لە پۆستی خۆیدا بمێنێتەوە، چونکوو ئەم ئەفسەرە مەئموورییەتی لە کوردستان و بە تایبەتی لە بەشی مەریوان بووە. لە سەرەتاوە لە

هەردوو لەشکری ٤ و ٥ داوام کرد ئەو ئەفسەرە ناردرا بۆ ڕەزائییە و لەوێ لە ڕووداوەکانی شەهریوەر [خەرمانانی ١٣٢٠ی هەتاوی = ئووتی ١٩٤١]دا دارونەداری چووە و هیچی بۆ نەماو کاتێك لە کۆچبەری تورکییەوە گەڕایەوە مەرکەز [= تاران]، ئەوکاتە، ئەم دۆعاگۆیە لە تاران بووم تکام لە ستادی ئەرتەش کرد لە وەزارەتی جەنگ لە بەشی پشکنینی پیادە نیزامدا جێیان بۆ دیاریی کرد. ئێستاش دەوێرم دیسان لای دەرگانەی پیرۆزتان بە نووسراو تکا بکەم ئەمر و فەرمان دەربکەن ئەفسەری ناوبراو بانگ بکرێتەوە مەرکەز بۆ سەر شوێنی خۆی و لەوێ دامەزرێندرێتەوە، کە ئەوەش دەبێتە هۆی هیواداری و شوکرانەبژێریی گشتی ئەم دۆعاگۆیە قەدیمییە. فەرمان فەرمانی موبارەکە.

* * *

ئەو نامەیەی سەرەوە، ڕەشنووسی نامەیەکە کە سەیف بۆ وەزیری جەنگی نووسیوە. نامەکە ئیمزای پێوە نییە و لە ساڵی ١٣٢٣ی هەتاویدا نووسراوە، بەڵام لە دەستخەتەڕا دەرناکەوێ مانگی "١"ـە یان "٩".

لە نامەکەدا سەیف داوا دەکا سەروان جاویدی ژن برای ڕابگوێزرێتە تاران و نەنێردرێ بۆ لەشکری ٦. وادیارە پێشتریش سەیف دوای شەهریوەری ساڵی ١٣٢٠ [ئووتی ١٩٤١] واتە داگیرکرانی ئێران لەلایەن هێزی بەریتانیا. شوورەوی و ئەمریکا کە بووە هۆی لەسەر تەخت لاچوونی ڕەزاشای پەهلەوی حەوڵی بۆ جاوید داوەو بە قسەیان کردووە.

سەروان جاوید (سەرهەنگ جاویدی دواتر) لە ئەرتەشی ئێراندا پلەی بەرز بووە وە و تەنانەت بوو بە ئاجودانی شاش، ماوەیەکی درێژ ڕەئیسی ڕوکنی دووی سوپای ئێران بوو لە ورمێ و زۆر کەسی بێتاوانی کوردی لە ئازار و ئەشکەنجەی کاربەدەستانی ڕژێمی ئێران ڕزگار کرد. لە کەشف بوونی ڕێکخراوەی نێزامی حیزبی توودەی ئێران ناوی ویش وەکوو ئەندامی ئەم ڕێکخراوە نهێنییە دەرکەوت. لە سەرەتاوە حوکمی ئێعدامی بۆ بڕایەوە، بەڵام دواتر ئەو حوکمە شکاو نزیکەی ٨ ساڵ لە زیندان مایەوە. سەرهەنگ جاوید ئێستا تەمەنی زیاتر لە ٩٠ ساڵە و بە تاقی تەنیا لە تاران دەژی.

ئەم دوو بەڵگەی سەرەوە ڕەشنووسی دوو نامەی کورتن لەلایەن سەیفەوە بۆ ئوستانداری ئوستانی ٣ و ٤ی ئازەربایجان:

مقام منیع تیمسار استاندار معظم ٤ و ٣ دامت شوکه

ازاینکه طائفه دعاگویان قضات را مثل سائر طوائف مکری در ارفاق دولت در اعطای قند و شکر ذی سهم قرار دادەاند اسباب امتنان و امیدواری بوجود مقدس گردیده من صمیم القلب مراتب تشکرات و سپاسگذاری به پیشگاه مقدس تقدیم دوام و بقای ذات مقدس تیمسار سرلشکر معظم محبوب را دامت شوکه از درگای قادر احدیت تمنا و ... مینماید امریه مبارکه راجع به دادن قند و شکر بطائفه قضات صادره بعهده فرماندار مهاباد برئیس اقتصاد و دارایی ارائه داده اظهار داشتند که در مهاباد قند و شکر موجود نیست و بتنها امریهٔ استاندار معظم برای دادن قند و شکر کفایت نمیکند حکم ریاست اقتصاد خواروبار ولایتی و حواله از طرف آن اداره هم لازم است این نتیجه را به پیشگاه مقدس معروض و ضمنا استدعا مینماید هرگاه رای مبارك ... ... کرد امریه دادن قند و شکر بمحلی صادر و دستور دادند بانضمام حکم اداره دارایی و اقتصاد بدهند که قند و شکر داشته باشد دستور فرمایند که از طرف اداره دارایی و خواروبار هم حواله و حکم دادن قند و شکر صادر شود که محتاج بتصدیع و عرض ... نباشد امر امر مبارك است

کوردی:

مەقامی بەرزی تیمسار ئوستانداری بەرزی [ئوستانی] ٤ و ٣ گەورەیی بەردەوام بێ

ئەوەی کە تایفەی دۆعاگۆی قازییانتان وەك تایفەکانی دیکەی موکری بەشداری مەرحەمەتی دەوڵەت کردووە بە دانی قەند و شەکر، جێی منەتباری و هیوایە بە وجوودی پیرۆزتان. لە قووڵایی دڵەوە سوپاسی خۆم پێشکەشی دەرگانەی پیرۆزتان دەکەم، دەوام و مانەوەی زاتی پیرۆزی تیمساری سەرلەشکری مەزنی، خۆشەویست، گەورەیی بەردەوام بێ لە دەرگای قادری یەکتا خوازیار و داواکارم. فەرمانی پیرۆزی ئێوە سەبارەت بە پێدانی قەند و شەکر بە تایفەی قازییەکان کە دەرتان کردووە لە ئەستۆی فەرمانداری مهابادە، بە سەرۆکی ئابووری و دارایی نیشان درا، ڕایانگەیاند لە مهاباد قەند و شەکر نییە و فەرمانی ئوستانداری بەرز بۆ دانی قەند

و شەکر بە تەنیا کیفایەت ناکا، حوکمی سەرۆکایەتیی [ئیدارەی] ئابووری خواروباری ویلایەتی و حەواڵە لەلایەن ئەو ئیدارەشەوە پێویستە. هەر بۆیەش ئاکامی ئەوە بە دەرگانەی پیرۆز ڕادەگەیێنم و هەروەها تکاتان لێ دەکەم هەر کاتێك بڕیارێکی پیرۆزتان دا [و] فەرمانی دانی قەندو شەکرتان بە شوێنێك دا، فەرمان بدەن حوکمی ئیدارەی دارایی و ئابووریشی لەگەڵ بێ کە قەند و شەکریشی هەبێ. ئەمر بفەرموون کە لەلایەن ئیدارەی دارایی و خواروباریشەوە حەواڵە و حوکمی قەندو شەکری دەربکرێ کە حەوجێ نەبێ بۆ سەرئێشاندنی ئێوە. فەرمان، فەرمانی پیرۆزی ئێوەیە.

* * *

مقام منیع تیمسار سرلشکر استاندار [استان] ۳ و ٤

کاك سوار منگور بغصب و غارت املاك ملکزاده' مکری قانع نشده و بگرفتن قند و شکر دولتی جسورتر دیروز صد سوار فرستاده اهل عیال و میرزا رسول فتاحی قاضی عموزاده را قهرا از قریه قزلجه به ثبت داده شده بیرون نموده متمنی است توجه مخصوص واقدامات سریعتری در رفع تعرض کاکه سوار فرمایند والا سبب جسارت سایرین خواهد شد و اشقیا رشته انتظامات را میپاشند

کوردی:

مەقامی بەرزی تیمسار سەرلەشکری ئوستانداری [ئوستانی] ۲ و ٤ [ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات و ئازەربایجانی ڕۆژئاوا]

کاکەسواری مەنگور بە داگیرکردن و تاڵانی ماڵەکانی مەلیکزادەی موکری قانع نەبووە و بە وەرگرتنی قەند و شەکری دەوڵەتی جەسورتر بووە، دوێنێ سەد سواری ناردووە کەس‌وکار و میرزا ڕەسووڵی فەتاحی قازی ئامۆزامی بە زۆر لە گوندی قزڵجە کە بە ڕەسمی تاپۆ کراوە، دەرکردووە. تکا دەکەم سەرنجی تایبەتی بدەنێ و هەنگاوی خێراتر هەڵبهێننەوە بو لابردنی دەستدرێژیی کاکە سوار، دەنا دەبێتە هۆی جەسارەتی کەسانی دیکە و ئەشقیا شیرازەی نەزم و هێمنی دەپسێنن.

ئەو دوو نامە کورتە ڕەشنووسە لەسەر یەك لاپەڕە نووسراون و ئیمزایان پێوە نییە. ئێمە نازانین ناردراون یان نا ؟

نامەکە ڕووی لە ئوستانداری ئوستانی (٣ و ٤)ە [واتە ئازەربایجانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا]. لە زەمانی حوکمی بنەماڵەی پەهلەوی دا زۆر جار ئەفسەر و کەسانی عەسکەری لە کار و باری مەدەنی دا بەرپرسیارەتییان دراوەتێ، تەنانەت پلەی سەرۆك وەزیرایەتیش.

دیارە لە کاتی نووسینی ئەو نامانەدا کە تاریخیان پێوە نییە، ئوستاندار [والی] ئەفسەر بووە. تیمسار نازناوێکی عەسکەرییە و بۆ کەسانی کە پلەی (سەرتیپ، سەرلەشکر، سپەهبود و ئەرتەشبود)یان هەبووە دەکارهێندراوە.

نەبوون یان کەمبوونی قەند و شەکر لە ئێران و بە تایبەتی لە کوردستان گرفتێکی گەورەی کۆمەلایەتی بووە و ڕژێم وەك کەرەستەیەك بۆ دەستەمۆ کردنی سەرۆك عەشیرەتە کوردەکان کەڵکی لێ بینیوە، واتە بەشی قەند و شەکری خەڵکەکەی دەدایە دەست ئاغاوەت.

نامەی یەکەم بە شێوازی گلەیی و شکایەتی ئەو دەم نووسراوە. سەیف سوپاسی ئوستاندار دەکا کە فەرمانی دەرکردووە تایفەی قازییانیش وەك "تایفەکانی دیکەی موکری" بەشە قەندیان بدرێتێ، بەلام گلەییشی کردووە کە سەرەڕای فەرمانی ئوستاندار، مەئموورانی ناوچەیی ئەوەیان پێك نەهێناوە. سەیف بە تەوسەوە دەڵێ ئەگەر ئەمجارە فەرمانی ئاوات دەرکرد، لە پێشدا بزانە بابەتەکە هەیە یان نا !

بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی لە نامەی کورتی دوویەمیشدا ئاماژە بە قەند و شەکری دەوڵەتی کراوە، دەکرێ وادابندرێ نامەکان لە هەمان سەروبەنددا نووسرابن.

مەبەست لە میرزا ڕەسووڵی فەتتاحی قازی، میرزا ڕەسووڵی باغچە، بابی میرزا خەلیلی فەتتاحی قازییە، کە لەم کتێبەدا نامەیەکی سەیف بۆی نووسیوە چاپ کراوە. میرزا خەلیل لە کتێبەکەیدا: "سالهای اضطراب (خاطرات خلیل فتاح قاضی)" بە وردە پیشاڵ باسی ئەو تالان و بڕۆیەی کاکە سواری مەنگوڕی کردووە. قزلجە دێیەکە لە دێیەکانی دەوروبەری سابلاغ.

## خوتبەی ڕۆژی هەینی (عەرەبی فارسی)

ئەم بەڵگەنامەیە بە عەرەبی و فارسی نووسراوە. شێوازی داڕشتن و ڕاگەیاندنەکەی بۆ ئەوە دەبێ کە بە "خوتبە"یەکی ڕۆژی هەینی بزانین لە مزگەوتێکدا کە قوتابی قوتابخانەکانیشی تێدان. ئەگەری دووهەم ئەوەیە بابەتەکە بۆ ڕووداوێکی پەروەردە و خوێندن نووسرابێ، بۆ نموونە، سەرەتای ساڵی خوێندن لە شارێکی وەك سابلاغ. ئەوەی کە بەشێك لە نووسراوەکە عەرەبی و بە سەجع نووسراوە، بابەتەکە دەباتە پاڵ "خوتبە"ی ڕۆژانی هەینی کە تێیدا ئیمامانی جومعە هەوڵیان دەدا نووسراوەیەکی ڕێكوپێك و بە کێش و قافیە بخوێننەوە.

ڕاکێشکردنی قوتابی بۆ مزگەوت لە ڕۆژی هەینیشدا، کارێکی ئاسایی بوو لە ناوچەکە و مامۆستا و دایك و باوکی منداڵ ئەم کارەیان پێخۆش بووە. بۆ نموونە، ئەمن لە بیرمە، کاتێ قوتابی پۆلی ١ و ٢ و ٣ی ناوەندی بووم لە بۆکان و لە قوتابخانەکەی قەڵای سەردار دەمانخوێند، هەموو ڕۆژێکی هەینی دەبوایە بچین بۆ نوێژی جومعە، دەنا ڕووبەڕووی زەبروزەنگی ڕەحمەتی مامۆستا شێخ حەسەنی کازمی دەبووین.

بەڵام سەرەڕای ئەوانەش، بۆچوونی من زیاتر ئەوەیە کە سەیف ئەم نووسراوەیەی لە ڕێوڕەسمێکی حکوومی و فەرمی وەك کرانەوەی قوتابخانەدا خوێندبێتەوە کە مەئموورانی ناوچەیی دەوڵەتیش لەوێ ئامادە بووبێتن.

لە نووسراوەکەدا، سەیف داوا لە قوتابییەکان دەکا بخوێنن و شت فێر ببن، بەڵام ئەو بابەتە لە چوارچێوەیەکی ئایینیدا و وەك "مەلا"یەك ڕادەگەیێنێ، سەیف ئاماژە بە "دوو ساڵی ڕابوردوو" دەکا کە ڕوون نییە چی بووبێ، بەڵام من دووری نازانم نیازی لە شەڕی یەکەمی جیهانی، یان هاتنە سەر حوکمی ڕەزا شای پەهلەوی بووبێ. سەیف بانگەشەی وەفاداری بە گوێی قوتابییاندا دەداو لێیان دەخوازێ "نەجاتدەر"ی ئێرانیان خۆش بوێ، کە دەکرێ مەبەست لە ڕەزا شا بێ، ئەگەرچی بە ئاشکرا نێوی نەهاتووە و ڕێزی فەرماندەی لەشکری ڕۆژئاوای ئێران کە واهەیە ئەمیر عەبدوڵاخانی تەهماسبی بووبێ، بگرن.

اعوذبالله من الشيطان الرحيم، بسم الله الرحيم، الحمد لله الذى أمرنا بالتعلّم والتعليم و لنا المدارس والمكاتب الجديدة والقديمة، وأفتحنا لإتباع شريعته بالتراضي والتحكيم وعين الارزاق بالجمع والتفريق والضرب والتقسيم وعلمنا الاشياء والحقايق والساعات والمساحة؟ بدوران الافلاك والكواكب والمقادير والترقيم ويوصلنا بتحصيل العلم الى الترقى والتعالى والتعظيم وهدانا الى طريق النجات والصراط المستقيم وهو الذى يحى العظام وهى رميم ويشفى الاجسام والقلوب و... به يعرف الخالق ويؤمن به كل فهيم وزعيم وقوام العالم لعلمه العليم ... الله وهو السميع العليم والصلوات والسلام على محمد الذى خلقه الله بحسن الخلق والتكريم وقال فى علو شاءنه بأنك لعلى خلق عظيم وجعله شفيعاً يوم لاينفع مال ولابنون الا من آتى الله. بقلب سليم وفيها يفرق كل أمر عليم و على آله الطيبين الطاهرين اصحابه هم ابواب الصدق والعدل والحياء والعلم وصلوات الله وسلامه عليهم ومكانهم في جنات ذات عيون ومقام كريم

**كوردي:**

شوكر و سوپاس بۆ خودایەكە كە بە نووری زانست و تێگەیشتن مرۆڤی بەسەر ئاژەڵی دیكەدا گەورەیی بەخشی و یەكیەتی و هاودڵی و... و خۆشەویستی و یارمەتی و یاریدەدانی یەكتر ڕێكی خستن و موسڵمانانی بەرەو وشەی شەهادە و نوێژ و ڕۆژو و زەكات و حەج بانگ كردو دەورو دەرسی قوتابیانی خاوەن غیرەت و تێگەیشووی لە هەوڵ و تێكۆشان و ئەی كوڕپەكان ! نیشتمانی خۆشەویست دوور لە چاوەڕوانییە، پێشكەوت و سەركەوتی خۆی لە ئێوەوە دەزانێ. ئێوەش پێویستە پشتیندی هیممەت ببەستن و نیشتمان — كە وەك دایكی ئێوەیە، لە خۆتان دڵرەنج نەكەن و هۆی ڕەزامەندیی ئەو كە بریتییە لە وەدەستهێنانی زانست و تێگەیشین پێك بهێنن، مان و نەمانی وڵات بەدەست ئێوەیە، كە وابوو لەسەرتانە بكەونە شوێن وەدەست خستنی زانست و مەعریفەت و بەرگی زوهد و وەرع دەبەر بكەن و هەنگوینی ڕاستی و خۆشەویستی بنۆشن و بۆ پاراستنی نیشمانی خۆشەویست وەك شێری بە نەعرەتە ڕاپەڕن، لەبەر ئەوەی هەر وڵاتێك كە "مەعاریف"ی نییە، قالبێكی بێ ڕۆحە و هەر میللەتێك كەسانی زانای نەبێ نابوود و بێفتووحە.

ڕۆڵەکان! دوو ساڵی ڕابوردوو وەبیرخۆتان بهێننەوە. دەزانن کە خوێندن لە سێبەری ئاسایشت و هێمنایەتییەوەیە و ئاسایشتیش لەژێر سێبەری سەرنێزە و فیشەکدایە. بوونی فیشەکیش بەستراوەتەوە بە ڕێبەرێکی کارامەی کەم نەزیرەوە کە نیزامی ئێرانی کردە یەك بیچم و لە ماوەیەکی کەمدا سەرانسەری ئێرانی ڕێكوپێك کردو خاکی خاوێنی لە ناپاکیی و شیرکی بێگانە و سەربزێو و خراپەکار پاك کردەوە و هێمنایەتی و دادپەروەری کردە حاکم. کەوابوو لەسەر هەموو ئێمەیەکی ئێرانی، بە تایبەت ئێوەی مەعسووم واجبە کە ئەو نەجاتدەرەی وا بووەتە هۆی ڕزگاری و ژیانی میللەت، وەك گیانی خۆشەویستی خۆتان خۆشتان بوێ و خۆشەویستی ئەو لە دڵتاندا جێ بکەنەوە و فەرماندەر و خاوەن پلەی بە غیرەت و ئەفرادی ئازا و بەڕێز بە پشت و پەنای خۆتان بزانن، بە تایبەت لەشکری باکووری ڕۆژئاوا [کوردستان و کرماشان و ئازەربایجان] و ئەمیرێکی بێ وێنە، کە پارێزەی تایبەتی ئێمەن دەبێ زیاتر لە جاران ڕێزیان بگرین و خۆشمان بوێن و دوّعا کردن بۆ مانەوەیان بە کارێکی پێویست بزانن.

خیال دارم از همین شب چراغ نگذارم بلکه شبها بتاریکی گزارم اگر کافر نشوم منکر نور هم هستم داد از دست ظلم و تعدیات استاد چراغ نمیدانم این پدرسوخته چراغ دودی نفت است که چنین ر [و] سیاه بدبخت است یا از ملت اسلاو و روس است که تا ایندرجه ظالم و چاپلوس است یا از ایل گلباغی است که از دولت یاغی و خراب کنندهء کردستان و گروس است آنچه با ما کرد استاد چراغ هرگز باد

صرصر نکرده با چراغ یا با پوست دباغ و باد خزان با درختان در باغ خیلی بدحریف است که در این خریف ما را بی برگ و نوا ساخت بیشلوار و قبا و بیپالتو و عبا حق داشت صمصام صاینقلعه بگوید ولایت بلبشوست والا این سلحشور چونین اقدام و جرئتی نمیکرد اوقاتی که این لباسهای نامبارک باین غدار بی تدارک بدوختن داد اینطور سخت تاخت هنوز بوستان چهارقلعه چهار بلگه بود که حالا بجای بوستان گندم سبز شده ینجه گشته آن ظالم کوتاه دست هنوز لباسها را پنجه نزده انگور باش برات تازه غوره شده بود که حالا برگش خزان کرده زردالوی چوپلوتر که حالا خشکش هم تمام شده باز لباسها ناتمام میباشند والله ظلم و اجحافی که از روس دیده بدرجهء ظلم و بی اعتدالی این خیاط مکار دروغگوی غدار موءثر نشد که در 'ین غربت این جور و کربت در حق ما کرد این درزی سکزی عرقوب ثانیست که مواعیدش نامتناهیست قسم بخورم نصف لباس نوکرها در آمدو شد تیکان تپه مخارج کردند و مالها نعل انداختند مگر تارویود وجودش از دروغ است بااینکه اسمش چراغ است بینور و بیفروغ است یا برعکس نهند نام زنگی کافور

وەرگێڕانی کوردیی:

به تەمام لەمشەوەوە چرا هەڵنەکەم بەڵکوو شەوان به تاریکی تێپەڕ کەم. ئەگەر پێی کافر نەبم ئینکاری نووریش دەکەم. هاوار لە دەستی زوڵم و دەستدرێژییەکانی "وەستا چراغ". نازانم ئەو باب سووتاوە چرا نەوتە کە وا ڕووسیا و بەدبەختە؟ یان لە میللەتی سلاو و ڕووسە کە ئەو دەرەجەیە زاڵم و چاپلووسە؟ یان لە عێلی گەڵباغییە کە لە دەوڵەت یاغییە ؟ و وێرانکەری کوردستان و گەڕووسە ؟ ئەوەی "وەستا چراغ" لەگەڵ ئێمەی کرد قەت بای سەرسەر نەیکردووە به چرا یان دەبباغ بە پێست و یان بای پاییزە بە دارودرەختی ناوباغ ! زۆر بەدحەریفە کە لەم پاییزەدا ئێمەی بێبەرگ و نەوا هێشتەوە، بێ شەڵوار و قەبا، بێ پاڵتاو و عەبا. سامسامی ساییـنقەڵا حەقی بوو بڵێ وڵات شێواوە، دەنا ئەم شەڕانییە نەیدەوێرا لەگەڵمان ئاوا بکا! ئەو دەمەی ئەو جلوبەرگەناموبارکانەمان لەلای ئەو زاڵمە نائامادەیە بە دروون دا، ئاوا دەخۆی نووسا هێشتا بێستانی (چوار قەڵا) چوار گەڵا بوو کە ئێستا لەجیاتی بێستان، گەنمی شین بووە بە وێنجە، ئەو زاڵمە دەست کورتە هێشتا پەنجەی نەداوە لە جلوبەرگ. ترێی "باش بەرات" تازە ببووە قۆرە کە ئێستا

گەڵاكانیشی هەڵوەریون، قەیسیی تەڕی "چوبلوو" ئێستا ویشكەكەشی تەواو بووە، بەڵام هێشتا جلوبەرگەكان ناتەواون، قەسەم بە خودا ئەو زوڵم و زۆرەی كە لەدەست ڕووس بیندراوە بە ڕادەی زوڵم و بێئینسافی ئەو بەرگدرووە فێڵبازە، درۆزنە، غەدارە شوێنی دانەنا! كە لەم غەریبایەتییەدا ئەو زوڵم و بێدادییەی لە حەقی ئێمەدا كرد بە ناڕەوا ! ئەو بەرگدرووییە سەكزییە "عەرقووب"ی دوویەمە، كە بەڵێنەكانی بێپایانن. سوێند بخۆم نیوەی [نرخی] جلوبەرگی نۆكەرەكان لە ڕێی هاتوچۆی تیكانتەپە سەرف كراو چارویَ ناڵیان برا. چما تان‌وپۆی وجوودی لە درۆیە ؟ ئەگەرچی ناوی چراغە [چرا]، بێڕووناكی و بێنوورە یان نێوی زەنگی بە پێچەوانە دەنێن لە كافوور؟

ئەم نووسراوەیە، وێدەچێ بەشێك بێ لە نامەیەكی سەیف بۆ كەسێك یا پارچە نووسراوەیەكی ئەدەبی بێ كە سەیف بۆ دڵی خۆی نووسیبێ و تێیدا توانای خۆی لە نووسینی پەخشانی "موسەججەع" بە تاقی كردبێتەوە. بابەتەكە، سەبارەت بە وەستایەكی بەرگدرووە بە نێوی "وەستا چراغ" كە دانیشتووی تیكانتەپەی هەوشار و زۆر وێدەچێ تركی ئازەربایجانی بووبێ. بە گوێرەی نووسراوەكە، سەیف جلوبەرگی خۆی و نۆكەرەكانی لەلای بە دروون داوە، بەڵام وەستا چراغ بە كاتی خۆی جلوبەرگەكانی تەواو نەكردووە و ئەمڕۆ و سبەی لەگەڵ كردووە.

نووسراوەكە بە زمانێكی تەنز نووسراوە. بێژەی سەكزی دەبێ لە شانامە وەرگیرابێ، كە ڕۆستەم بە سەكزی دەزانێ. سامسامی ساینقەڵا (سامسامە شێتە)ش ئاغا و خاوەن موڵكێكی چارداوڕووی ناوچەی هەوشار لە سەردەمی ژیانی سەیفدا بووە. لەناو دەستنووسە فارسییەكانی شێعری سەیفدا پارچە شێعرێكی كورت هەیە كە هەر بۆ "وەستا چراغ"ی گوتووە و هاواری لە بێ بەڵێن بوونی وی كردووە،

## نامە بۆ سەیف یا سەبارەت بە سەیف

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەم نموونەی هەندێ نامەی خەڵکانی دیکە بۆ سەیف بهێنمەوە. ئەم کارە بە سێ ئامانج دەکەم:

یەکەم: بۆ ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکانی دەورووبەری ژیانی ڕۆژانەی سەیف و یارمەتیدانی هەڵسەنگاندنەکانی دواڕۆژ لەسەر ژیانی ئەو کەڵە پیاوەی کوردستان؛

دووهەم: ڕوونکردنەوەی ڕوانینی خەڵکانی سەردەمی خۆی بە نیسبەت کەسایەتی سەیفەوە؛

سێهەم و وا هەیە لە هەمووان گرنگتر: دەرخستنی ڕووداوە سیاسی-کۆمەڵایەتی- فەرهەنگییەکانی ئەو سەردەمەی موکریان و کوردستان بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەیەك بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەو بڕگەیەی وڵاتەکەمان.

نامەکان بریتین لە

١. نامەی سەرەك وەزیری ئێران بۆ وەزیری دارایی

٢. نامەی جەواد ناصحی بە وەرگێڕانی کوردییەوە

٣. سێ پەیامی نەورۆزی

(١)

**نامەی محەمەد ساعیدی مەراغەیی، سەرەك وەزیری ئێران بۆ وەزیری دارایی*:**

نامه نخست وزیر به وزیر دارایی

«رونوشت نامه مجدد آقای سیف القضات به ضمیمه فرستاده می شود. به شهادت پرونده علاوه بر مراتب دولتخواهی و خدمات بسیاری که نامبرده همواره در پیشرفت مقاصد دولت ابراز داشته و با وصف اینکه سال گذشته مقدار پنجاه خروار گندم مازاد خود را بلادرنگ به دارائی مراغه تسلیم کرده سزاوار نیست که بهای گندم ایشان کمتر از نرخ معمول در محل پرداخته شود و یا در سهمیه قند و شکر و قماش که به سایر ملاکین اینجا داده شد، بی نصیب گردد. دستور فرمایند تقاضای نامبرده را مورد توجه مخصوص قرار داده و نسبت به انجام آن اقدام لازم به عمل آورند و نتیجه را اطلاع دهند»

تلگراف شماره مورخ ٢٣/٢/٣١ با ثبت ٤٣١٥ مورخ ٢٣/٣/٤

**وەرگێڕانی کوردیی:**

«کۆپیی نامەی دووبارەی جەنابی سەیفولقوزاتی قازیتان هاوپێچ لەگەڵ ئەم نامەیە بۆ دەنێرم. بە گوێرەی فایل، جیا لە دەوڵەتخوایی و ئەو خزمەتە زۆرەی کە ناوبراو بۆ بەرەوپێش چوونی ئامانجەکانی دەوڵەت، نیشانی داوەو هەروەها بە حیسابی ئەوەی کە ساڵی ڕابردوو بڕی پەنجا خەروار گەنمی زیادیی خۆی دەست بەجێ داوەتە دارایی مەراغە، کارێکی شایان نییە ئەگەر نرخی گەنمەکەی کەمتر لە نرخی ئاسایی ناوچەکە پێ بدرێت، یا لە بەشی قەندو شەکرو قوماشێك کە دەدرێتە ئاغاوەتی دیکەی ئێرە، بێ بەش بمێنێتەوە. دەستوور بفەرموون داواکاریی ناوبراو بە چاوێکی تایبەت سەیر بکرێت و بۆ بەڕێوەبردنیشی هەنگاوی پێویست هەڵێننەوەو ئاکامەکەیشم پێ ڕابگەیێنین.»

تێلگرافی ژمارە ؟ ڕێکەوتی ١٣٢٣/٢/٣١ [= ١٩٤٤/٥/٢١]

ژمارەی تۆمار کردن: ٤٣١٥، ڕێکەوتی ١٣٢٣/٣/٤ [=١٩٤٤/٥/٢٥] *

* محەمەد ساعید مەراغەیی لەنێوان ١٣٢٣/١/٨ [=١٩٤٤/٣/٢٨] تا ١٣٢٣/٨/٢٠ [=١٩٤٥/١١/١١] سەرەك وەزیرانی ئێران بووە.

سەرچاوە: مسعود بهنود، "از سید ضیاء تا بختیار"، چاپ سوم، انتشارات جاویدان، تهران، ١٣٦٩ [١٩٩٠]، صفحه ٢٢٣.

ئەم نامەیە لە گۆڤاری "چشم انداز ایران"، ویژەنامە کردستان (٢) پاییز ١٣٨٤" وەر گیراوە.

**(٢)**

**نامەی جەواد ناصح**

رفیق شفیقم و عزیزتر از جانم از من رنجیده دل مباش که
تصادفات وخیم روزگار مرا از خدمت کردن بتو امتناع
میکند والا اگر عنان اختیار در دست خود من بود این روح
ضعیف و جان نحیف خود را نثار قدوم نمکین آن دوست محترم
خودم سیف قاضی عزیزم میکردم ولی افسوس! خاکپای ناصح جواد

رفیق شفیقم و عزیزتر از جانم،

روح من رنجیده دل مباش که تصادفات وخیم روزگار مرا از خدمت کردن بتو امتناع میکند و الا اگر عنان اختیار در دست خود من بود این روح ضعیف و جان نحیف خود را نثار قدوم غمگین آندوست محترم خودم سیف قاضی عزیزم میکردم ولی افسوس

خاکپایت ناصحی جواد

وەرگێڕانی کوردیی:

هاوڕێی خۆشەویست و لە گیان ئازیزترم !

دڵت لە من نەڕەنجێ کە هەڵکەوتەکانی سەختی ڕۆژگار بەرگری دەکەن لەوەی خزمەتت بکەم، دەنا ئەگەر هەوساری ئیختیار بەدەست خۆمەوە بوایە، ئەم روحە لاوازە و ئەو گیانە لەڕەی خۆم دەکردە قوربانی هەنگاوەتەماوییەکانی ئەو دۆستە بەڕێزەم، سەیفی قازی خۆشەویستم بەڵام هەیهات !

خاکی بەری پێت ناسیحی، جواد

(٣)

سێ پەیامی پیرۆزبایی جێژنی نەورۆز بۆ سەیف:

سال جدید و عید نوروز را که یکی از اعیاد ملی نیاکان ماست بآنوجود گرامی و فامیل محترم ازصمیم قلب عرض تبریك نموده و سعادت دوست عزیزم را در سال نو خواهانم

امضاء سروان کوچکیان

وەرگێڕانی کوردیی:

ساڵی نوێ و جێژنی نەورۆز کە یەکێك لە جێژنە نەتەوەییەکانی باوباپیرانمانە، لە قووڵایی دڵمەوە بەو وجوودە خۆشەویستە و بنەماڵەی بەڕێزتان پیرۆزبایی عەرز دەکەم و بەختەوەریی دۆستی خۆشەویستم لە ساڵی نوێدا دەخوازم

ئیمزا سەروان کوچێکیان

* * *

حلول عيد سعيد و آغاز سال نوين را براى عرض ارادت مغتنم و بهترين وسيله دانسته تهانى و تبريكات صميمانه را تقديم، مزيد عزت و سعادت و موفقيت آنوجود محترم را از درگاه ايزد منان خواستار است

(يحيى افشار)

وەرگێڕانی کوردیی:

دەرکەوتنی جێژنی پیرۆز و دەسپێکردنی ساڵی نوێ بۆ عەرزی ئیرادەت بە غەنیمەت دەزانم و بە باشترین هۆی دادەنێم بۆ پێشکێش کردنی پیرۆزبایی پڕ بەدڵ، زیادبوونی عێزەت و بەختەوەری و سەرکەوتوویی ئەو وجوودە بەڕێزە لە دەرگانەی یەزدانی دەهەندە دەخوازم

یەحیای ئەفشار

* * *

در طليعهء سال نو و حلول عيد سعيد سلطانى عرض تهانى قلبيه و شادباشهاى صميمانه را وسيلهء تذكار خاطر محترم قرار داده و بقاو عمر و دوام عزت ذات مسعود عالى و فاميل معظم را از درگاه ايزد توانا مسئلت مينمايد

بيوك آصف زاده

وەرگێڕانی کوردیی:

لە دەرکەوتنی ساڵی نوێ و تێوەرسووڕانەوەی جێژنی پیرۆزی سوڵتانیدا لە دڵەوە پیرۆزبایی دەکەمە هۆی بیرهێنانەوەی بەڕێز و شابنی دڵپاکانەتان پێ دەڵێم و بەقای تەمەن و بەردەوامی گەورەیی زاتی مەسعوودی بەرز و بنەماڵەی گەورەتان لە دەرگای یەزدانی توانا داوا دەکەم

بیوکی ئاسەف زادە

* * *

پیرۆزبایی دووەم و سێیەم بە تایپرایتر (تەباعە) نووسراون، لەبن پیرۆزبایی دووەم بە خەتی سەیف نووسراوە: (یحیی افشار). لە پیرۆزبایی سێیەمدا ڕستەی "عـزت دات مسعود عالى و فاميل معظم" بە دەست نووسراوە. لە سەرەوەی ئەم لاپەڕەیەی پیرۆزبایی سێیەم سەیف چوار فەرد شێعری فارسی نووسیوەتەوە:

پیمبر با وفا و با حقوق است
نگه کن نیکی از چندین شقوق است
"حسن" زاد معادش حب آل است
ز اصحاب گرامم این سئوال است

هەر لە خوارەوەی ئەو لاپەڕەیەشدا، بە شێوەی ئەستوونی وشەی "مثنوی" نووسراوە .

## ڕەنگدانەوەی
## کۆچی دوایی سەیفولقوزات

### (١)

### نامەی سەرەخۆشیی سەرۆك وەزیرانی ئێران

جناب آقای محمد حسین سیف قاضی

از ارتحال مرحوم سیف القضات که همیشه مراتب علم و فضیلت و خدمات شایان آن مرحوم منظور دولت بوده و خواهد بود، تاسف و احساسات خود را بدین وسیله به شما و خانواده سیف قاضی اظهار و برای آن مرحوم طلب مغفرت از درگاه خداوندی نموده به شما و دیگر بازماندگان همواره در طی طریق نشر فضلیت و خدمت به دولت و ملت ساعی و جاهد باشید.

وەرگێڕانی کوردیی:

«ڕێزدار جەنابی محەمەد حسێن سەیفی قازی،

بە بۆنەی کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو سەیفولقوزاتەوە، کە مەرتەبەی زانستو فەزیلەتو خزمەتی ئەو خوالێخۆشبووە هەمیشە لەبەرچاوی دەوڵەت بووەو دەبێت، داخو کەسەری خۆم بە ئێوەو بنەماڵەی سەیفی قازی ڕادەگەیێنم و بۆ ئەو ڕەحمەتییە لە دەرگانەی خودا داوای لێبوردن دەکەم. هیوادارم کە ئێوەو بەجێماوانی دیکەی ئەو خوالێخۆشبوە بە شێوەو ڕێبازی ئەو، لە بڕینی ڕێگای بڵاوکردنەوە [ی] فەزیلەتو خزمەت بە دەوڵەتو میللەت تێبکۆشنو هەوڵ بدەن».

ژمارە ٢٩١٧، ڕێکەوتی ١٣٢٣/١٢/٢٩ [= ١٩٤٥/٣/٢٠]

ژمارە ٢٠٩٩٧، ڕێکەوتی ١٣٢٣/١٢/٦ [١٩٤٥/٢/٢٥]

مقام منیع بندگان حضرت اشرف، جناب آقای نخست وزیر دامت عظمته دستخط مطاع مبارك به شماره ٢٠٩٧٧ به تاریخ ١٣٢٣/١٢/٦ مملو از بذل مراحم و مکارم دینی بر تاسف وتسلیت از فقدان مرحوم ابوی سیف القضات بوده زیارت در حقیقت موجب کمال افتخار و سربلندی و مباهات گردیده و خاطر شکسته و جریحەدار عموم بازماندگان را تسلی و تسکین بخشید و بر مراتب فدویت و جانبازی جان نثار افزوده و بیش از پیش به مراحم دولت معظم امیدوار و معلوم و مسلم است

در تعقیب رویه آن مرحوم دایر بر ایفای وظایف میهن پرستی و شاه دوستی جدی و ساعی بوده تا بتواند افتخارات سه صد ساله خانوادگی را نگاه داشته و بلکه بیشتر توجه اولیای معظم را جلب و شایسته نظر لطف و مراحم دولت قوی شوکت بوده باشم. این است با عرض تشکر و سپاسگزاری فایقانه و فدویت و جان نثاری صادقانه بقا، عظمت وابهت ذات مقدس بندگان حضرت اشرف دامت عظمته را از درگاه حضرت احدیت مسئلت می نماید.

چاکر محمد حسین سیف قاضی

**وەڵامی ڕێزدار محەمەد حسێن خانی سەیفی قازی:**

**وەرگێڕانی کوردیی:**

((مـەقامی بـەرزی بەنـدەگانی حـەزرەتی ئەشـرەف، جـەنابی سـەرۆك وەزیـر، گەورەیی بەردەوام بێ،

دەستخەتی جێگەی ئیتاعەتی پیرۆزتان بە ژمارە ٢٩١٧ و ڕێکەوتی ١٣٢٣/١٢/٦ [= ١٩٤٥/٢/٢٥] کـە پـڕ بـوو لـە مەرحەمـەت نوانـدن و کـەرەمی ئـایینی بـۆ کەسـەر دەربڕین و سەرەخۆشیی لەدەستچوونی خوالێخۆشبووی بابم، سەیفولقوزات، زیارەت کراو لەڕاستیدا بووە هۆی ئەوپەڕی فەخر و سەربەرزی و شانازی و خاتری تێکشکاو و برینـداری هـەموو بـەجێماوانی هـێمن و هێـور کـردەوە و ڕادەی فیـداکاری و گیانبـەختکردنی منـی بـەرز کـردەوە و هیـوای لـە جـاران زیـاتری بـۆ مەرحەمـەتی دەوڵەتی مەزن پێدام. ئاشکرا و ڕوونە کە لە شوێنگرتنی ڕێبازی ئەو خوالێخۆشبووە بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکی وەتەنپەرستی و شادۆستی شێلگیرتر دەبم، تا بتوانم شانازیی سێـسەد سـاڵەی بنەماڵەکـەمان بپـارێزم و سـەرنجی زیـاتری گـەورەپیاوانی بـەڕێز ڕابکێشم و شایانی ڕوانینی مێهرەوانانـە و مەرحەمـەتی دەوڵـەتی بەشـەوکەت بم. هـەر بۆیەش، سوپاس و پێزانینی زۆر و بە فیدابوون و گیان بەختکردنی ڕاستەقینەوە، لـە خـودای گـەورە ئـاواتی گـەورەیی و شان‌وشـکۆی زاتـی پـیرۆزی بەنـدەکانی حـەزرەتی ئەشرەف، گەورەیی بەردەوام بێ لە خودای تاك و تەنیا دەخوازم.

چاکر: محەمەد حوسێنی سەیفی قازی

ژمارە ٢٩١٧، ڕێکەوتی ١٣٢٣/١٢/٢٩ [=١٩٤٥/٣/٢٠]

سەرچاوە: ویژەنامە چشم انداز ایران، نشریە سیاسی- راهبردی، ٢ کردستان همیشە قابل کشف، پاییز ١٣٨٤، لل٨٧، ٩٢.

## شێعری مەلا محەمەد سادق قزڵجی (قازی کاکە حەمەی بۆکان) بۆ کۆچی دوایی سەیفولقوزات

### کەلامی قازی کاکە حەمەی بۆکان

بیست‌وسێ، سێسەد لە دوای هەزارە [١٣٢٣]
مانگی ڕێبەندان دوازدە بە ژمارە [١٣٢٣/١١/١٢]

شەوێ لە خەودا وام هاتە بەرچاو
هەورێکی تاریك بڕی شوعلەی تاو

ئەو دنیا ڕوونە بوو بە شەوە زەنگ
هەواو ئاسمان بوو[ە] سیارەنگ

کوردستان هەمووی ڕەشی پۆشیبوو
ئەوەی نەمابوو کەیف‌و خۆشی بوو

لە هەموو لاوە عالم خرۆشا
لە سەرچاوەی دڵ مەینەت دەجۆشا

فەڕەح باری کرد، غەم هاتە جێگەی
شادی کۆچی کرد، تەم هاتە ڕێگەی

بازی دڵخۆشی ڕووی کردە غاران
کوندی غەمباران هاتە نێو شاران

حادیسەی گەورەی ناگەهانی بوو
وێنەی کووژرانی غەوسی سانی بوو

مورشیدی کامیل، پیری دەستگیر
لە ڕێی میللی دا خرایە زنجیر

بۆ دین‌و میللەت، سەربەستی کوردان
لە تەناف دران بەدەستی تورکان

وەقعەی کەربەلا تازە کراوە
لە دڵی کوردیدا، تابژێ، ماوە

لە ناڵەی مەخلووق، دەنگی مەلالەت
نیشانی دەدا زەلزەلەی ساعەت

دەسووڕامەوە سوقاق بە سوقاق
چاو پڕ لە ئەسرین، دڵ پڕ لە فیراق

لە هەموو کەسێ پرسیارم دەکرد
سەرەڕێم دەگرت، هاوارم دەکرد

تاکوو حاڵزانێ بدا جەوابم
ببێتە شفای دڵی کەبابم

هەر کەسێ دەمدی، هەروەك من وابوو
ماتەمزەدە بوو، سەری سووڕ مابوو

سەروشان بە قوڕ، بەرۆك دادڕابوو
ڕەنگ زەردو شێواو، کاری کرابوو

وامزانی ئەوە ڕۆژە گیراوە
یانە وەلوەلەی حەشرە هەستاوە

هەر هاتوچۆم بوو لە کووچەو شارا
سەرسام‌و بێ وان، ڕووم کردە سارا

چوومە باغ‌و دیم گلووك پەژموردە
وەك تفلّی مەعسووم دایك‌و باب مردە

بولبولان بێ زەوق لە حەیفی گلووك
ژێر باڵی دابوو لە خەما دەندووك

لق و پۆپی دار ڕووت و بێ گەڵا / زینەتی بردبوو ڕەشەبای بەڵا
چوومە سەر چۆمی، چۆمیش قوڕاو بوو / وەکوو دڵی من پڕ لە لێڵاو بوو
ئەمجار چوومە کێو گەیشتمە غارێ / ڕاوەستام، بیستم دەنگی هوزارێ
لەو دەنگەی بیستم: دەنگێك بەشەرم، / دەنگی دایکێك بوو بە زەلیلی و گەرم
بەدڵێکی مەجروون دەیلۆراندەوە / بە هەوای گەرم دەینووڕاندەوە
شین و شیوەنی ڕۆڵەی خۆی دەکرد / ئەیلاواندەوە، ڕۆڵەڕۆی دەکرد
کە ئەو دەنگەم بیست لە ئەووەڵ زیاتر / ئاورم تێبەر بوو، لە قەقنەس چاتر
دەیکوت: بینایی دیدەکانم ڕۆ! / پیرەمێردەکەی موکریانم ڕۆ!
هەویاو هومێدو پشتیوانم ڕۆ! / کوڕە گەورەکەی نیشتمانم ڕۆ!
موسوڵمانی ساغ دین دروستم ڕۆ! / بەو سەری پیری دارە دەستم ڕۆ!
پیاو ماقووڵەکەی نێو پیاوانم ڕۆ! / زاناو ژیرەکەی زمانزانم ڕۆ!
فیرەدەوسی کوردان، هونەرمەندم ڕۆ! / بیرەوەرەکەی خیرەدمەندم ڕۆ!
ڕۆڵە! لە دوای تۆ فەخرم بەکێ بێ؟ / ئیتر سەربەستیتم چۆن جێبەجێ بێ؟
کێ ئامۆژگاری مندالی من بێ؟ / کێ وەك تۆ ڕەحمی بە حاڵی من بێ؟
سەرم هەڵێنا، ڕوانیمە حەوا / ئاسمان شەق بوو بە ئەمری خوا
فریشتەی ڕەحمەت هاتنە خوارەوە / بە جارێك هەمووی هاتنە غارەوە
فاتیحەیان خوێند، تەسلییەتیان کرد / سەرە خۆشییان کرد، نەسیحەتیان کرد
پێیان دەفەرموو: ناشوکری مەکە / ئەولادت زۆرە، بێ سەبری مەکە
خسووس ئەولادت ئەولادی هەیە / ئەولادی ڕەشید، ئازادی هەیە
جێگەی ڕۆشنە، چرای ڕووناکە / ئەوانیش هەموو هەر دڵیان پاکە
بێجگە لەوانەش، ئەولادت زۆرە / خزمەتت دەکەن بچووك و گەورە
خودا گەورەیە، جەزای لەلایە / ڕەحمت پێ دەکا، عادەتی وایە
باقیش کە مابێ، هەموو وەرزێرن / بۆ ڕۆژی لازم مەردو دلێرن
لە بێکەسیدا دڵداریت دەکەن / لە جێی زیللەتدا ڕزگاریت دەکەن
پشت و پەنات بێ بە کەرەمی حەق / بە لوتفی خالق، واحیدی موتلەق
بێ هومێد مەبە، غیرەتیان هەیە / بۆ سەربەستی تۆ سەریان لە ڕێیە
گەورە بە جێی خۆی هاتۆتە مەیدان / جێی هومێدیشن بچووکەکانیان

ئەڵبەت بچووکیش دەبنە ساحێب ماڵ	هەر بنجکەدارە دەبێتە حەمماڵ [؟]
هەموو بە نامووس، غیرەتیان هەیە	شەوقی تەرەققی میللەتیان هەیە
ئەگەر تاق و لۆق لە ڕێگە دەرچن	بخۆن فریبی بێگانەو دوژمن،
خەمیان بۆ مەخۆ، پەشیمان دەبن	ئاخریش بۆ تۆ پشتیوان دەبن
ئەگەر قەبووڵ کەن نۆکەری و دیلی	لەبۆ تەماعە، یا لە بەخیلی
بە هومێدی حەق، خودای بێ نیاز	هەمووی بە جارێك دەبن بە هامڕاز
کە، ئەم خەوەم دی، لەخەو ڕاپەڕیم	هەتاکوو کووچە، لەجێ دەرپەڕیم
خەوەکەم ڕەوی، خەفەتم لاچوو،	ئەمما دەهشەتێ لە دڵما مابوو
برادەرێکم لە دوور پەیدا بوو	ئەویش وەکوو من شێت و شەیدا بوو
هاتە پێشەوە، کوتی: شێواوی!	لەبەر چی لە حاڵ خۆتا نەماوی؟
لە جوابدا کوتم: ڕۆحی شیرینم!	خەوێکی وامدی، بۆیە حەزینم
سەری هەڵێنا، کوتی: براکەم!	با تەعبیرەکەت لێ ئاشکراکەم
هەر چۆنە دیوتە عالەم وا ماتە	ئەمڕۆ وەفاتی سەیفولقوزاتە
ئەوەی لە غاردیت، دایکی وەتەنە	خەریکی شیوەن ئەبولحەسەنە.

(٣)

ئەم دەقەی شێعرەکەش، کە کاك جەعفەری قزڵجی لە گۆڤاری "سروە"دا بڵاوی کردۆتەوە:

### شێعری مەلا محەمەد سادق قزڵجی (قازی کاکە حەمەی بۆکان)
### لە شیوەنی کۆچی دوایی سەیفولقوزاتدا

لە خەودا پێی وتم پەیکی خەبەروێژ	هەڵسە، مەوێستە، بڵێ بەبانگ وێژ:
بەنێو جەماعەت ڕاکە، هەراکە	بڵێ مەردی چاك نزیکە وەفات کا
کە هەڵسام لەخەو، وەهۆش هاتمەوە	شوکری خودام کرد بە ماتەمەوە
هاتیف سەدای کرد بڕۆ لە سەرچەم	لێت حاڵی دەبێ ئەو غەم و ماتەم
چوومە سەرچۆم و چۆمیش قوڕاو بوو	هەروەك دڵی من پڕ لە لێڵاو بوو
چوومە نێو خەڵکی، عالەمیش ماتە	ئیمڕۆ وەفاتی سەیفولقوزاتە
مەحزوون دەیانگوت لاوی جوانم ڕۆ	قورئان خوێنەکەی سبەینانم ڕۆ

گەورە گەورەکەی نیشتمانم ڕۆ | زانا گەورەکەی کوردستانم ڕۆ
پیرەمێردەکەی سلێمانیم ڕۆ | سەرۆك خوویژان موکریانیم ڕۆ
کەس وەك ئەو نەبووەو قەت نایێتەوە | بەماڵو بەزێڕ ناکڕێتەوە
هومێدم وایە لەمە بەولاوە | جێی خاڵی نەبێ لەملاو ئەولاوە
کوڕە گەورەکەی عەقڵی تەواوە | سەبرو حەوسەلەی لەلا نەماوە
ئەو پارە پیسەی حاکم پێی دەدا | لێی دەس هەڵگرێ، خودا پێی دەدا
قزڵجی! بەسیە، لێی حاڵی دەبێ | حوکمی خودایی دەبێ هەر ببێ
خۆ بکا بە کوڕی "دایکی نیشتمان" | ڕۆحی شاد ببێ بە باغی ڕیزوان
ڕەحمەت لە قەبری، بە جەننەت شادبێ، | کوڕەکانیشی ڕۆحیان ئازاد بێ.

سەرچاوە: گۆڤاری "سروە".

(٤)

**شێعری ئەمر مەلا ئەمجەدی عوسمانی لە شینی وەفاتی سەیفدا:**

وەرن هاوارە کوردان ڕۆژی شینی کوردە، قەوماوە
چرای وەك حەزرەتی سەیفولقوزات هەر لێمە کووژاوە
کە زاتێکی وەك ئاغای سەیف وەفاتی کرد، بە مەعلوومی
بناغەی دین و زانین نەقسی هێنا، پاکی ڕووخاوە
نەمانی پیاوی گەورە، پشت شکێنی میللەت و دینە
لە دونیادا دروست مەعلوومە هەر پیاوێ بە سەد پیاوە
بە فەوتی پیاوی وا، ناقیس دەکا حەق ئەم کورەی خاکە
بۆ خۆی فەرموویە «ناتی الارض تنقصها» لە هەر لاوە
بە نووسین وەسف و چاکەی ئەو تەواو نابێ بە تۆ، ئەمجەد
ئەگەر سەد دەفتەری گەورە بنووسی و بێتە ئینشاوە
وجوودی ئەو کەسانەی لێی بەجێ ماون سلامەت بێ
بەڵێ دونیا بەقای بۆ کەس نەبوو و نابێ لەمەودواوە
هەزار ڕەحمەت لە جێگاو مەرقەدی ئەو بێ هەتا مەحشەر
بۆ ئەو ئەولادە چاکانەو بۆ تەرتیباتی ڕۆی ناوە

بەڵێ بابی وەها ئەڵبەت دەبی ئەولادی وای لیٚ بێ

لە جێگەی پیاوی چاك چاكتر لەوانە كوا بەجێ ماوە؟

غرووبی حەوتی بەهمەن ڕووحی پاكی ڕۆیی بۆ جەننەت[۲۳/۱۱/۷ی هەتاوی] (۱)

غرووبی ڕۆژ هەمیشە بۆ بەشەر تاریكی هێناوە

بە خوێنی چاوی كوردان نوقتەدار بوو حەرفی تاریخی

لە دوای ئەو عەیشی كوردان بوو بە غەم، ئازاری بۆ ماوە

۱) [= ۱۹٤٥/۱/۲۱]

(٥)

**بەشێك لە شێعری "ئوەیسی عوسمانی" (مەلا بابەوەیسی) برای نەمر مەلا ئەمجەدی عوسمانی بۆ فەتاح خانی سەیفی قازی كوڕە گەورەی شەهید محەمەد حسێن خان و نەوەی سەیفولقوزات**

تەئریخ هەزارو سێسەدو دوازدە

بیستی فەروەردین، دادو بێدادە [۱۳۱۲/۱/۲۰](۱)

ئەمنیش نووسیومە تاریخی سی و نۆ

لە هەزارو سێسەد، فەتاح خان بۆ تۆ[۱۳۳۹] (۲)

ناوم ئوەیسە، شوهرەت عوسمانی

ئەگەر ئاغابی قەدرم دەزانی

ئەتۆ ئەولادی سەیفولقوزاتی

بۆ من لەجێی وی گەورەی وڵاتی

ئەتۆ بۆ ئەمن هەر تاجی سەری

نەسڵی شەخسێكی زۆر ناز پەروەری....

۱) ۱۹۳۳/٤/۹=۱۳۱۲/۱/۲۰

۲) ۱۹٦۰=۱۳۳۹

سەرچاوە: كەشكۆڵی مەلا بابەوەیسی، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ٦۷و ٦۸.

### ئەو بابەتانەی کە سەبارەت بە سەیف نووسراون

کەسایەتیی جامیعو هەمەلایەنەی سەیفولقوزات بووبوە هۆی ئەو ڕاستییەی کە لە سەردەمی ژیانی خۆیدا، گەلێك کاروباری سیاسیو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی مەهابادو موکریان بەشێوەیەك لە شێوەکان پەیوەندییان بەوەوە پەیدا دەکرد.

دوابەدوای کۆچی دوایی سەیفیش بانگەواز و ناوی لە زۆر شوێندا هەر ما و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دەنگی دایەوە. دیارە یاد کردنو ڕێزگرتن لە سەیفیش دوابەدوای هەرەسی کۆماری کوردستان، وەك هەموو دیاردەیەکی دیکەی نەتەوایەتی تووشی نشوستیو بێدەنگی هات، بەڵام لە بڕگەی جیاجیادا دیسان ناوی سەیف لە پشت هەوری سانسۆر دەرکەوت و نووسەرو شاعیرو توێژێنەرانی کورد لە دەرفەتی گونجاودا ئاماژەیان بە کەسایەتی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیی ئەو کرد.

لێرەدا ئەوەندەی بۆم بگونجێت ئەو نووسراوانە دەهێنمەوە کە نووسەرو ئەدیبو سیاسەتوانانی کورد سەبارەت بە سەیفیان نووسیوەو هەوڵ دەدەم ئەم کارە بە گوێرەی ڕێکەوتی نووسرانی بابەتەکان بکەم. دڵنیام گەلێك بۆچوونو هەڵوێست گرتنی خەڵکانی دیکەش هەن کە من لێیان ئاگادار نەبووم. دوورە وڵاتیو دەست ڕانەگەیشتن بە سەرچاوەو خەڵکانی شارەزا، دەرەتانی لەوە زیاتری پێ نەدامو ئەوەش کە هەیە، بەشی هەرە زۆری لە ڕێگەی کاك حەسەنی قازییەوە ئامادە کراون، دەنا من ئاگاداریان نەبووم.

**لیستەی بابەتەکان:**

١. کۆمەڵەی ژێکافو عەبدولڕەحمانی زەبیحی
٢. ڕۆژنامەی کوردستان و سەیید محەمەد حەمیدی(١)
٣. ڕۆژنامەی کوردستان(٢)
٤. گۆواری کوردستان (سەید محەمەد حەمیدی)
٥. ڕەحیمی قازی
٦. ئەحمەدی قازی(١)
٧. ئەحمەدی قازی(٢)
٨. هەژاری موکریانی

٩. سەیید عوبەیدیللا ئەییوبیان

١٠. مەلا محەمەد ساڵح ئیبراهیمی

١١. هێمن موکریانی(١)

١٢. هێمن موکریانی(٢)

١٣. عەبدوڵڵا خانی ناهید

١٤. کەریمی حسامی

١٥.خەلیل فەتتاحی قازی

١٦. بابا مەردووخ ڕۆحانی (شیوا)

١٧. ڕحمت الله خان معتمد الوزراه

١٨. محەمەدی قازی

١٩. سەیید محەمەد سەمەدی

**یەکەم**

**کۆمەڵەی ژێکاف و زەبیحی**

نامیلکەی "دیاری کۆمەڵەی ژێکاف بۆ لاوەکانی کورد"، کە لە ساڵی ١٣٢٢ هەتاوی و ١٩٤٣ی زایینیدا بلاوبۆتەوە، دەقی شێعری بەناوبانگی سەیفولقوزاتی تێدا چاپ کراوە:

«کوردینە! تاکەی ئێمە لە کێوان، میسالی دێو

بێین و بچین و بۆ مە نەبێ قەت خودان وخێو...»

لە پێشەکی شێعرەکەدا نووسراوە:

«ئەم قەسیدەیەی خوارەوە هۆنراوەی جەنابی "حسن سیف القضات"ە، کە یەکێکە لە پیاوە پیرە نیشتمانپەروەرەکانی موکوریان. ئەگەر پیرەمێردی سلێمانی لێمان زویر نەبێت، ئێمە بەم زاتە ئەڵێین "پیرەمێردی سابلاغ"».

نامیلکەکە، بە مەزەندە، دوو ساڵ پێش مەرگی سەیف بلاو بۆتەوەو لەو سەردەمەدا سەیف ٦٦ ساڵان و مرۆڤێکی بەڕێزو جێگەی پرس و ڕاو ئیحتیرامی خەڵك بووە. هەروەها نیشتمانپەروەری و کوردایەتی کردنی سەیف جێگەی بڕوای خەڵکانی

سیاسی و یەك لەوان زەبیحی بووە. نازناوی "پیرەمێردی سابلاغ" یاخۆ "پیرەمێردی موکوریان"یشی هەر لەو پەیوەندییەدا پێدراوە. گەرچی ڕوون نییە ئەم نازناوە کێ یەکەمجار بە سەیفی دابێت، بەڵام وەك سەرچاوەی چاپکراو، بێگومان ئەم باسە، یەکەمجار لە نامیلکەی کۆمەڵەی ژێکافدا هاتۆتە گۆڕێ.

سەرچاوە: عەلی کەریمی، "ژیانو بەسەرهاتی عەبدوڵڕەحمان زەبیحی (مامۆستا عولەما)، چاپی یەکەم، بنکەی چاپەمەنیی زاگرۆس، سوید ۱۹۹۹، ٦٨٦ لاپەڕەی ٥٥٤.

سەرەتاکە چەند دێڕییەکەو بەم پێیە، باسی سەیفولقوزاتیش دەبێ زەبیحی خۆی نووسیبێتی، کە گەڕێنەندەی "نیشتمان"و نووسەری سەرەکیی "دیاری کۆمەڵەی ژێکاف..." بووە.

**دووهەم**

**سەیید محەمەد حەمیدی، ڕۆژنامەی کوردستان**

**بە موناسەبەتی یەکەمین ساڵی وەفاتی ابوالحسن سیف قاضی [سیف القضات]**

شاعیری بەناوبانگ یا بە قەوڵی دیاری کۆمەڵەی (ژ. ك) پیرەمێردی سابلاغ ئەبولحەسەنی سەیفی قازی کوڕی میرزا ئەبولقاسمی قازی، لە هەشتەمینی [حەوتەمینی] مانگی بانەمەڕ (ئۆردیبهێشت)ی ۱۲۵٥ی شەمسی، موتابقی چواری ڕەبیعولسانی ۱۲۹۳ی قەمەری لە شاری سابلاغ (مەهاباد) لە دایك بووە. ئەم زاتە لە بنەماڵەی قازییەو ئەوەندەی ئێمە دەزانین ئەم خانەوادە لە سابلاغدا چەن چەرخێکە نێو بەدەرەوەو جێگەی ڕێکخستنو پێکهێنانی ئومووری قەزایی و عورفی و بەڵکوو بە هێزی باسكو ئەسڵەحە ڕاگری حقووقی خەڵکی، بە تایبەتی دانیشتووانی سابلاغ، بوونو گەلێ جار وابووە کە لەلایەن عەشاییری دەورو بەرەوە یا حکوومەتی هەندەران لە سابلاغ هەڕەشە کراوە وەلی ئەم خانەوادە هەنگاوی پیاوەتییان هەڵێناوەو سابلاغیان لە پەلاماری دوژمنەکان پەنا داوە.

مەڕحوومی سەیف لە خزمەت مەلا شەفیعو مەلا حەسەنی کوڕی قزڵجی و مەلا ساڵحی سەردەراباتی علوومی مەعقوول ومەنقوولی خوێندووەو پاش تەواوبوونی

خوێندن بە قەزاوەت خەریك دەبوو. زۆرو ستەمی موستەعمەرەچییەکانی دەگەڵ نەتەوەی کورد بەچاوی خۆی دیوەو لە جەرگ‌و هەناوی کاری کردووە، جا دڵی کوڵیوەو بێخاوەنی‌و پەرێشانی‌و بڵاویەتی‌و سەرکزی‌و هەژاری کوردەکانی لە ئەشعاری میللی خۆیدا نواندووەو دەڵێ:

کوردینە تاکەی ئێمە لە کێوان میسالی دێو
بێینوو بچینوو بۆ مە نەبێ قەت خودان‌و خێو
خەڵکی هەموو لە باغ‌و لە شارانە کەیف خۆش
ئێمەش بڵاو و بێ سەرە ماوین لە دەشت‌و کێو

و بە گوێی کوردان دەگەیێنێ کە چلۆن نەتەوە زیندووەکانی دنیا ئاسمان و زەوییان تەسخیر کردووەو کوردی هەژاریش لەسەر عەردی ڕەق‌و بەردی تەق ماوەتەوە.

بۆ ئاسمان دەڕۆن‌و لە بەحرا دەکەن سەفەر
هەر هەردە نیشتگاهی مە، سنعاتە وەرد و شێو
ڕێی وانە کەهکەشان‌و ڕێی ئێمە بەردەڵان
جێی وانە تەخت‌و بەخت‌و جێی ئێمە بەردو چێو

ئەمجار شاعیری دڵسووتاو قرچەی لە دڵ دێت‌و بە ئاهوناڵەو هەزار غەم‌و تەم بە ژیانی بێ لەزەتی کوردەکان دەگا کە کورد لە ئاوەدانی، خانووی خۆش‌و خۆراکی زەریف بێ بەشەو ماڵ‌و نیشتمانی بێگانەش پڕە لە نازو نێعمەت‌و زێڕو زێوی وان کە بە زۆر لە دەستیان دەرێناون:

ڕەشماڵە ماڵ‌و کەشك‌و پەنێرە، مەتاعی مە
قەسرو سەرای خەڵکی دییە پڕ لە زێڕو زێو
بۆ وانە هەرچی جوانە، لە جێ، دێ، لە ژن، لە ماڵ
هەر شاخ‌و داخە بۆ مە، کوڕی ڕەش، کچی دزێو

شاعیری سووتاو پاش ئەوەی پەرێشان بوونی خۆیان بۆ بەیان دەکاو حاڵییان دەکا کە بێگانە بە ماڵ‌و نیشتمانی ئەوان چلۆن خۆشن‌و لە خۆشیان کەیف‌و سەما دەکەن، غیرەتی وەجۆش دێ‌و هەڵدەکاتە شین‌و شەپۆڕو دەڵێ ئەگەر زوو لە دەستی بێگانە نەیێینە دەرێ مەحو دەبینەوە:

ژێر دەستیو ئیتاعەتی بێگانە تا بە کەی؟
شەرمە لە بۆ مە هێندە بژین بێ نیشانو نێو
مەغموونی هەر موعامەلە، مەحکوومی هەر کەسێ
شاهان بە مەحوی ئێمە دەبەستن گرێو گرێو

بەمە بەس ناکا وەبیر کوردان دێنێ کە ئەوانیش لە مێژوودا خاوەن تاجو تەخت بوونو قارەمانەتی کوردان وەبیر دێنێتەوەو مەفاخری میللییان بۆ بەیان دەکا:

گوردانی کوردەکان، کە لە ترسیان دەلەرزی عەرز
کێ بوو لە شامێ شابوو، لە میسریش ببووە خەدێو؟
(سەلاحەدین)

لە دواییا هاوار دەکا کە دەرمانی دەردی ئێمە غیرەتو پەیدا کردنی ئەسلەحەو مەردانەگیو دانانی سەرو ماڵو نەترسان لە بەندو هەڵوەسینەو ئەمر بە برایەتیو یەکیەتیو پەلاماردان دەکاو ڕوو دەکاتە پاڵەوانانو دەفەرمووێ:

گوردانی کوردەکان! بەخودا ڕۆژی غیرەتە
دەست دەینە خەنجەرانو پیاوانە بێینە نێو!
بۆچمانە ماڵ و سەر کە لەسەر سەروەری نەچێ
کوڕ نابێ قەت بترسێ لە زیندانو دارو چێو
پێ هەڵگرن بگەینێ کە شەڕ، بۆمە شاییە
دەست تێکگرن درەنگە، جحێڵانە بچنە نێو
ئەو ژینی بەم زەلالەتە بۆچمانە چاوەکەم؟
بپسێین لە ڕێی نەجاتی وەتەن با بەنێرو مێو

ئەو جار ئیشارە بە فیداکاری کوردان دەکاو دەگەیێنێ کە تورکەکان دەگەڵ کوردی ئاراراتو دیاربەکرو هەروەها ئێرانییەکان چیان بە سەر سەردارانی میللی کوردستان هێنا، جا ئەم فەجاییعانەی بە کورتی لە ئەشعارەکانیدا گەیاندووە:

سەرچوونی تەخت ڕۆینی سەرداری پێدەوێ
خۆشیمە لەو شەهادەتی شێخانە نێو بەنێو

پاشان ئێشارە دەکا لە کاتێکدا کە دەنگی دێمۆکراسی لە دنیادا نێوی پەیدا بوو و هەموو نەتەوەیەك لە حقووقی حەقەی خۆی بەشدار بوو و کوردیش داوای حەقی

خۆی دەکرد دوژمنەکان هیچیان پێ نەمابوو دەهاتن کوردیان بە سەربزێوو ئەشڕارو ماڵخۆر نێو دەبرد:

هەر میللەتێ لەلاوە حەقی خۆی بەدەستەوە

کوردێك کە سەرهەڵێنێ دەڵێن بۆتە سەربزێو

وە لێرەدا هاوار دەکا کە کوردیش موستەحەقی بەشە و ئازادی خۆی دەوێ:

ئازادی، سەربەخۆیی، میری و گەورەیی

داوا دەکەین بە زارو زمان و ددان و لێو

دوای ئەم هەموو تەشویق و پاڕانەوە چون دەبینێ کە نەفامەکانی کورد نایەنە ڕەدا و هەر کارێکی ئەساسی کە بۆیان دادەنرێ بە دوو بەرەکی تێکی دەدەن، دیسان تەشویقیان دەکاو زیلەت و پەرێشانی کوردانیان دێنێتە بەرچاو و مۆڵەتیان دەدا کە بیرێ لە حاڵی خۆ بکەنەوە بەڵکوو ئیمان بە حەقیقەت بێنن و پیاوانە بێنە مەیدانێ. ئەگەر دیسان ئامادە نەبوون ئەمر بە دەرکردنیان دەکاو خۆی ئامادە کردووە کە لە ڕێی ئەستاندنەوەو ڕاگرتنی سەربەخۆیی کوردستاندا هەموو جۆرە دەردیسەرییەك قبووڵ دەکا:

تاکەی لە باغی خەڵکی بە زیزی و بە ملکەچی؟

خۆشە لە باغی عێلی چنینی هەنارو سێو

فکرێ لە حاڵی خۆ کەن و بگرین بە حاڵی خۆ

هەر بێ سەری و عەداوەتی خۆتانە دێتە ڕێو

لا هەڵدڕاو و جەرگ بڕاو وفڕی دراو

ڕامان دەدەن بە جارێ لە هەورازێ بۆ نشێو

هەر کەس کە بیری تۆڵەو جێی بابی خۆی نەبێ

ئەو بێ بەشە لە کوردی، دەری کەن نەیەتە نێو

هەرچی دەبێ بلا ببێ، حەق هەر حەقە حەسەن

نینە لە ڕێی وەتەن خەمی دەرکردن و جنێو

مەرحوومی سەیف پیاوێکی یەجگار زیرەك و تێگەیشتوو و زاناو نیشتمانپەروەر بوو، ئەگەر کەسێکی لە جێگەیەك بدیبایە پاش چەنساڵیش ئەو شەخسەی لە هەر جێی دی چاوپێکەوتبا دەیناسییەوە. دەگەڵ هەموو کەس

ڕەئووف‌و مێهرەبان بوو. دەگەڵ ئەوەی پیاوێکی میللی‌و نیشتمانپەروەرو خۆشەویست بوو و ئەمەش مایەی ڕق هەستانی ئێرانیان بوو دیسان لەبەرچاوی پادشاکان‌و وزەراو ئومەرای ئێراندا بێ ئەندازە بەڕێزو خۆشەویست تەماشا دەکرا. لە وەختی قیامی شێخ محەمەدی خیابانیدا تێکەڵی کردو دەگەڵ ئەحزابی سیاسی کوردانی تورکیە پێوەندێکی تایبەتی دەنواند، هەر وا تەمەنی خۆی بە نیشتمانپەروەری بەخت کرد تا لە ڕۆژاوای حەوتمی ڕێبەندان (بەهمەن)ی ١٣٢٣ شەمسی موتابقی ١٢ای سەفەری ١٣٦٤ لە تەمەنی هەفتا ساڵێدا دنیای ویداع کردو کەسوکارو نیشتمانپەروەرەکانی بە یەجگاری خەمناك کرد. مەلا ئەمجەدی عوسمانی ئەم شێعرانەی لە شینی وەفاتیدا داناوە:

وەرن، هاوارە کوردان! ڕۆژی شینی کوردە، قەوماوە
چرای وەك حەزرەتی سەیفولقوزات هەر لێمە کووژاوە
بە نووسین وەسف‌و چاکەی ئەو تەواو نابێ بە تۆ، ئەمجەد!
ئەگەر سەد دەفتەری گەورە بنووسی‌و بێتە ئینشاوە

مەرحوومی سەیف لە هەر بابەتێك بە فارسی‌و کوردی هەڵبەستی زۆرە بەڵام گەلێکیان میللین‌و زۆرمان ئارەزووە کە خودا یارمەتیمان بدا خڕیان بکەینەوەو یەك جێ لە چاپی دەین. جێ نشین‌و ئەرشەدی ئەولاد لە دوای مەرحوومی سەیف ئاغای محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازییە کە لە ڕێی میللەت‌و سەربەخۆیی کوردستاندا زۆری مەینەت کێشاوە و گەلێکی ماڵ بەخت کردووەو ئێستاش معاونی فەرماندەیی هێزو سەردەستەی پێش مەرگەکانی کوردستانە، دوای ئەو ئاغای ڕەحیمی سەیفی قازییە کە گەنجێکی لاوچاك‌و خوێن گەرم‌و دەگەڵ پێش مەرگەکانی کوردستان ئامادەی فیداکارییە. تەوفیقیان لەخودا دەخوازین.

سەیید محەمەد حەمیدی

سەرچاوە:

ڕۆژنامەی کوردستان– بڵاوکەرەوەی بیری حزبی دێمۆکراتی کوردستان، ژمارەی ٨، ساڵی یەکەم، دووشەمۆ ٨ی ڕێبەندانی ١٣٢٤، ٢٨ی ژانویەی ١٩٤٦.

سێهەم

رۆژنامەی کوردستان

شاعیری میللی بەناوبانگ حضرتی ابوالحسن سیف قاضی مەرحووم

یەکێ لە زیانی هەرە زلی ئەو چەرخە دوایییەی زانستو ئەدەب بەتایبەتی ئەدەبیياتی کوردی، ڕابردنی هۆنەرێکی بڵند پایەو بەرز حەزرەتی ئەبولحەسەنی سەیفی قازی کە نێوبانگی بە سەیفولقوزات ڕۆیشتوە.

ئەم ئەستێرە گەشەی ئەدەبیياتە کە لە کەناری ئاسمانی کوردستان هەڵاتوە، بە نووری دانشو زانستی خۆی عالەمی شێعرو ئەدەبیياتی ڕووناك کردووە، نە تەنیا مایەی سەربەرزیو شانازی کوردستانی موکریانە، بەڵکوو بە بوونی ڕۆڵەیەکی وا کە دایکی گیتی لە بوونی وێنەی وی ڕژدی دەکا، بۆوەی دەبێ کە هەموو کوردستانی گەورە پێی بنازێ.

ڕووناکیی دڵو نەزافەتی تەبعو وردیی مەعنەوی، زیبائی ئەلفاز دەگەڵ تیژی زێهنو زیرەکیو هەستی نەوع پەرستیو بەرزی گیانو ئەخلاق، سەیفولقوزاتی لەنێو زانایانو گەورە گەورانی زەمانی خۆیدا بێوێنە کردبوو. سەبكو شێوەی سەیف زۆر مامۆستایانەو دەگەڵ جوانتر کەلام بەرانبەری دەکرد. ئەشعاری دڵڕفێنو ئاوداری وی دەگەڵ مەزامینی نوێو سوودمەند لە ئیستیحکامدا وەك پۆڵاو لە ڕەوانیدا وەك ئاو وایە بە تایبەتی ئەشعاری دڵچەسپو میللی کە مایەی چاککردنی کۆمەڵو وەخەبەر هاتنی کوردە. سەیفولقوزات لە کوتنی ئەشعاری کوردیو فارسیدا زۆر ماهیر بوو و بە سۆزی ئەشعاری میللی خۆی دڵی نیشتمانپەرەستانی وەکووڵ دێنا.

کاتێك کە مەڕحوومی سەیف لە ٧ی بەهمەنی ١٣٢٣دا وەفاتی کرد تەئەسوراتێکی زۆری دەنێو دۆستانی خۆیدا ئیجاد کردو زانایانو هۆنەران بە شێعرو غەزەل شیوەنیان بۆ کرد. ئەوا لە ژێرەوە بەشێك لەو شێعرانە دەهێندرێتە بەرچاو:

شیوەنو ناڵەی دایکی وەتەنە

غەمی وەفاتی ئەبولحەسەنە

کوڕی نیشتمان، سەیفولقوزاتە

کوڕی گەورەی بوو، بۆیە وا ماتە

کوردەکانی دی، پاك لێو بە بارن

هەموو پەژموردەو عاجزو غەمبارن
لەبیرم چوو بوو شێخی شەمزینان
کاکە سەعیدی وان‌و باشقەڵان
فەرزەندە، و نووری، ئیسماعیل حەقی
خالید بەگی کورد، هەم ساڵح زەکی
لە جیاتی هەمووان سەیفولقوزات بوو
ئومێدی کوردی هەموو وڵات بوو
ناشوکری ناڵێم ئەویش هەر ڕۆیی
بۆ گەورە ناسی‌و بۆ خودا جۆیی
کەس وەك ئەو نەبوو قەت نابێتەوە
بەماڵ‌و بەزێر ناکڕرێتەوە
ڕەحمەت لە گۆڕی بە جەنەت شاد بێ!
کوڕەکانیشی ڕوویان لە هات بێ!
ئومێدم وایە لەمە بەولاوە
جێی خاڵی نەبێ لەم لاو لەولاوە
چونکە کوڕەکەی عەقڵی تەواوە
تەمەع‌و بوغزی لەلا نەماوە
خۆبکا بە کوڕی دایکی نیشتمان
ڕۆحی شاد ببێ بە باغی ڕیزوان

تێبینی: بەداخەوە کوردستان نە نێوی نووسەری بابەتەکەو نە نێوی شاعیری ئەو بەیتانەی سەرەوەی نەنووسیوە، بەڵام هەر وێدەچێ نووسینی سەرنووسەری "کوردستان" سەیید محەمەد حەمیدی بێ.

سەرچاوە:

ڕۆژنامەی کوردستان، بڵاوکەرەوەی بیری حزبی دیموکراتی کوردستان، ژمارەی ٢٦ ساڵی یەکەم دووشەمۆ ٢٧ی ڕەشەممە ١٣٢٤، ٨ی مارسی ١٩٤٦، لاپەڕەی یەکەم [لەگەڵ وێنەیەکی سەیف]

## چوارەم
## گۆواری کوردستان

یەکەم ژمارەی گۆواری کوردستان ماوەی پێنج حەوتوویەك پێش دەرچوونی ژمارە یەکەمی ڕۆژنامەی کوردستان لە مەهاباد دەرچووە. ئەم گۆوارە بڵاو کەرەوەی بیری حزبی دێمۆکراتی کوردستان بووە و لە ژمارەی ٣ی خۆیدا (ساڵی یەکەم، مانگی خاکەلێوەی ١٣٢٥ی هەتاوی، مارسی ١٩٤٦ی زایینی لە ١٤ لاپەڕەدا (لاپەڕەی ١٣ تا ٢٦) چوار پارچە شێعری سەیفی بڵاو کردووەتەوە. گۆواری کوردستان چ شیکردنەوەیەکی لە سەر شێعرەکان نەنووسیوە و تەنیا لەتکە شێعرێك کراوە بە سەردێڕ: ((لاڵ بم نابینم مەیلی جارانت))

کە میسراعی دووەهەمی شێعرە ناسراوەکەی سەیفە: ((زۆر توولی کێشا عەزیز ! هیجرانت))، ئینجا لە ژێریدا نووسراوە "مرحوم سیف القضات" و بە شوێن یەکەم پارچە شێعردا، پارچەی دووهەم و سێهەم و چوارهەم چاپ کراون. لە نێوان پارچە شێعری یەکەم و دووهەم (یار کە دێتە سەر گۆل و ئەستێرە)دا ئەم دێڕانە نووسراون:

((لە ربیع الثانی ١٣٤٥دا کە سمایل ئاغای سمکۆ بۆ لای ڕەواندز هەڵاتووە و دەوروبەری بڵاوەیان کردووە، فەرموویەتی)).

لە نێوان ئەو شێعرە و پارچەی سێهەم (عەزیز ئارەزوت زۆری بۆ هێنام)یشدا نووسراوە:

((ششم صییام لە خانەقا فەرموویەتی))

بەڵام ژمارە ٤ی گۆواری کوردستان (ساڵی یەکەم، مانگی بانەمەڕی ١٣٢٥ هەتاوی، مەی ١٩٤٦ی زاینیی) بە وێنەیەکی گەورەی سەیف ڕازاوەتەوە کە لە ژێریدا ئەم شێعرانەی مەلا مارفی کۆکەیی نووسراون:

((یا پیك روحانی بگو با حضرت سیف القضات))

ای نور مشکاة قضا، ای خاندان افتخار
ای مرکز فضل و کرم، ای مرکز عزم و همم
ای صاحب سیف وقلم، ای معدن عز و وقار!
(کوکی)

ئینجا ئەم سەردێڕانە هاتوون:

((زانایانی کورد

شاعیری میللیی بەناوبانگ حەضرەتی ابوالحسن سیف قاضی

(بە هۆی ۷۲مین ساڵی لەدایکبوونی)

سید محمد حمیدی))

پاشان دوو لاپەڕەی بابەت سەبارەت بە سەیف نووسراوە کە لێرەدا دەیهێنینەوە و لە درێژەیدا سەر دێڕێك بە یەکێ لە پارچە شێعرەکانی سەیف دراوە و سەرجەمی شێعرەکەش چاپ کراوە. سەردێڕەکە بەم شێوەیە:

((بۆ میللەتی زەعیف هومێد و هەناوییە))

شێعرەکەش بریتییە لە هەڵبەستی ناسراوی سەیف:

((ئەورۆ حەسەن پەیامی دۆعا و سلاوییە

بۆ میللەتی ڕەشید(ی) پەنای بەش خوراوییە ..))

لە کۆتایی ئەو شێعرەدا کە گۆواری کوردستان چاپی کردووە هاتووە: ((سیزدەم ذی‌حجە الحرام در قریە زرین دە نوشتە شد اقل سیف القضات قاضی ۱۳۲۳ شمسی)) (دیارە ئەمە هەر هەمان نووسینە کە سەید محەمەد حەمیدی لە ژمارەی ۲٦ی ڕۆژنامەی "کوردستان"دا بلاوی کردووەتەوە.)

ئەمەش دەقی وتارەکەی نەمر سەید محەمەدی حەمیدی سەبارەت بە سەیف کە بە ڕێنووسی ئەم ڕۆژگارە دەینووسینەوە:

((یەکێ لە زیانی هەرە زلی ئەو چەرخی دواییەی زانست و ئەدەب بە تایبەتی ئەدەبیاتی کوردی لە دەسچوونی هۆنەرێکی بڵند پایە و بەرز حەزرەتی ئەبولحەسەنی سەیفی قازیی کە نێوبانگی بە سەیفولقوزات ڕۆیشتووە. ئەم ڕۆژی ڕووناکی ئەدەبیاتە کە لە کەناری ئاسمانی کوردستانی ڕۆژهەلات درەوشیوە و هەلاتووە و بە نووری دانش و زانستی خۆی عالەمی شێعر و ئەدەبیاتی ڕووناك کردووە، نە تەنیا مایەی سەربەرزی و شانازی کوردستانی موکریانە، بەڵکوو بە بۆنەی ڕۆڵەیەکی وا کە دایکی گیتی لە پەیدا کردنی وێنەی وی ڕژدی دەکا، بۆ وەی دەبێ کە هەموو کوردستانی گەورە پێی بنازێ.

ڕووناكیی دڵ و لەتافەتی تەبع و وردیی مەعنا و زیبائیی ئەلفاز و شیرینیی وتار دەگەڵ تیژیی زێهن و زیرەكی و هەستی نەوع پەرستی و بەرزیی گیان و ئەخلاق سەیفولقوزاتی لە نێو زانایان و گەورە گەورانی زەمانی خۆیدا بێوێنە كردبوو.

سەبك شێوەی سەیف زۆر مامۆستایانە و دەگەڵ جوانتر (ین) كەلام بەرانبەری دەكرد. ئەشعاری دڵڕفێن و ئاوداری وی دەگەڵ مەزامینی نوێ و سوودمەند لە ئیستحكامدا وەك پۆڵا و لە ڕەوانیدا وەك ئاو وایە و بە تایبەتی ئەشعاری دڵچەسپ و میللیەكانی، كە مایەی وریا بوونەوەی كۆمەڵ و هۆشیاربوونەوەی كوردە.

ئەبولحەسەنی سەیفی قازی كوڕی میرزا ئەبولقاسمی قازی لە هەشتەمی [حەوتەمی] مانگی بانەمەڕ (ئوردیبیهێشت)ی ١٢٥٥ی شەمسی بەرانبەری چوارەمی ڕەبیعولسانی ١٢٩٣ قەمەری لە شاری مهاباد لەدایك بوو. ئەم زاتە لە بنەماڵەی قازییە و ئەوەندەی ئێمە دەزانین ئەم خانەوادە لە مهابادێدا چەن چەرخێكە نێو بە دەرەوە و جێگای ڕێكخستن و پێكهێنانی ئومووری قەزائی و عورفی و بەڵكوو بە هێزی باسك و ئەسلەحە ڕاگری حقوقی خەڵك بە تایبەتی دانیشتوانی مهاباد بوون و كاریان هەر قەزاوەت بووە. گەلێ جار وابووە كە لە لایەن عەشایری دەوروبەری و یا حكوومەتی هەندەران لە مهاباد هەڕەشە كراوە وەلێ ئەم خانەوادە هەنگاوی پیاوەتییان هەڵێناوە و مهابادیان لە پەلاماری دوژمنان پەنا داوە.

مەرحوومی سەیف لە خزمەت مەلا شەفیع و مەلا حەسەن كوڕی قزڵجی و مەلا ساڵحی سەردەراباتی علوومی مەعقوول و مەنقوولی خوێندووە و پاش تەواوبوونی خوێندن بە قەزاوەت خەریك دەبوو. زۆر و ستەمی ملۆزم و بلەوەزەكانی دەگەڵ نەتەوەی كورد دا بە چاوی خۆی دیوە و لە جەرگ و هەناوی كاری كردووە، جا دڵی كوڵیوە و بێ خاوەنی و پەرێشانی و بڵاویەتی و سەركزی و هەژاری كوردەكانی لە ئەشعاری میللی خۆیدا نواندووە.

سەیفولقوزات لە كوتنی ئەشعاری كوردی و فارسیدا زۆر ماهیر بوو. بە تینی ئەشعاری میللی خۆی دڵی نیشتمان پەرەستانی وەكوڵ دەهێنا، پیاوێكی زیرەك و تێگەیشتوو و زانا و نیشتمانپەروەر بوو، لە كن هەموو سینفێك موحتەرەم و خۆشەویست تەماشا دەكرا، تەواوی تەمەنی خۆی بە شەڕافەت و نیشتمان پەرەستی ڕابورد تا لە ڕۆژئاوای حەوتەمی ڕێبەندان (بەهەمەن)ی ١٣٢٣ی شەمسی موتابیقی

١٢ی سەفەری ١٣٦٤ی قەمەری لە تەمەنی هەفتاساڵیدا دنیای ویداع کردو کەس‌وکار و نیشتمانپەروەرەکانی بە یێکجاری خەمناك کرد.

لە وەختێکدا کە ئاڵمانی نازی لە خاکی ڕووسییەی شوورەوی دەرکرابوو و ڕۆژبەڕۆژ مەملەکەتە داگیرکراوەکانی ئورووپایان لە چەنگ دێنانە دەرێ و پشتاوپشت بۆ بێرلین دەکشانەوە مەحروومی سەیف ئەم بەستە شێعرانەی کە لە ژێرەوە دێنە بەرچاو لە دەی ڕەمەزانی ١٣٦٣ی قەمەریدا بە زمانی بەڕۆژوو و بە نەخۆشی لەبابەت ڕووسەکان و ئەحواڵی کوردەکان و ستەمی بلەوەزەکان هەڵبەستووە کە وێدەچێ ئاخرین بەستە شێعرێك بێت کە ئەو مەرحوومە لە عومری خۆیدا فەرموویەتی:

سەرچاوە: گۆواری کوردستان ژمارەی ٣ (خالە لێوەی ١٣٢٥ هەتاوی) و ژمارەی ٤ (بانەمەڕی ١٣٢٥ی هەتاوی).

## پێنجەم
## ڕەحیمی قازی کوڕی سەیف ئاوا لەسەر باوکی دەنووسێ

((ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات (سەیفی قازی) مامی میرزا محەمەد [پێشەوا قازی محەمەد]، دەورێکی زۆری لە پەروەردەی سیاسی و ناسیاوبوونی ئەو لەگەڵ بیرو بۆچوونی نیشتمانپەروەرانە و پێشکەوتووی سەردەمی خۆی بینیوە. سەیف- شاعیرێکی شۆڕشگێڕ و یەك لە زانایانی ناوداری سەردەم بوو. سەیف بە زمانگەلی کوردی، فارسی و عەرەبی شێعرێکی زۆری هۆندەوە و لە هەموو ئێراندا کەسێکی ناسراو بووە؛ لە مێژووی ئەدەبی کوردیشدا بە "پیرەمێردی موکوریان" ناوی دەرکردووە.

وەك لە سەرەتادا گوترا، دوابەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی [١٩١٤-١٩١٨] ، بە تایبەت دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبر لە ڕووسیا [١٩١٧]، لە هەموو بەشەکانی کوردستان ڕاپەڕینی چەکدارانەی لەیەکتر دابڕاو دەستی پێ‌کرد. ئەودەم لە ئازەربایجانی باشوور [ئازەربایجانی ئێران]یش بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی نەتەوایەتی پەرەی سەندو حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان بە ڕێبەرایەتیی شێخ

محەمەدی خیابانی دامەزرا. ئەو بزووتنەوەیە سەرنجی خەباتکاران و ئازادیخوازانی کوردیشی بەرەو خۆی ڕاکێشا. هاوکات لەگەڵ دامەزرانی حیزبی دێموکراتی ئازەربایجان، لە ساڵی ١٩٢٠دا لە کوردستانیش سەیفولقوزات و تاقمێکی دیکەی ڕووناکبیر و خەباتکاری کورد حیزبی "محەمەدی"یان بنیات نا. میرزا محەمەد و زۆربەی فەقێکانی سابڵاغ بوون بە ئەندامی گرینگی حیزبەکە (بەداخەوە سەبارەت بە مێژووی خەباتی ئەم حیزبە هیچ بەڵگەیەکی نووسراو بە دەستەوە نییە. نووسەر). نموونەی بەرچاوی هاوکاریی خەباتکارانی کورد لەگەڵ دێموکراتەکانی ئازەربایجان، بریتییە لە بڵاوبوونەوەی شێعرەکانی سەیف لە چاپەمەنییەکانی حیزبی دێموکراتدا لە تەورێز.

دەکرێ بڵێین سەیفولقوزات یەکەم شاعیرە لە هەموو ئێراندا کە بە هۆندنەوەی شێعری ڕازاوە و بە ناوەرۆکی سیاسی و شۆرشگێرانە، لە گرینگایەتی بزووتنەوەی دێموکراتەکانی ئازەربایجان دواوە و نرخی گەورە و پڕ بایەخی داوەتە شۆڕشی مەزنی سۆسیالیستی لە ڕووسیا. شێعرەکانی سەیف لە زۆر ژمارەی گۆڤاری "ئازادیستان"دا کە ڕاگەیێنەری ڕوانگەی حیزبی دێموکراتی شێخ محەمەدی خیابانی بوو، بڵاو بووەتەوە. یەك لە شێعرە ڕازاوەکانی سەیف شێعری "قیام تبریز" (ڕاپەڕینی تەورێز)ـە کە لە ساڵی ١٩٢٠دا هۆندوویەتەوە و لە ژمارەی سێهەمی گۆڤاری "ئازادیستان"دا چاپ بووە. [١]. ئەو شێعرە و هەروەها هۆنراوەیەکی دیکەی سەیف کە دواتر دەیبینین، لە مێژووی ئەدەبی پێشڕەوی سەرەتای سەدەی بیستەمی فارسیدا– چ لە باری فۆرم و چ لە باری ناوەرۆکی سیاسییەوە شوێنی تایبەت و نرخێکی بەرزیان هەیە و زانایان و توێژەرانێك کە سەبارەت بە ڕەواجی بیری پێشڕەو و دێموکراتیك لە ئێرانی ئەو دەم لێکۆڵینەوەیان کردووە، ئەم شێعرانەی سەیفیان وەك نموونە لە هەڵسەنگاندنەکانی خۆیاندا هێناوە و بایەخی زۆریان پێ داوە.

**قیام تبریز**

شد ساحت تبریز یکی طرفه بهشتی

از سعی تنی چند

اهلش شده یکسر همه افرشته سرشتی

از نطق یکی چند

بیدار شده یکسره از خواب جهالت

با فکر و تامل

افتاده پی علم چه مسجد چه کنشتی

با قصد و تامل

آزاد شوای فکر ! باین مرحله روکن

با دست تجدد

از صحن بهاری بستان این گل و بوکن

با جمع و تجدد

در سایهء این علم شد آزادی ملت

ترتیب چنان است

زان، راه توان برد به آبادی ملکت

مقصود همان است

مانع نبود در پی عشاق پی وصل

ای مرگ ! فداتم

سردادن اول قدم مرحله خوکن

کاین است حیاتم

زان پس دیگر همسایه بما کار ندارد [٢]

خود در سر کاریم

چون بر کمر خویش زده دامن همت

نه مست و خماریم

پارچە شێعرێکی دیکەی سەیفیش هەیە کە نووسەر لەم دەستنووسەی خۆی کە لەم کتێبەدا کلێشە کراوە (مەبەست، کتێبەکەی دوکتور ڕەحیمی قازییە کە ئەم وتارە بەشێکی هەر ئەو کتێبەیە) و ڕێکەوتی نووسینەکەی وەك ٢١ی سەرەتانی ساڵی ١٣٢٨ دەستنیشان کراوە، بۆ چاپ لە گۆڤاری "ئازادیستان"دا هۆنراوەتەوە، ئەم شێعرە گەلێك سەرنجڕاکێش و گرینگە و شاعیر (لەوێدا) زیاتری باسی خەباتی گەلەکەی و پێشوازیی لە ئازادی کردووە کە هەمان سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبرە و تێیدا مزگێنی (ئەو سەرکەوتنەی) بە هەموو جیهان داوە.

ئەوەش دەقی شێعرەکەیە:

اسیر و بستهء آنزلف تار بر تارم
غلام و کشتهء آنچشم مست و بیمارم
فدای آنقد رعنای سرو آزادت
فدای منطق شیرین لب گهربارم
بیا بخانهء ما ای عروس آزادی !
زغیر گشته مخلا، نشسته، بیدارم
بخانهای که نه جهل است و نه نفاق و نه بیم
محبت است و صداقت، پراست ز اسرارم
ز انقلاب، لبالب زاتحاد و صفا
برابریست و اخوت، نه راه اغیارم
ز خون پاك شهیدان در اوست نقش و نگار
ز موی ماه جبینان رفته بردارم
پی وصال رخت سالهاست میگشتم
نه کوه ماند، نه صحرا، نه شهر و بازارم
برفته مکنت و در سر نیم هوای جاه
نه بیم قصد هلاك و نه فکر آزارم
دگر چه میطلبی بعدازاین ز عاشق زار
علاقەمند ز رویت حجاب بردارم [٣]

لەم شێعرانەوە بۆمان دەردەکەوێ کە سەیفولقوزات خاوەنی بیرێکی قووڵ بووەو باش ئاگاداری ئاکامەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبر بۆگەلان و میللەتانی ستەم لێکراو، بە تایبەت گەلی کورد بووەو گەلی ئێران بەرەو خەباتی ڕێگەی ئازادی وەدەست هێنانی سەربەخۆیی بانگ دەکا. ئەم شێعرانە لە باری فەلسەفەی ڕێئالیستییەوە گەلێك گرینگن و سەیف وەکوو فەیلەسووفێکی شارەزا و واقعبین دەردەخا.

حیزبی محەمەدی لایەنگری خەباتی سیستماتیکی سیاسی و پێوەندگرتنی قووڵی نێوان بزووتنەوەی جیاوازی بەشە لێکدابڕاوەکانی کوردستان بوو. لەو سەردەمەدا خەباتی گەلی کورد لە عێراق بە ڕێبەرایەتی شێخ مەحموود، گەیشتبووە

لووتکەی خۆی. لە کوردستانی ئێرانیش شۆڕشێکی چەکدارانە لەژێر سەرکردایەتیی سمایل ئاغای سمکۆ- سەرۆک هۆزی شکاك دەستی پێکردبوو. وەدەست هێنانی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان، دروشمی هاوبەشی هەر دوو بزووتنەوەکە بوو، بەڵام لە عەینی کاتدا جیاوازییەکی زۆریشیان لە ناودا هەبوو.

ڕێبەرایەتیی حیزبی محەمەدی- کە زۆربەیان ڕووناکبیر بوون، هەوڵیان دەدا پێوەندی و نزیکایەتی لە نێوان ڕاپەڕینی سمکۆ و بزووتنەوەکەی کوردستانی عیراق بە ڕێبەرایەتی شێخ مەحموود دروست بکەن و یەکیەتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوایەتی کوردستان دابین بکەن. بەو ئامانجەش بوو کە ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات وەك نوێنەری حیزب چوو بۆلای سمکۆ و وتووێژی لەگەڵ کرد.

سەیف کە هەوڵی دەدا ڕاپەڕینی چەکدارانەی سمکۆ بە ڕێبازێکی ڕاستدا بڕوا، دوای گەڕانەوەی لە (ورمێوە) بۆ سابلاغ، لە ڕێگەی سەقز و بانەوە چوو بۆ سلێمانی بۆ لای شێخ مەحموود و لەگەڵ ئەودا وتووێژی کرد. بەداخەوە سەبارەت بەو سەفەرە و وتووێژی نێوان شێخ مەحموود و سەیف هیچ بەڵگەیەکی نووسراو بە دەستەوە نییە کە لێرەدا باسی لێوە بکەین. [٤] بەڵام، لە ڕەوەتی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە وا دەردەکەوێ کە حیزبی محەمەدی پلانێکی بۆ یەکخستنی هێزەکانی شێخ مەحموود و سمکۆ دارشتبوو کە پێکەوە بۆ ئازادکردنی بەشەکانی دیکەی کوردستان تێبکۆشن. لە ئەنجامی چالاکی و هەوڵەکانی حیزبی محەمەدیدا بوو، کە چاوپێکەوتن و وتووێژی نێوان شێخ مەحموود و سمکۆ پێك هات. سمکۆ لە ڕۆژی ٢٣ی فێورییەی ساڵی ١٩٢٣دا بۆ وتووێژ چوو بۆ سلێمانی پێتەختی کوردستان. بە گوێرەی نووسینی ڕەفیق حیلمی، ((ڕۆژی سەفەری سمکۆ بۆ سلێمانی بە جێژنی نەتەوایەتی ناو نرا)).[٥]

لە ساڵی ١٩٢٠ [=١٢٩٩]دا دەوڵەتی تاران هەرەسی هێنا و ڕەزاخان حکوومەتی گرتە دەست. لە ساڵی ١٩٢٣ ڕەزا خان بۆ دابینکردنی دەستەڵاتی حکوومەتی ناوەندی بەسەر کوردستاندا، سوپایەکی زۆری بە ڕێبەرایەتی "عەبدوڵا خانی ئەمیر تەهماسبی" ناردە ناوچەکە و پێش هەموو شت مهابادیان داگیر کرد. لەم سەردەمەدا، حیزبی محەمەدی چالاکی ئاشکرای خۆی گۆڕی و کردیە چالاکی نهێنی، بە تایبەت دانیشتنی نهێنی لە ناو فەقێکاندا پێك دەهات و لە شوێنی جیاجیای کوردستان

کاروباری تەبلیغاتییان دەکرد. لەم سەردەمەدا، بنەماڵەی قازی، بە تایبەت سەیف و میرزا محەمەد، لە ڕێگەی ڕەواج دان و پەرەپێدانی فەرهەنگ و زانست و تەبلیغات بۆ بیروبۆچوونی نیشتمانپەرستانە، خزمەتیان بە خەڵك دەکرد. ڕێبەرانی حکوومەتیش لە تاران، نفووز و خۆشەویست بوونی بنەماڵەی قازی لەناو خەڵکی کوردستانیان دەگرتە بەرچاو و بە ڕواڵەت لەگەڵیان دەسازان و ڕێزیان دەگرتن. کاروباری پەروەردەی [بەشێك] لە کوردستان بەدەست ئەوانەوە بوو. سەیفولقوزات لە نێوان سالانی ١٩٢٢ و ١٩٢٦ [= ١٣٠١ و ١٣٠٥] سەرۆکی دایرەی مەعاریفی مەهاباد و گەورەترین خزمەتی بریتی بوو لە دامەزراندنی قوتابخانەی کوڕانەی "سەعادەت" کە بووە هۆی ناودەرکردنی زۆری سەیف. لە قوتابخانەکەدا میرزا محەمەد وانەی مێژوو و زمانی دەگوتەوە.

دەوڵەتی ناوەندی، بۆ ڕاکێشانی بنەماڵەی قازی بەرەو خۆی، سەیفی کردە کاندیدای نوێنەرایەتی پارلمان، بەلام بە کردەوە نەیانهێشت هەڵبژێردرێ. ئینجا بەڵێنیان پێدا کاروباری عەدلییە و دادپەروەری پێ بسپێرن، بەلام وەفایان بەو بەڵێنەش نەکرد. سەیفولقوزات لە شێعرێکی فارسی خۆیدا، کە ئەو دەم ڕوو لە سەرانی دەوڵەتی ئێران هۆندوویەتەوە، ئاماژە بەو مەسەلەیە دەکا و دەڵێ:

((گر نمیکردی وکیلم، یا به صلحیه رئیس،

بیرق شهرت به هردو از چه رو افراشتی))[٦]

لە پەراوێزی ئەو قەسیدەیەدا سەیف ئەم ڕستانەشی نووسیوە: ((بە بەڵێن و پەیمانی ڕاشکاو، دوای ئەوەی پێنج کەس خاوەن ڕێز وەك وەزیری عەدلییە، منیان بۆ چوونە ناو ڕێکخراوی عەدلییە لە تاران چاوەڕوان هێشتەوە، ... پەیمانی خۆیان بەجێ نەهێنا..))[٧]

... سەیف و میرزا محەمەد هاوڕێ لەگەڵ چالاکی نواندن لەپێناو پەرەپێدانی فەرهەنگ و بیری نیشتمانپەرستانە لە نێو لاوانی کورد، بێوچان لە بیری ئەو ڕووداوانەشدا بوون کە لە کوردستانی تورکییەدا ڕادەبرا. ئەو دەم بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی نەتەوایەتی لە کوردستانی تورکییە بە ڕێبەریی شێخ سەعید و دوکتور فوئاد لەگەڵ هەنگاوی دڕندانەی سەرانی کۆماری تازە دامەزراوی تورکییە کە ئیدی لە ڕێبازی ڕاستی شۆڕش دوور کەوتبووەوە، ڕووبەڕوو ببووەوە [ئەو کارەساتە

وەحشییانە و ناجوانمێرانەی وا ڕێبەرانی تورکییە لە کوردستان خوڵقاندبوویان، دڵی ئەو نیشتمانپەروەرانەشی بریندار دەکرد، بەتایبەتی لەسێدارەدانی ڕێبەرانی بزووتنەوەکە شێخ سەعید و دوکتور فوئاد و ... کە سەرێکی گەورە بوو بۆ هەموو خەباتکارانی کورد و لەوانە، سەیف و میرزا محەمەد]. سەیف لە لووتکەی دەستەڵاتی ڕەزاخاندا، شیعرێکی ڕازاوە و پڕ واتای نەتەوایەتی سەبارەت بە ژیانی گەلی کورد و ڕێبازی شەهیدانی کوردستانی تورکییە بە زمانی کوردی هۆندەوە. لەو سەردەمەی دیکتاتۆرییەتی ڕەزاخانیدا، هەر چەشنە بزووتنەوەیەکی پێشکەوتنخواز و بە تایبەت هەر بزووتنەیەك کە نیشاندەری ئازادی و سەربەخۆیی خوازی بوایە، بە شێوەیەك لە شێوەکان باسی مافی نەتەوایەتی گەلی کوردی بهێنایەتە ئاراوە، دەبووە هۆی خولقانی دڕندانەترین کارەسات. ئەودەم خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی بە (تاوان) دەزانرا. میرزا محەمەد ئەو شێعرەی وەك سروودی نەتەوایەتی فێری لاوان دەکرد و واتای بۆ لێك دەدانەوە. لە ناوچەی موکریان کەمتر خوێندەوار و ڕووناکبیرێك هەبوو ئەو شێعرەی لەبەر نەبوایە، بەڵام کەمتر کەس دەیزانی شێعرەکە سەیف گوتوویەتی. ئەوەش دەقی شێعرەکەیە:

((کوردینە ! تاکەی ئێمە لە کێوان میسالی دێو،

دێینوو دەچین و بۆمەنەبێ قەت خودان و خێو ؟ ))... [٨]

... لەساڵی ١٩٣١ [ی زایینی]دا قازی عەلی وەفاتی کردو سەیفولقوزاتی قازی بە قازی موکریان داندرا. بەڵام ئەو، لەبەر ئەوەی ماڵی لە گوند بوو و دەستی کردبوو بە کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەکی بەربڵاو، دەستی لە قەزاوەت کێشاوە و میرزا محەمەد بە مەقامی قەزاوەتی موکریان گەیشت و لەوکاتەوە ئیتر بە "قازی محەمەد" ناوی دەرکرد. ڕەسم وابوو، کە شا خۆی دەبوایە حوکمی قەزاوەت دەر بکا، بەڵام لەبەر ئەوەی فەرماندەی سوپای ئێران لە ورمێ "ژەنەڕاڵ شاهبەختی" کە لە عەینی کاتدا فەرماندەری سوپای ئێران لە مەهابادیش بوو، بەوە ڕازی نەبوو کە کاروباری قەزاوەت بدرێتە دەست قازی محەمەد، [هەوڵی] بەرگری لە کارەکە کرد. ناوبراو لە ڕاپۆرتێکی خۆیدا بۆ ڕەزاشای نووسیبوو کە: ((قازی محەمەد و سەدرولئیسلامی برای مەترسییەکی گەورەن بۆ حکوومەتی ناوەندی لەبەر ئەو هۆیە، سەلاح نییە حوکمی قەزاوەتی بۆ دەربچێ.)) [٩]

پەراوێزەکانی ئەو بەشە لە نووسێنی دوکتور ڕەحیمی قازی سەبارەت بە سەیف

١- گۆڤاری "ئازادیستان"، ئۆرگانی ڕێکخراوەی لاوانی حیزبی دێموکراتی ئازەربایجان بوو، لە لاپەڕەی ٤٢ی [ژمارە ٣] گۆڤارەکەدا ئەم ڕستانەی خوارەوە لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە نووسراوە: ((ئاغای میرزا ئەبولحەسەنی سەیفولقوزاتی موکری- کە خوێنەرەوان ڕێز لە مرخی شاعیریی ئەو دەگرن، چەند پارچە شێعری خۆی بۆ گۆڤاری ئازادیستان ناردووە، بەڵام بەهۆی تەنگەبەریی لاپەڕەکانەوە یەك پارچە شێعری لێ بڵاو دەکەینەوە)).

٢- لێرەدا مەبەستی شاعیر لە "هەمسایە" [واتە هاوسێ]، وڵاتی ڕووسیایە، کە لەوێ شۆڕشی مەزنی ئۆکتۆبر سەرکەوتبوو و دەوڵەتی جەوانی سۆڤییەت لەژێر ڕێبەرایەتی لێنیندا، هەنگاوی بە سوودی لە پێناو یەکپارچەیی و سەربەخۆیی ئێران هەڵهێنابووەوە.

٣- لە هەمان لاپەڕەی دەستنووسی سەیفولقوزاتدا، ئەم دوو فەردەش هاتووە:

بیا توای گل خندان ! کە سالهاو زمان

من از پی تو بکوە و بدشت و گلش و باغ

کنون زموی تو بویی دهد "بهارستان"

کە میرسد اثراتش بە هر مشام و دماغ

نووسەر لە ژێر ئەم دوو فەردە دانووسیویەتی: ((بیستو شەشی شەوال، ژمارەی سێهەم، بە قەڵەمی ئەبولحەسەن)).

[مەبەست لە بەهارستان، مەجلیسی شووڕای میللی ئێرانە کە لە مەیدانی بەهارستانی شاری تاران هەڵکەوتبوو]

٤- شەرحی ئەو سەفەرەم لە باوکم بیستووە. لە پەراوێزی پارچە شێعرێکیدا بە ناوی: ((ئەورۆ حەسەن موئەزینی کوردانە بانگ دەدا..)) کە بە زمانی کوردی هۆندوویەتەوە و دەستنووسەکەشی لەبەر دەستدایە و سەبارەت بە جووڵانەوەکانی سمکۆیە، نووسیویە کە ((سمکۆ بەرەو ڕەواندز لە کوردستانی عێراق چوو)).

٥- ڕەفیق حیلمی، "یادداشت"، بەرگی ٦، لاپەڕەی ٥٧٤.

٦- لە دەستنووسی شێعرەکانی سەیف وەرگیراوە.

٧- هەمان.

٨- [لـە نووسـینەکەی دوکتـور ڕەحیمـی قازیـدا سـەرجەم ٢٢ فـەردی ئـەم پارچـە شـێعرە هـاتووە، کـە لێرەدا بـە پێویـست نەزانـدرا دووپاتـە بکرێتـەوە. خوێنـەرەوە دەتوانێ شێعرەکە لە بەشی "شێعرەکان"ی ئەم کتێبەدا بخوێنێتەوە. ئەنوەر]

٩- لەو بیرەوەییانەی بابم بۆی گێڕاومەتەوە.

ئـەوەی لـەم، بەشـەدا هـات هەڵبژاردەیـەك بـوو لـە کتێبـی ((قـازی محەمـەد و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوایەتیی گەلی کورد)) نووسینی دوکتور ڕەحیمی قازی. نووسەر کتێبەکەی هەم بە کوردی و هەم بە فارسی نووسیوە. ئەو کتێبە لە ساڵی ١٩٨٦دا ئامادە کراوەو تا ئێستا هەروەکوو دەستخەت ماوەتەوە و چاپ نەکراوە. ئەم هەڵبژاردەیـەی ئێرەش دەقـی ١٠ لاپـەڕەی دەستنووسـە فارسییەکە و لەبەر ئـەوەی دەستخەتە کوردییەکە لەبەردەستدا نەبوو لە فارسییەوە وەرگێڕدراوەتە سەر کوردی.

حەسەنی قازی لەو باوەڕەدایە زانیاری لـە مەڕ (حیزبی محەمـەدی) بە ئیحتیاتـە وەربگیرێ. ئەگـەر چی کریس کۆچێرا نووسـەری فەڕانسەیی و کـەریمی حیسامیش باسی ئەو حیزبەیان کردووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توێژینـەوەی زیاتر لـەو بارەیـەوە لەوانەیە لایەنی زیاتری ئەو بابەتە ڕوونتر کاتـەوە. بەڵام نەبوونی سەرچاوە بە تـەنیا بەس نییە بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕووداوێك ئەویش لە کوردستان- کە تۆماری ڕێکوپێك بۆ کەمتر کارو چالاکی خەڵك بە دەستەوەیە و ڕووداوەکان تـەنیا لـە بیرەوەری چەند شاهیددا دەمێننەوە. دیارە مۆرکی پەسـەند کاتێك لـەو بۆچوونە دەدرێ کـە بەڵگـەی زیاتری لەسەر بدۆزرێتەوە.

باشـترین سەرچاوە کـە بتوانـێ یارمـەتی ئـەم کـارە بـدا، وا هەیـە بەڵگەنامـەکانی وەزارەتـی کاروبـاری دەرەوەی ڕووسـیا و بـەریتانیا بـێ. هـەروەها ڕۆژنامـەکانی ئـەو ساڵەی ئێران [١٢٩٩=١٩٢٠] دوور نییە هـەواڵی دامـەزرانی حیزبەکەیان ڕاگەیاندبێ، مـن دڵنیـام ڕووداوێکـی ئـەوتۆ، ئەگـەر ڕووی دابـێ، بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان ڕەنگدانەوەی لە هەواڵەکانی ئەو سەردەمەدا هەبووە. هەواڵێکی ئەوتۆ بۆ بـاوەڕکردن دەبـێ، لەبـەر ئـەوەی یەکـەم، هەواڵدەرەکـەی کـوڕی سـەیف و ئاگـاداری ژیـان و چالاکییەکان بووە، دووهەم، دانانی حیزبێکی ئەوتۆ لەلایەن سەیفەوە جێگەی بڕوایە، سـەیف کەسـایەتییەکی سیاسـی بـووە و دوای دامـەزرانی حیزبـی دیمـۆکرات لـە ئازەربایجان، دوور نییە ئەویش ویستبێتی کارێکی هام شێوە لـە موکریـان بکـا، بەڵام

پێگەی کۆمەڵایەتی ئەو وەك خاوەن موڵك و مەلا، دەکرێ بەرەو لایەنی ئایینیشی ڕاکێشابێ بەتایبەت کە لە نزیك و تەنانەت لەناو ئازەربایجانییەکاندا ژیاوە. حیزبی "محەمەدی" بۆ ئەوە دەبوو سەرنجی کۆمەڵانی ئازەربایجانی دەورو بەریش ڕابکێشێ. لە بیرمان نەچێ ماوەیەك درەنگتر بیری "حزب الله" لە لایەن ئایەتوڵای مەردووخی کوردستانیشەوە هاتبوە ئاراوە و لە هێندێك نووسراوە و کتێبی ئەودا ڕەنگی دابووەوە، بەڵام هەموو لەسەر کاغەز مایەوە و نموودی بە کردەوەی پەیدا نەکرد. بە گوێرەی بۆچوونی مەردووخ دەبوایە شیعە و سوننە جیاوازییەکانی نێوانیان بخەنە لاوە و لەناو حیزبێکدا بە ناوی "الله" کۆ ببنەوە و چالاکی بکەن.

هەرچۆنێك بێ ڕاستەقینە ئەوەیە سەیف لەو ساڵانەدا چالاکییەکی زۆری نواندووە و هەردوو کێشەی نوێنەرایەتی مەجلیس و دامەزران لە عەدلییە، کە دوکتور ڕەحیمی قازی باسیان لێوە دەکا، ڕاستن؛ کە وابوو دەکرێ مەسەلەی حیزبەکەش ڕاست بێ، بەڵام بەداخەوە نووسەر ناوی هیچ ئەندام یا ڕێبەرێکی دیکە جگە لە سەیف ناباو تەنیا باس لە فەقێی مزگەوتەکان دەکا کە ناوێکی گشتییەو یارمەتییەکی ئەوتۆ ناکا بە ڕوون بوونەوەی زیاتری بابەتەکە.

### شەشەم
### ئەحمەدی قازی (١)
### بەرژەوەندی شوێنەوارو ژیانی "سیف القضات"

خوالێخۆشبوو ئەبولحەسەنی سەیفی قازی کە بە "سەیفولقوزات" نێو دەبردرێ کوڕی خوالێخۆشبوو میرزا قاسمو لە تایفەی قازیە کە لە بنەماڵە ماقووڵەکانی شاری سابلاغن، "سەیفولقوزات" لە زانیاری عەرەبیو فارسیو کوردیو تورکیدا مامۆستا بووەو بەو زبانانە شێعری بەنرخو نەزمی زۆرە. سەیف ماڵی لە دێی "گوێگجەلی" بووەو پتری عومری خۆی لەوێ بەسەربردووە. لە کارو کاسپیو باغ چەقاندندا پیاوێکی شارەزاو بە سەلیقە بووەو زۆری لە میوانداریو پیاوەتی کە یەکێ لە ئەرکە جوانەکانی گەلی کوردە خۆش هاتووە هەر لەبەر ئەوە بووە کە هەمیشە دەوروبەری پڕ بووە لە پیاوە ماقووڵەکانی کوردستانو خەڵکی هاتووچۆو دۆستایەتی ئەویان بە

شانازییەوە قبوڵ دەکرد، سەیف لە دەورانی ژیانیدا پیاوێکی نێو بەدەرەوەو کارپێکراو بووە لە کوردستانو تەنانەت تارانیشدا کاروباری گەلی جێبەجێ دەکردو لە کن حکومەت زۆر بە قەدرو حورمەت بووە.

لەوێژەی کوردیدا "سەیفولقوزات" شاعیرێکی بەنرخەو بەڕاستی هەڵبەستەکانی تەرووپڕ و ئاودارن. وەکوو سەیف توانیویەتی لە عۆدەی هەڵبەستی بەرز و ساکارو جوان بێتە دەرێ، هیچ شاعیرێك نەیتوانیوە، ئەو شاعیرە توانایە شارەزاییەکی تایبەتی هەیە دە بەکارهێنانی وشەی کرمانجیی موکریدا، سەیف بە زمانی لادێیەکانو دانیشتووە زەحمەتکێشەکانی دەشتو کێوی کوردستان هەڵبەستی گوتووەو هەر ئەوە بۆتە هۆی دەرچوونی نێوی ئەو شاعیرە لەسەر هەموو وڵاتی موکریدا، باس کردنی مەڕو ماڵات، کیژو کوڕ، چیا و ڕاز، چادرو چیغ، بەرد، سەرما، بووزوو، کەپەنك، پووز و بەلەك، پشتێن شل و ول، گێرەو کێشە، کە هەمووی تایبەتی ژیانی کرمانجێتین بەڕاستی هەر لە "سیف القضات " جوانەو دەو مەیدانەدا هەر ئەو توانیویە ئەسپی خۆی بە چاکی لینگ بدا:

((دەردی دڵ دەکەم کورتو کرمانجی
حەسەن کرمانجە، چی لە دیلمانجی!))

"سەیفولقوزات" زۆر بە دڵسۆزییەوە کوردەکان وریا ئەکاتەوە کە بۆ زانستو هەڵبەستو سنعەت تێبکۆشنو لەپێناوی گەلدا لە هیچ کۆسپو پێش هاتێك نەترسێن، سەیف بۆ وەدەست هێنانی ماڤ لەدەسچوو داوا دەکا کە هەموو کەس کوڕانە تێبکۆشێ وە بەفێربونی زانستو خوێندنو ڕەچاوکردنی کارو سنعات نێوی گەلو نیشتمانی بەرز بکاتەوە وەکوو دەڵێ:

((سەرچوونی تەخت ڕۆینی سەرداری پێ دەوێ
خۆشیمە لەو شەهادەتی شێخانە نێوبەنێو))

سەرچاوە: حەسەنی قازی، "دیوانی سەیفولقوزات"، دەستنووسی چاپنەکراو، دەوروبەری ١٩٦٨.

## حەوتەم

## ئەحمەدی قازی(٢)

## "سیف القضات" کێیە؟

"سەیفولقوزات" یەکێکە لە شاعیرە هەرە گەورەکانی کورد کە بە داخەوە بەهۆی بڵاونەبوونەوەی سەرگوریشتەو هەڵبەستەکانی، ئەو جۆرە کە شانی هەڵدەگرێ نەناسراوە، بە تایبەتی لاوەکانمان هەر ڕەنگە ناویشیان نەبیستبێ!

ناساندنی شاعیر، یا هونەرمەند بە نووسینی کورتە سەرەتایەك دابین ناکرێ. دەزانین کە لە هەندەران بۆ ناساندنی کەسێکی لەو چەشنە، سەتان کۆڕو شەوی شێعرو بیرەوەری ساڵ بە ساڵ بەهۆی لەدایکبوونیو هەزار شتی وا پێك دێنن. لە زۆر وڵاتاندا زۆر زانای بەناوبانگ تەواوی عومرو تواناو هۆشو بیریان بۆ ناساندنی شاعیرێك، فیلسووفێك یا نەقاشێك تەرخان دەکەن. دەبیسینو دەخوێنینەوە کە فلانکەس "مەولەوی ناسە". "حافز ناسە" یا "شێکسپیر ناسە"، ئەو "ناسەرانە" دەیان کتێبو سیپارەو وتاری ڕادیۆییو تەلەفزیۆنی دەربارەی "ناسیاوە" کەی خۆیان بڵاودەکەنەوە هێشتاش لایان وایە ئەوەی کوتوویانە قەترە بە دەریایەو بۆ ناساندنی "ناسیاوەکەیان" داوای یارمەتی لە هەموو جیهان دەکەن.

دیارە من ئەو دەسەڵاتەم نییە، بەڵام دیسانیش دەمەویست لە زۆر کەسان داوای هاوکاری بکەم. بەداخەوە دەستم بە مامۆستا هێمن ڕانەگەیشت کە دەزانم سەیف ناسێکی باشەو زۆرم دەربارەی سەیف لێبیستووە. مامۆستا هەژار بە نووسینی سەرەتایەك منەت باری کردمو لێرەدا داوا لە هەموو زانایانی هاووڵاتی دەکەم ئەوەی دەربارەی سەیف دەیزانن و پێیان وایە دە دیوانەکەدا نییە بۆم بنێرن تا لە چاپی دواییدا کەڵکیان لێوەربگیرێ.

بەڵام با بگەڕێمەوە سەر باسەکەی خۆمانو بزانین سەیف کێیە؟

ناوی حەسەن بوو، لە هەشتەمی [حەوتەمی] بانەمەڕی ساڵی ١٢٥٥ی هەتاویدا لەشاری سابڵاغ (مەهابادی ئەوڕۆ) لەدایك بوو. میرزا قاسمی قازی باوکی حەسەن، پیاوێکی زاناو پێشەوای ئایینی ناوچەو قازی شار بوو. ماڵی دایمو دەرهەم پڕ لە میوان بوو. مەحکەمەش جێگای ڕاگەیشتن بە گیروگرفتی ژیانی کۆمەڵایەتیو داوەریو حوکم دانو لەهەمان کاتا پێگەی پیاوی زاناو مەلای دوازدە عیلمو تەفسیرو

لێکدانەوەی نووسراوەو کوتراوەی پێشینیان بوو. حەسەن دە ماڵێکی ئاوادا گەورە بوو. دنیای دەوروبەری پڕ لە باس و خەبەرو هاتن و چوون و جموجۆڵ بوو. مەحکەمە بۆ ئەولاوە بەهەستە مەدرەسەیەکی گەورە بوو. لێرەدا بوو کە باس و هەواڵی نیشتمان و جیهانی دەگەڵ سەرگوریشتەی پیاوی گەورەو ڕووداوە گرینگەکانی بە گوێ دەگەیشت. مەحکەمەکە بە ڕۆژ جێگای داوەری و حوکم دان بوو، بە شەو، دەبۆ کۆڕی ئەدیبان و زانایان و شاعیرانی موکریان. شێعرێن، ڕقەی خەت خۆشی، خوێندنەوەی شێعری جوان، لێکدانەوەی ئەدەبی و سیاسی، باسی بەسەرهاتی پیاوی گەورە، زەمینەی گەشە کردنی هەستی شاعیرانەی حەسەنیان پێکهێنا. کاتێك ئەولاوە مەحکەمەی بۆ خوێندن و فەقێیەتی بە جێهێشت، لاوێکی وریاو چاو کراوەو زانا بوو و هەستی شاعیرانە دە لەش و گیانیدا ڕەگ ئاژۆی کردبوو. حەسەن زانستی "مەعقول و مەنقول" و زبانی عەرەبی لە خزمەت مەلا شەفیع لە عەنبار "گوندێك لەنزیك بۆکان)و مەلا حەسەنی قزڵجی بۆکانی و مەلا ساڵحی سەدراباتی و مەلای سلەمانکەندی تا پلەی مەلایەتی خوێندو پاش ماوەیەك مانەوە لە مەهاباد ماڵی خۆی بردە گوندی "گوێجگەلی" کە مەڵبەندێکی خۆش ئاوو هەوایە لەسەر چۆمی جەخەتوو لە نزیك میاندواو. باقی تەمەنی ئەم پیاوە گەورە لەو گوندە تێپەڕبوو، تا لە ڕۆژی حەوتەمی ڕێبەندانی ساڵی ١٣٢٣ی هەتاویدا کۆچی دوایی کردو لە خانەقای شێخی بورهانی بە خاك ئەسپێردرا.

ژیانی تایبەتی:

"سەیفولقوزات" پیاوێکی بە مشوورو کارلێهاتوو دەکاری کشتوکاڵ و ئاژەڵداریدا بێ وێنە بوو. گوندەکەی بە باغ و مەزرا و مێشەو چنارستان و بەند وئاش و خانووبەرەی خۆش و دڵگر ڕازاندبۆوەو بەهەشتێکی شاعیرانەی بۆ خۆی پێکهێنا بوو. بە هاتووچۆی تاران و تەورێزو ورمێ و شارەکانی دیکەی ئێران تێگەیشتبوو کە هۆی پێشکەوتوویی و دەوڵەمەندی وڵاتی عەجەموستان، کارو زەحمەتکێشان و هاوکاری و نەوەستانە. لەو لاشەوە، کەمتەرخەمی و ناکۆکی و تاڵان و بڕۆو دوژمنایەتی عێڵ و عەشیرەتە کوردەکان بۆتە هۆی دواکەوتوویی وێرانی و برسییەتی لە کوردستانا. لە زۆربەی شێعرەکانیا سەرنجمان بۆ ئەو مەبەستانە ڕادەکێشێ:

چون دوژمنین دەگەڵ یەك و نیمانە "اتحاد"
ڕامان دەدەن بە جارێ لە هەورازی بۆ نشێو
فکرێ لە حاڵی خۆ کەن و بگرین بە حاڵی خۆ!
هەر بێ سەری و عەداوەتی خۆتانە دێتە ڕێو
ڕەشماڵە ماڵ و کەشك و پەنیرە مەتاعی مە
قەسرو سەرایی خەڵکی دییە پڕ لە زێڕو زێو

لە جێگایەکی ترا گەل دەداتە بەر سەرکۆنەو تەوس و پلارو دەڵێ:

شەماڵ و زریان دایم شەڕیانە
ئاغاوەت شڕن کرمانج قڕیانە
کرمانج دەوڵەتی پڕو پاتاڵ بوو
کۆچی دێ بە دێ بە مانگ و ساڵ بوو
ئەویش لە دەس چوو، هێندە کۆچ مەکەن!
کای سەرو نوێ کەن جووتی زۆر بکەن!
باغان دابێنن، داران بنێژن!
نەجیب و عەسڵن، کۆن و لەمێژن
تاکەی لە دەرکان کزو بڵاو بین
بێ مەزن و گەورەو سەر بێ کڵاو بین؟

کارو زەحمەت و ڕانەوەستان و نەوەستان دروشمی ژیانی "سەیفولقوزات" بوون. ماڵێکی ئاوەدان و پڕ لە ئام و شۆی نان و سفرە ڕەنگینی پێکەوە نابوو. ماڵی دایم پڕ بوو لە میوانی ڕەنگاوڕەنگ و دیواخانی جێگای حەسانەوەی ڕێبواری ماندوو بوو. دەوهام وشۆیانەدا بوو کە دەگەڵ عەزیز ئاغای عەبباسی تێك هەڵەنگوتن و هەر لە یەکەم چاوپێکەوتندا وەك دوو دڵدار کە بۆ ماوەیەکی درێژ یەکتریان ون کردبێ بە یەك گەیشتنەوەو ئیتر تا دوا هەناسەی ژیان ساتێك بێ یەکتریان هەڵ نەدەکرد. پێوەندیی ئەو دوو پیاوە دەمانخاتەوە یادی مەولانای ڕۆمی و شەمسی تەورێزی. هەر کە عەزیز ئاغا درەنگ سەری لە سەیف دابا یا نامەی بۆ نەناردبایە، سەیفی سەوداسەر ئاگری دەکەوتە دڵ و دەروونی و هاواری لێ بڵیند دەبوو:

زۆر تولی کێشا عەزیزا! هیجرانت
لالْ بم نابینم مەیلی جارانت
چ قەوما ئەوسالْ لەبەرچاو کەوتم
چلۆنت دلْ هات لە دڵت دەرکردم
سالآن هەر مانگیْ: مایەی حەیاتم!
یا تۆ دەهاتی یا من دەهاتم
شەوانم شینو گریەو ڕۆ ڕۆیە
ژیربوونی ڕۆژیم بە بۆنەی تۆیە
هیلالی ئەبرۆت چونکە نەبینرا
جێژنمان تێك چوو ڕۆژو نەگیرا
لە چاوەنۆڕیت عەیشم نەماوە
هەر لەحزێك حەسەن سەت جار کوژراوە
دیسان لە سەرەتای هەڵبەستێکدا دەڵێ:
دەردی بێ دەرمان هەر دووری تۆیە!
بە بایەك دەمرم، دەژیم بەو بۆیە
هێندەم تەماشای ڕێی هاتنت کرد
چاو خێل بوو لەسەر سەربانو سەرگرد
ژیان بەبۆنەی عەزیزم خۆشە
هەر کەس تۆی نەویْ بێ هۆشو گۆشە

بێگومان جوانترین هەڵبەستەکانی "سەیفولقوزات" هەر ئەوانەن کە بە نامە بۆ عەزیز ئاغای نووسیون. دە هەر کام لەو هەڵبەستانەدا خۆشەویستیو شەیدایی بە تەوژمو شەپۆل هەڵدەڕژێو من لام وایە ئەگەر ئەو دۆستایەتییە قووڵە نەبوایە، سەیف شاعیر نەدەبوو ئەگەر شاعیریش بوایە، سەیف نەدەبوو!

**مریدایەتیو دەروێشی:**

سەیف لە خزمەت حەزرەتی "شێخ شمس الدین یۆسف بورهانی" کەسبی فەیزو بەرەکەتی دەکرد. هەموو ساڵێك بۆ ماوەیەك خۆی گەیاندۆتە خانەقای شەرەفکەندو ژیانێکی پڕ لە چلەکێشیو عیبادەتی ڕادەبوارد. خانەقا بۆ ئەو شاعیرە

سەودا سەرە ڕووگەی هیواو هومێدو جێگای (١) خۆڵماڵ کردنی گیان‌و لابردنی ژەنگ‌و ژاری دڵ بوو. لێرەدا دڵ دەبێتە ئاوێنەی بێ غەورو غەش کە نووری ئیمان‌و خودای دەروێشان خۆی تێدا دەنوێنێ. لە نامەیەکدا بۆ عەزیز ئاغا دەنووسێ:

ئەگەر دەتەوێ دنیاو قیامەت،
ڕووی خۆت لەو دەرکە قەت وەرمەگێڕە!
هەر کەس دەپەنای شێخی دانەبێ
حیزی نەفسیە شەیتان پێی فێرە
هاتنی ئەو دەرکەت قەت لە دەس مەدە
سەرو ماڵی خۆت بێرە بسپێرە!
نێوی شەمسەددین ڕۆژە، کە هەڵدێ
هەروەك چەکچەکی هەڵدێ ئەو کوێرە

دیسان دە یەکێك لە نامەکانیدا باسی شێخ دەکاو دەڵێ:

هەر کەس بە تەمای دین‌و دنیا بێ
دەبێ لەو دەرکە خاکی درگا بێ
قیبلەیە بۆمە زۆر لە مێژ ساڵە
ڕووی لێ وەرگێڕین نوێژمان بەتاڵە
دڵ وەك ئاوێنە جەلای هەڵدێنێ
ژەنگی گوناه و ژاری نامێنێ
جێگاو خانەقای شەمسی بورهانە
شەیتان وەك شێتان لێی سەرگەردانە

لە غەزەلێکی ناسك‌و دەروێشانەدا کوتوویە:

یۆسفی میسری ویلایەت ئەی خەلیلی باغی قودس
ناری نمروودە، دەروون بێ تۆ، دوچاوم بوونە گۆم
بۆ تەوافی کەعبەیی کۆی شەمسی دینە وا حەسەن!
هەروەکوو مەزڕەق بە هەر مەرز و دیارێ خول دەخۆم

**نیشتمانپەروەری:**

سەدەی بیستەم، دەورەی ڕاپەڕینی گەلانی زۆر لێکراوی جیهان و خەبات بۆ ڕزگاربوونە. گەلی کوردیش دەو سەدەیەدا بە دەیان جار بۆ ڕزگاربوون لە ستەم و ژێردەستی ڕاپەڕیوەو هەر جارە لە گۆشەیەکی کوردستان دەنگی ئازادیخوازیو دژایەتی دەگەڵ دیکتاتۆرو ملهوڕان بەرز دەبێتەوە. شێخ عوبەیدیللا ڕادەپەڕێو تەختی ناسرەدین شا دەخاتە لەرزە. شێخ سەلامی بارزانی، شێخ سەعید، ودکتر فواد لە دژی ترکی عوسمانی چەك هەڵدەگرن. شێخ مەحمودی سولەیمانیو مەلا مستەفای بارزانی لە عیراق ئاڵای کورد بەرز دەکەنەوە. سمایل ئاغای سمکۆ ڕژێمی پەهلەوی دەخاتە تەنگو چەڵەمەو کۆماری مەهاباد نێوی کورد زیندوو دەکاتەوە. ئاگری ڕاپەڕین ناکوژێتەڕەو هەر کاتە لەلایەك هەڵدایسێتەوە. "سەیفولقوزات" دە ڕۆژگارێکی ئاوادا ژیاوەو پێوەندی دەگەڵ زۆربەی ئەو بزووتنەوانەش بووە. دە زۆربەی شێعرەکانی خۆیدا باسی "مافی گەل" دەکاو لاوان هان دەدا بڕۆنە مەیدان.

ئازایی، سەربەخۆیی، میریو گەورەیی
داوا بکەن بە زار و زمانو ددانو لێو
گوردانی کوردەکان! بەخودا ڕۆژی غیرەتە
دەس دەینە خەنجەران و پیاوانە بێینە نێو

لە جێگایەکدا ڕەخنە لە ڕژێمی پەهلەوی دەگرێو لە دەس هەڵداشتنو تەبعیدو دوورخستنەوەی کوردان هاوار دەکا:

بۆچی زبانی دایکی لە ئێمە مەنع کرا؟
بۆ هێندە زوڵمو زەحمەتو فەرقو جودائییە؟
یا دەرکراوی مەوتەنە یا حەبسی بێ گوناه
کوردێکی مەزنو عاقڵو مەردی حیسابییە
خۆ کوردو فارس هەردو برای دایكو بابێکن
وەك یەك نەبێ لە بەرچی بەشو نانو ئاوییە؟

**زبانو کەرەسەی شێعرەکانی:**

سەیف وەك لە شێعرو هەڵبەستەکانی ڕا دەرئەکەوێ لە ئەدەبیاتی فارسیو عەرەبیدا زۆر شارەزاو بە دەسەڵات بووە. زبانی ترکیشی باش زانیوە چونکە بە

قەولّی خۆی "سزنکی و بزمکی" قەت لە مالّی نەبڕاوەو تێکەلاّویی دەگەلّ ترک زبانان زۆر بووە. بەو سێ زبانەش شێعری کوتووە کە بەداخەوە هەموویانم بۆ کۆ نەکرانەوە، تا دەم دیوانەدا بلاّویان بکەمەوە. ئەم هۆنەرە بەپێچەوانەی نالی و میسباح و وەفایی و زاناکانی پێش خۆی زۆر تێکۆشاوە لە دە کارهێنانی واژەی عەرەبی خۆ بپارێزێ و زبانێکی کوردی پاك و خاوێن بۆ دەربڕینی هەست و بیری شاعیرانەی خۆی بدۆزێتەوە. لە غەزەلەکانیدا هەر چەن ویستوویە لە عەرەبی دوور کەوێتەوە بەلاّم لە فارسی نزیك دەبێتەوەو لە زۆر جێگایاندا واژە و "هەودای" (١) فارسی دە کاردێنێ وەك: بخصوص، حسرت دە، عروس، چاە زنخدان، نورستە، عشوە آموز، سرنگون، سخندان و هەروەها زۆر شتی دیکەش.

بەلاّم لە سەرەتای دیوانەکەی ڕا هەتاکوو دوایین شێعری هەست بەوە دەکرێ کە سەیف ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر تێکۆشاوە واژەو هەودای کوردی ڕەسەن تر بۆ زبانی هەلّبەست وەدەس بخا و خۆی لە زبانە بێگانەکان دوور کاتەوە. کاتێك دەگاتە هەلّبەستەکانی کە بە زبانی دێهاتی ناوچەی مەحالّی مەجید خان بۆ عەزیز ئاغای نووسیون، ئەوجار زبانی ڕاستینی(٢) خۆی دەس دەکەوێ و نیازی بە فارسی و ترکی و عەرەبی نامێنێ و ئەو "لیباسە" قورس و گران و نالەبارەی لەبەر هەلّبەستەکانی دادەڕنێ و بە جلوبەرگی جوان و ڕەنگاوڕەنگی کوردی دەیان ڕازێنێتەوە. زبانی کرمانجەتی یا دێهاتی، ئەویش ئەو زبانە شیرن و ناسکەی کە لە ناوچەی بۆکان و دەرووبەری میاندواو پەرەی گرتووە، دەبێتە ئەسپێکی بە کۆڕژن و حیلەو سەیف دەکاتە شاسواری مەیدانی وێژەوانی و هونەر. لەوە پاش سەیف مامۆستای هەموو شاعیرانی هاوچەرخ و پاش خۆیەتی. هەلّبەستەکانی دەبنە بەرمووری بە قیمەت و بێ هاوتای واژەی ڕەسەن و لێك ولوس و ڕێك و پێکی زبانی کوردی. بۆ یەکەمجار بۆ هەموو وێژەوان و هونەرمەندێك دەرئەکەوێ کە هەلّبەستی کوردی دەبێ بە کەرەسەو "داوو هەودای" کوردی بهۆندرێتەوە تا جوان و لەبەر دلاّن بێ.

شاعیران و نووسەران لە موکریان بە خوێندنەوەی شێعرە ساکارەکانی سەیف ئەو جار تێدەکۆشن، نووسراوەو کوتراوەی خۆیان لە وشەو داوو هەودای ڕەق و تەق و ڕەزاگرانی عەرەبی و ترکی دابێژن، بەڕاستی زبانی هەلّبەستەکانی دوایی سەیف

زێوی قاڵ کراوە. ئاوی زوڵاڵی کانیاوی کوردستانەو کار دەکاتە سەر شوێن و ئاکاری توێژی هونەرو نووسەرانی داهاتوو. مامۆستای بەناوبانگ و کوردیزان و شاعیری گەورەی زەمانی ئێمە هێمن زۆر جاران لەلای من دەری بڕیوە: ((خوا هەڵناگرێ ئێمە کوردی لەو فێربووین)).

پاش دیتنەوەی ئەو زبانە جوانە، سیف القضات خۆشی دەزانێ کە سەرکەوتوویی و دەسەڵاتی لە شێعردا لە سایەی زبانی پاک و ڕەسەنی ئەو دێهاتیە دڵ پاک و کۆن و نەجیبانەیەو هەر بۆیەش کوتوویەتی:

قسەی خۆم دەکەم کورت و کرمانجی

حەسەن کرمانجە، چی لە دیلمانجی!

قازی- ئەحمەد

پووشپەڕی ١٣٦١

تاران

سەرچاوە: دیوانی سیف القضات، گردەوەکۆیی- قازی ئەحمەد، چاپی یەکەم، ١٣٦١ (١٩٨٢)، چاپخانە سبز، تاران، لل١٣-٢٠.

## هەشتەم

## هەژار موکریانی

## من سەیفم چۆن دیوە؟

نازانم لە ئێوەی بەڕێز کێ خانەقای شەرەفکەندی وەکوو من دیتوومە، دیوەو تیا ژیاوە. بە دەردی مام هێمن فەرمووی: "وەکوو گەمیەی عەزرەتی نوح لە هەموو دەستەو تاقم و توخم و تۆمەی تێدا کۆمە". لە بۆرە پیاو، لە خاوەن ناو، کاڵ و کوڵاو، خڕو بڵاو، گشتەک و خاو، نەزان، زانا، بێ هێز، توانا، سەید، ئۆمی، خەڵکی وشکارۆ وگوێ چۆمی. ئیتر سەرتان نەهێشێنم هەر کەسێکتان لە مەڵبەندی موکوریانداو لە موکوریان ئەولاتریش بوێ کە چاوتان پێ بکەوێ، وەرنە ئەوێ، خەمتان نەوێ تووشتان ئەوێ وە تووشییەوە. جا، یان هەر نیشتەجێی ئەوێن، یان بۆ زیارەت و متفەرک دێن و چەندێک دەمێننەوە.

هێمن و من، دوو منداڵی کرچ و کاڵی لەڕو قرخن، بە تەمەن دە دوازدە ساڵ، بووین. لە خانەقا گەیبووینە یەک. ناخێری گیانمان بخوێنین. خوێندنی چی؟ دووی گێل و حوڵی بەربلاو، لەیەك دەمدا لای دوو مامۆستا دامەزرێین، یەکی ڕیش پان، لە عارەبی شارەزایەو خەتی نییە. یەکی گردەڵ، فارسی زانەو خەتی خۆشە. جاوەرە شەق و دار بخۆ! خۆ جنێو هەر باسی ناکرێ.

سوێندی کەسم لەسەر نییە. ئەگەر بڵێم تلێاتی تەریش فێر نەبووین، نیسکێك درۆی تێدا نییە- ماڵم هەقە، لە ترێ دزینی ناو ڕەزی، لە پللار دە داران گرتن، لە ڕاوی دووپشك و ئەسپێ و کێچ و جوجەو قوڕ شێلان و هێلکە لە هێلان دەرهێنان هیچ کەس تۆزی نەدەشکاندین، بۆ نەگبەتی هێمن وە شێعر هاتبوو، هەروا گارەگاری دەهات. جاروبارە شێعرێکی نیوە ولۆڵەی خواری لاپانی دا دەنا. بە فیزەوە شانی دەدام. یانیها بمناسە من چیم! منی کلۆڵ نەم دەتوانی مێعریش بکەم! چ جای شێعر! هونەرم هەر ئەوەندە بوو شێعری خەڵکم بە ڕەوانی لەبەر دەکرد. پێم دەزانی کامە لەنگەو لە کامیان قافیە لاسەنگە. هێمنیش بڕوای کردبوو کە من لەو بارەوە وەستام. شێعری خۆی بۆ دەخوێندمەوەو دەیگوت چۆنە؟ جاروبارە دەم کوت باشەو زۆر جاریش گاڵتەم پێ دەکرد.

ڕۆژێك پارچە هەڵبەستێکی فارسی هێنا، گوتی بۆ ئەمە دەڵێی چی؟ گوتم ئەم تاك بەیتەی خۆتەو ئەو چوارانەش هین شاعیرێکی زۆر بەرزە، لێت دزیوەو شڕەکەی خۆت تێ ئاخنیوە تا نەیناسم!

بە سەرسوڕمانەوە گوتی «سوبحانەڵلا!» زۆر شتێکی عەجایبە. خۆ تۆ کەراماتت نییە چۆنت زانی؟

منیش پفم بە خۆدا کرد: چۆن نازانم؟ زۆر زیرەکم و لەوەش سەیرتر دەزانم. مەسەلەکە زۆر هاسان بوو، شێعری فارسی لەنگ و لۆری بەچکە کوردێکی مێرمنداڵ، بخزێنرێتە لۆچی شێعری حەوسەد ساڵەی "ابن یمین" ناسینەوەی زۆری زیرەکی پێ ناوێ!

ئیتر خودا وەت حەسێنێ. هێمن ئەو موعجیزەی منی بە سەت قلْف و قەرازەو درۆی زلەوە لۆ هەموو کەس دەگێڕاوە. ناوبانگم لە خانەقادا بەیەکەم شێعرناس دەرچوو.

جارێك پیاوێكی زۆر ماقووڵ هاته زیارەتی خەناقا. کەوای شۆڕی مەلایانەی دەبەر دابوو. مێزەرەکەی ئاخوندانە لەدەوری سەر هەڵپێچابوو، عەبایەکی سورمەیی بەسەر شانەوە، قوڵە گۆچانێکی جوانی حەیزەرانی بەدەستەوە. تا خوا حەز کا جوان و بەسەرو سیما بوو. پێیان دەگوت "سەیفولقوزات".

جووتەیْ شڕوڵ، خۆشی خۆشیمان وێکەوت. ئۆخەی ئەوا نەمردین و ئەو شاعیرەی شێعرەکانیمان پێ خۆشەو لە بەرمانە، خۆشیمان دیت!

ئێمەی بێنموود و تیتاڵ، لە ئەقڵ و تەمەندا منداڵ، هەر دە خەونیشمان نەدەهات لە مەجلیسی پیاوی وا خاوەن پایەدا ڕێمان بدرێ- ئاخ بریا بیدواندینایە! خوداو ڕاستان فشەفش و شات و شووتی مام هێمن کارێکی کردبوو. بەو ئاواتەشمان گەیشتین!

سەیف پرسیبووی: کێ لێرە شاعیرە. یان شێعر دۆستە؟ گوتبوویان مینە چلمنی شێخەلیسلام خۆی لێکردووینە شاعیرو، ڕەحمان تەرەغەییش هەیە پەڵخوڕی شاعیرانی تر کاوێژ دەکا! فەرموبووی هەردووکم بۆ بانگ کەن با بیانبینم.

لەنزیك خۆیەوە داینایین، تەواو ڕووی خۆشی نیشان داین. هێمنی دواند. گوێی بۆ نموونەی شێعری گرت. فەرمووی «تۆ تەبعت مەوزونە لە دوا ڕۆژدا دەبیە شاعیر». ڕوی کردە من: «کوڕی مەلا کام شێعری منت لە بەرە؟»، «قوربان! ساڵی قڕانەکە». «بۆمی وە خوێنە». خوێندمەوە. لە چەند شوێنێك گێڕامیەوە. خۆی خوێندیەوەو گوتی «فێربە شێعر وەك من بخوێنەوە». لەسەری ڕۆیشت و فەرمووی: «کەم کەس هەیە کە شێعرم دەخوێنێتەوە قەڵسم نەکا. بەڵام تۆ ئیجازەت هەیە شێعرەکانم بخوێنیەوە باریکەڵا!»

ئای لەو خۆشیە! ئەوپەڕی مایەی شانازیم بە نسیب بوو. عەرزم کرد شێعرێکت هەیە حەز دەکەم خۆت بیفەرمووی و بینووسمەوە. فەرمووی کامە؟ لە دوای تۆزێك مینگە مینگ و سەر خوراندن گوتم: شێعری "هەڵێ مەڵێ" زۆر پێکەنی، فەرمووی «سەیرە لەو غەزەلە نازدارەدا هەر هەڵێ مەڵێت لە بیربێ».

ئەگەر بە ڕواڵەت و دیمەن هەر ئەوەندە بە زیارەتی سەرفیراز بووم. بەڵام هەتا ناوی دەبرێ و تاباسی شێعری ئەو دەکرێ ئەو کۆڕەم دێتەوە بیرو خۆم بە بەختەوەر دەزانم.

نازانم خەڵك دەربارەی بەرهەمی سەیف دەڵێن چی. بەڵام من بەش بە حاڵی خۆم بڕوام وایە ئەگەر سەیف هەر تەنیا "ساڵی قڕان"ی نووسیبایەو هیچی ترنا، دەرگای هەرمان و نەمری وەك ئەدیبێكی گەورەی كورد بەڕوودا كراوەتەوەو لەلای شاعیرە مەزنەكان پاڵپشتی بۆ دانراوە.

هەژار
دووی پووشپەڕی ١٣٦١ [١٩٨٢]
كەرەج
سەرچاوە:
دیوانی سەیفولقوزات ، گردەوە كۆیی قازی ئەحمەد، چاپی یەكەم ١٣٦١ [١٩٨٢]، چاپخانە سبز، تاران، لل٢٠-١٢.

**نۆهەم**

**سەید عوبەیدیللا ئەیووبییان**

"سەیفولقوزات" چەن شێعرێكی دە پەسنی پێشەوای ئازا و گەرناسی كورد، سمایل ئاغای سمكۆدا كوتووە كە لەلایەن محەمەد جەمالەدین الحكاری (قازیو باوەڕپێكراوی سمكۆ) ڕا بۆ ڕۆژنامەی "كورد" لە ورمێ ناردراوەو بڵاوكراونەوە. شێعرەكان ئەوانەن:

((سمكۆی، خودا كە داوە بە مە، ساحیبو ڕەئیس
شوكری بكەین بە زارو زبانو ددانو لێو
مەقسودی وی ئەمە، كەهەقی مە، بداتە مە
تەكلیفی مەش وەهایە، فیدای بین بە نێر و مێو))

سەرچاوە:
دیوانی سیف القضات، گردەوەكۆیی- قازی ئەحمەد، چاپی یەكەم، ١٣٦١ (١٩٨٢)، چاپخانە سبز، تاران، لل٨١.

**دەیەم**

**دوکتور مەحەمەد ساڵحی ئیبراهیمی**

((هەندێك لە هەڵبەستەکانی سەیف ٦٢ساڵ لەمەوبەر لە ڕۆژنامەی "کورد"دا کە لەشاری ورمێ لە چاپخانەی "غیرەت" چاپ دەکرا بڵاوکراونەتەوە. ئەو ڕۆژنامەیە لە ژێر چاوەدێریی هۆزانی نەمر مامۆستا مەلا محەمەدی تورجانی زادەدا بڵاو دەبووە. گۆواری گرشەی کوردستان ژمارە ٩ (١٩٨١ میلادی) لاپەڕەکانی ٨ تا ١١ ئەو مەبەستەی باس کردووە)).

سەرچاوە:

دیوانی سیف القضات، گردەوەکۆیی- قازی ئەحمەد، چاپی یەکەم، ١٣٦١ (١٩٨٢)، چاپخانە سبز، تاران، ل٨١.

**یازدەهەم**

**هێمن موکریانی(١)**

**بیرەوەری**

((خانەقای [بورهانی] ئەو سەردەمە زۆر ئاوەدان بوو... دەتگوت کەشتی نووحە... پیاوی گەورەو زانا بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمی موکریان وەك مامۆستا فەوزی، سەیفی قازی، پێشەوا قازی محەمەد، حاجی مەلا محەمەدی شەرەفکەندی، عەلیخانی حەیدەری، بەتایبەت ئاغا خوێندەوارو زاناکانی فەیزوڵڵا بەگی هاتوچۆی خانەقایان دەکردو بە مانگ و دوو مانگ لە وێندەرێ دەمانەوە...))(ل٩)

سەرچاوە:

محەمەدئەمین شێخەلیسلامی (هێمن)، "تاریك و ڕوون"، بنکەی پێشەوا، چاپی ١٩٧٤، ل٩.

## دوازدەهەم

## هێمن موکریانی(٢)

## مامۆستای شاعیرانی موکریان

وەك ئاگام لێ بێ بەسەرهاتی ئەم شاعیرە مەزنە لەلایەن لاوێکی زاناو ئەدەبدۆستو لێزانەوە بە دوورو درێژی نووسراوەو شێعرەکانی بە وردی شی کراونەتەوەو نەخشی بەرچاوی ئەم گەورە پیاوە لە ئەدەبو سیاسەتی نیوەی یەکەمی چەرخی بیستەمدا، بەتەواوی ڕوون کراوەتەوە. با ئەم نووسراوەش جارێ چاپ نەکرابێو بڵاو نەبووبێتەوە. من لە خۆم ڕانەدی لەم بارەدا بۆ خاتری دوو شت چ بنووسم. یەك نەمویست ڕەنجی ئەو بەفیڕۆ بدەم، دوو، من لەو بابەتە نووسینەدا شارەزانیم. لەم بڕوایەدام هەر کارێك دەبێ پسپۆڕی خۆی بیکا.

هەتاو هەروا لە بن هەوردا نابێ، کورد هەروا بەبێ بەشیو چارەڕەشیو لێقەوماویی ناژی. ئەویش هەروا بە نەناسیاوی نامێنێتەوە ڕۆژێك هەر دێ دیوانو بەسەرهاتی چاپ بکرێو لەنێو نەتەوەکەیدا باشتر بناسرێو تەنانەت پەیکەریشی بۆ دروست بکرێ. هەر ئەوەندەم ویست چەند نموونە لە شێعرەکانی بخەمە پێش چاوی خوێنەران. بە شانازییەوە دەڵێم من بەمێر منداڵیو لاوەتی زۆر جار ئەم شاعیرە مەزنەم لە نزیکەوە دیوە. لە قسە خۆشو جوانو بەتامەکانی، لە شێعرە بەرزەکانی لە پەندو ئامۆژگارییە بەنرخو بەسوودو دڵسۆزییەکانی گەلێکم کەڵك وەرگرتووە.

بەش بە حاڵی خۆمو پێم واشە بە هەڵە نەچووم. ئەم شاعیرە بە مامۆستای شاعیرانی نیوەی یەکەمی ئەم چەرخەی کوردستانی ئێرانو بە تایبەتی مەڵبەندی موکریان دەزانم. شاعیرەکانی پێش ئێمەی موکریان وەك شێخ ئەحمەدی سریلاواو دوکتۆر شەرقیو خاڵەمینو سەید کامیل، ئەگەر نەشڵێین بیری نەتەوایەتی لەوی فێر بوون، دیارە ئوسلووبی لەکارهێنانی وشەی ڕەسەنی کوردیو زمانی شوانو سەپانو جووتیاریان لەوی وەرگرتووە. ئێمەش شاعیرەکانی پاش ئەوان وەك هەژارو عەتری گڵۆڵانیو هێمن پەیڕەوی ئەوانمان کردووەو دیارە شاعیرەکانی لاویش وەك سوارەو هاوارو مەحموودیو مەلا غەفوور، ئەم ڕێڕەوەیان بەر نەداوە.

ئەبولحەسەنی سەیفی قازی کوڕی میرزا قاسمی قازی براچووکەی [براگەورەی] میرزا فەتتاح و برای قازی عەلیو مامی پێشەوا قازی محەمەدی نەمرو سەدری قازی

شەهیدو باوکی حەمە حسێن خانی نەبەزو تێکۆشەر بوو. گەورە پیاوێکی زاناو ڕووناکبیرو خوێندەوارو کارامەو بە ئەزموونی موکریان بووە. زیاتر خەریکی کاری سیاسیو کۆمەڵایەتیو کشتوکاڵو ملکداری بوو. سۆفی و دڵتەڕ بوو. شاعیری پیشەی هەمیشەیی نەبوو. کەچی لە ڕیزی شاعیرە هەرە بەرزەکانی کورد دەژمێردرێ، جگە لە زەوقی شاعیری کۆمەڵناسو مێژووزان بوو.

لە شێعری دڵداریدا کە کەمی بەدەستەوە هەن، شاگردی قوتابخانەی شاعیری بێ وێنەی، پایەبەرزی، هەڵکەوتەی کورد (نالی) بووە. ئەگەرچی غەزەلە تەڕو پاراوەکانی ناگەنە غەزەلی نالی بەلام بەڕاشکاوی دەتوانم بڵێم شاگردێکی باشی ئەم قوتابخانەیەو زۆر کەمتر لە شاعیرەکانی دیکە لاسایی کردنەوەی لە شێعردا هەیە، پێشینیان گوتوویانە: "لە شێر ترسان عەیب نییە" شاگردی باشی نالی بوونیش پایەکی کەم نییە. نالی لەو ئەستێرە پرشنگدارانەیە کە هەر بەچەند چەرخ جارێك ئاسمانی ئەدەبی گەلێك ڕووناك دەکەنەوەو نموونەیان لەنێو هەموو گەلێکدا هەیە. مەرج نییە هەموو کەس وەك من بیر بکاتەوە. ئەمما منیش بۆم هەیە بڵێم هەر چەند پاش نالی گەلی ئێمە شاعیری زۆر بەرزی هەبوون. بەڵام هێشتا لەنێو کورددا شاعیرێك هەڵنەکەوتووە جێی نالی پڕ بکاتەوە، مەگەر دایکی نیشتمان لە دواڕۆژدا ڕۆڵەیەکی وا شیرینو نازدارو بلیمەتێکی وا گەورەو بێوێنە لە ئامێزی خۆیدا پەروەردە بکا. بەڵام شاگردی باشی نالی بوون هونەرە. سەیفیش بە شاگردێکی گەورەی نالی دەناسم کە قوتابخانەکەی بەهۆی حەریق لە موکریاندا بۆتە باو. سەیف هاودەمو دۆستو شاگردی حەریق بووە.

سەیفی قازی لە شێعری نیشتمانیو شۆڕشگێڕانەشدا یەکەم شاگردی قوتابخانەی شاعیری نەمر فەیلەسووفی زاناو ڕووناکبیری کورد حاجی قادری کۆیی بووە. لە مەڵبەندی موکریان شاعیرێك ناناسین پێش ئەو شێعری نیشتمانی، ئەویش ئەوەندە حەماسی دانابێ.

سەیفی قازی خۆی قوتابخانەیەکی نوێی لە ئەدەبی کوردیدا کردۆتەوە. بە یەکەم شاعیری کوردستانی دەناسین کە بای داوەتەوە سەر ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیو بەزمانی زەحمەتکێشانو ڕەنجبەرانی لادێ شێعری گوتووە. تێکۆشاوە تەعبیری ناسكو ڕەسەنی کوردانە لە شێعری ساکارو ڕەوانو جوانی خۆیدا

بگونجێنێ. وشەی پەتیو ڕەسەنی کوردی لە کاربێنێو زمانەکەمان بە چەشنێکی وەستایانەو شارەزایانە بژار بکاو وشەی بێگانەو نامۆی لێ دەرباوێژێو بەشایەدی هەموو زمانناسێك لەم کارە بەنرخ و بەکەلکەدا زۆر سەرکەوتووە.

ئەم شاعیرە بەرزە بڕوای وابوو و بڕوایەکی ڕاستیش بوو، کە دەبێ وشەی پەتیو ڕەسەن لە دێو لە نەخوێندەوار فێربینو کێشی شێعر لە فۆلکلۆری کۆن وەرگرینو تەعبیرو ئەزموونی کوردانە بەکار بێنین، بەڵام دەیگوت ئەم وشە بێگانانەی لە کۆنەوە لە کوردیدا جێگای خۆیان گرتووەو نەخوێندەوار تێیان دەگا تازە بوونە کوردیو هەق نییە بیانگۆڕین یا وەدەریان نێین. ئەو دوژمنی بێ ئامانی وشە داتاشینی ناشیانە بوو و ئەو ناشیانەی لە خۆوە نەزانانە وشە دادەتاشن بە دوژمنی زمانی کوردی دەناسی. لەم ئاخرانەدا کە هێشتا مابوو وشە داتاشین ببووە باو. بۆ ئەوەی تووڕەی بکەی بەس بوو کە وشەیەکی داتاشراوی ناڕەسەنی نیشان بدەیو بۆ ئەوەی خەنی بکەی دیسان بەس بوو وشەیەکی ڕەسەنی کوردی بۆ بدۆزیەوە. تەنیا ڕەخنەیەکی لەباری زمانەوە لێی دەگیرێ ئەوەیە کە هەر لە لەهجەی موکریاندا زۆر شارەزا بوو و لەبەر نەبوونی قامووسێکی کوردی کەمتر ئاگای لە وشە جوانو ڕەسەنەکانی شێوەکانی دیکەی کوردی بوو.

قوتابخانەی سەیفی قازی لە کوردستانی ئێران بە تایبەتی لە موکریاندا شاعیری ئەوتۆی پێگەیاندن کە زۆریان بە مامۆستای گەورە ناسراونو لە مامۆستاکەیان تێپەڕاندووە. بەڵام هەقی مامۆستایی بەسەریانەوە هەیە، چونکە ئەگەر ئەو ئەم ڕێچکەی نەشکاندبا دیارە هەر لەسەر ڕێبازی وەفاییو ئەدەبو حەیدەریو ئەو جۆرە شاعیرانە دەڕۆیشتن کە لەباری زمانەوە پڕن لە وشەو تەعبیری بێگانە. دیارە کارم بە پلەو پایەی شاعیرانی هاوچەرخی ئەو نەداوە بەڵکو مەبەستم ئەوەیە ئەوان بۆ بووژاندنەوەی زمانەکەمان هەوڵێکی ئەوتۆیان نەداوە. بەڵام سەیفی قازی بەخۆیو شاگردەکانیەوە لە ژیاندنەوەو بووژاندنەوەی زمانی کوردیدا نەخشێکی دیارو بەرچاویان هەیە.

تا ڕادیۆ چەپەرەکانی کوردی بە وەرگێڕانی ناپوختو دزێو و وشە داتاشەکانی شارنشینو خۆپەرست، بەداتاشینی وشەی ناشیرینو نالەبارو ناڕەسەن زمانی کوردییان وا شپرێوو شپرزە نەکردبوو، قوتابخانەی سەیف خزمەتی بە کەلکی

بە زمانی کوردی کرد. ئێستاش لە موکریاندا شاعیرو نووسەری وا هەن ڕێبازی ئەویان هەر بەرنەداوەو پەرەیان پێداوە. ئەوەش چەند نموونە لە جۆرەکانی شێعری ئەم شاعیرە کە پێم وایە ناتەواوییان تێدا هەیە. بەڵام لە دووروڵات هەر ئەوەندەم بۆ پەیدا بوو بەهیوای ڕۆژێك کە دیوانی تەواوی چاپ بکرێ.

### کوردینە

کوردینە تاکەی ئێمە لە کێوان میسالی دێو؟
بێین و بچین و بۆ مە نەبێ قەت خودان و خێو
خەڵکی هەموو لەشارو لە باخانە کەیفخۆش
ئێمەش بڵاوو بێ سەرە ماوین لە دەشت و کێو
بۆ وانە هەرچی جوانە، لەجێ، دێ لە ژن، لە ماڵ
هەر شاخ و داخە بۆمە کوڕی ڕەش، کچی دزێو!
بۆ ئاسمان دەڕۆن و لە بەحرا دەکەن سەفەر
هەر هەردە نیشتەگاهی مە، سەنعاتە وەردو شێو
ڕەشماڵە ماڵ و کەشك و پەنیرە مەتاعی مە
قەسر و سەرای خەڵکی دیبە پڕ لە زێڕو زێو
هەر میللەتێك لەلاوە هەقی خۆی بەدەستەوە
کوردێك کە سەر هەڵێنێ دەڵێن بۆتە سەربزێو
بۆچمانە ماڵ و سەر کە لەسەر سەروەری نەچێ؟
کوڕ نابێ قەت بترسێ لە زیندان و دارو چێو
گوردانی کوردەکان! بەخودا ڕۆژی غیرەتە
دەستدەینە خەنجەران و پیاوانە بێینە نێو
سەرچوونی تەخت ڕۆینی سەرداری پێ دەوێ
خۆشیمە لەو شەهادەتی شێخانە نێو بەنێو
فیکرێ لە حاڵی خۆکەن و بگرین بە حاڵی خۆ!
شاهان بەمەحوی ئێمە دەبەستن گرێ و گرێو
ئەو ژینی بەو زەلالەتە بۆچیتە چاوەکەم؟
بمرین لە ڕێی نەجاتی وەتەن با بەنێرو مێو!

تاکەی لە باخی خەڵکی بەزیزیو بە ملکەچی؟
خۆشە لە باخی عێلی چنینی هەنارو سێو
هەرچی دەبێ بلا ببێ حەق هەر حەقە "حەسەن"!
نینە لە ڕێی وەتەن خەمی دەرکردنو جنێو

ئەمە نموونەی شێعری نیشتمانیو شۆڕشگێڕانەیەتی وا دیارە شینی بۆ شەهیدانی کوردستانی تورکیا گێڕاوە. جگە لەوەی زۆر پڕ سۆزە، زۆریش هاندەرە. ئاشکرایە وەك پیاوێکی سیاسیو پسپۆڕ لە گرێکوێرەی مەسەلەی کورد گەیشتووەو ئاگای لە فێڵو دەهۆی دوژمنان بووە، بەو حاڵەوە نەتەوەکەی بۆ خەبات هان داوە. ئامۆژگارییەکانی لە بنەماڵەی نیشتمانپەروەری خۆیدا پتر کاریگەر بووە. وەك دەزانن جگە لە دوو برازاو کوڕێك، چەند خزمی زۆر نزیکی لە عەشیرەتی بەگزادەی فەیزوڵلا بەگی لەپێناوی ڕزگاری کوردستاندا چوونە سەردارو بوونە قۆچی قوربانیی ئازادیی گەلی کورد. ئەمەش نموونە شێعری ئاشقانەو دڵداری سەیفەو دیار نییە کەی گوتراوە، شێعر ناس دەزانێ چەن وردەکاری شاعیرانەی تێدا بەکار هاتووەو وشەی چەن ڕەسەنو جوانی کوردی تێدایەو قافیەیەکی هەڵبژاردووە وەك قافیەی شێعرە نیشتمانییەکەی ڕەنگبێ پێش ئەو هیچ شاعیرێکی کورد خۆی لێ نەدابن.

## داوەڵی دڵ

دایم دڵم بە ناڵەو زارىو فیغان دەڵێ:
خۆش بەو شەوە کە ڕۆژی ڕوخی دڵبەرم هەڵێ!
زولفت وەلادە ڕووت بنوێنە بە دەفعەیە
شەو ڕابرێ، ستارە نەمێنێ، قەمەر هەڵێ
تفڵی دڵم گرووی شەکەری لێوی گرتووە
بەو دوو هەنارە ژێری کەوە بیخە باخەڵێ!
بەو زولفی میروەحەت مەکە مەنعم لە شەهدی لێو
تفڵێکە دڵ زەعیفە، دەترسێ لە داوەڵێ
ئەو قافیەت بەسانی دڵی موددەعی حەسەن
تەنگە، درەنگە، مەیلی بە جەنگە، هەڵێ! مەڵێ!

شاكاری هەرە بەناوبانگی سەیفی قازی بەڵكو یەكێك لە شاكارەكانی شیعری كوردی پارچە شیعری زستانە، بەشی زۆری كوردستان زۆزان و سارد و بەفرگرە، كەچی كەم شاعیری كورد دەناسین وەسفی زستانی كردبێ. مامۆستا لەم شیعرەدا تابلۆیەكی لە زستانو لە ژیانی لادێ نشینو ئاژەڵدارو زەحمەتكێشانی كورد كێشاوە كە بێگومان بێ وێنەیە. جگە لەوە بە زمانێكی سادەو ڕەوانو لادێیانە گوتراوەو فەرهەنگۆكێكە لە وشەی ڕەسەنو پاكی كوردی، پڕە لە ئامۆژگاریی سیاسیو كۆمەڵایەتیو تەنانەت ئابووری بۆ زەحمەتكێشانو دێنشینانی كورد. وردبوونەوە لەم شیعرە بۆمان ڕوون دەكاتەوە، شاعیر چەن ڕووناكبیرو ئازادیخوازو كۆمەڵناسو گەلپەروەر بووە. سەیر ئەوەیە سەیف خۆی لە چینی تەسەلو دەوڵەمەند بوو و لە كشتووكاڵ و مڵكداری و دارچەقاندن و ماڵ بەخێوكردندا ناوبانگی ئێستاش هەیەو شوێنەوارەكانی هەر ماون، كەچی دەبینین شارەزای ژیانی چینە هەرە هەژارەكانی ئەو سەردەمی كوردستان بووەو دڵی بۆیان سووتاوەو شینی دەگەڵ گێڕاون. ئەم شیعرە وەك بۆ خۆی ئیشارەی كردووە لە ساڵی ١٣١٢ی هەتاویدا گوتراوە كە زستانێكی زۆر درێژو سەختو قڕانێكی گەورە بووەو زۆر ماڵ لە ماڵ كەوتوونو زۆر دەوڵەمەند بێڵیان لە بن میچ چەقاندووە. شیعرەكەی وەك نامەیەك بۆ دۆستی خۆشەویستی عەزیز ئاغای عەبباسی كە ئەویش ئەهلی زەوقو حاڵو سۆفو دڵتەڕ بووە نووسیوە:

### زستان

عەزیز ئارەزووت زۆری بۆ هێنام
فرمێسكم سوور بوو زەردی ڕووی لێ‌نام
دیسان بە ئاوری دووریت كەوتمە گیر
دنیام لێ ساردبوو بوو بە زەمهەریر
تا ناهومێد بووم لە هاتنی زووت
جەرگم بوە پولوو هەناسەم بزووت
هەوا بۆ حاڵم وەك هەوران دەگری
بە تەرزەو بەفرو بارانو هەوری
هەردیش لە بۆ من هێندەی قوڕ پێوا

بەهاری دەگەڵ زستان لێ شێوا
گیاو گوڵی مێرگان بۆم سیس و زەرد بوون
بۆ شینی کێوان کەوان هاودەرد بوون
شینی بەهارە ئاسمان هەر دەگری
هەوریش ناڵە ناڵ ڕووی خۆی دەپچڕی
بزن و مەڕ ڕووتن وەك سوورە ساقە
یەك دانوو دەیکوشت یەك بەلەباقە(١)

سەرچاوە:

هەواری خاڵی سەرجەمی نووسینی هێمن، بەسەرپەرشتی: بەدران ئەحمەد وعوسمان دەشتی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٣٤-٣٩.

١) پاشماوەی شێعرەکەش لە (هەواری خاڵی)ی "هێمن"دا چاپ بووە، بەڵام لێرەدا بەپێویست نەزانرا سەر لە نوێ بڵاوبکرێتەوە. بڕوانە بەشی شێعرەکان بۆ سەرجەمی شێعرەکە.

سێزدەهەم

عەبدوڵا خانی ناهید [ئیفتیخار]

بیرەوەری

((باوکم گەلێك پێی خۆش بوو دەرس بخوێنم، بەڵام بەداخەوە کات و شوێن ئیجازەی پێ نەدەدا بە مەبەستی بگات... پاش ماوەیەك لەسەر داواکاریی میرزا حەسەنی سەیف، کە برای خوالێخۆشبوو قازی عەلییە، باوکم ئامادە بوو بۆ درێژەدان بە خوێندن بمنێرێتە سابڵاغ، خوالێخۆشبوو قازی عەلی و جەنابی سەیف هەردووکیان خزممان بوون واتە هەردووکیان زاوای ئێمە بوون و دوو کەس لە پوورەکانی من هاوسەری ئەوان بوون. خوالێخۆشبوو قازی[عەلی] لەو کەسانە بوو کە کەمتر هاوشێوەی پەیدا دەبێت... لە ڕادە بەدەر ڕۆشنبیرو ئەمڕۆیی و خاوەن تایبەتمەندیی باش بوو... ماوەی حەوت مانگ میوان و شاگردی ئەو بووم... لەگەڵ کوڕەکانی ئەو خوالێخۆشبووە، واتە جەنابی میرزا محەمەد، قازی ئێستای مەهاباد

[پێشەوا]و جەنابی میرزا ئەبولقاسمی سەدر، کە هەردووکیان پوورزای منو کەسانێکی ڕۆشنبیر بوون، چ ژیانێکی خۆشمان هەبوو...))(ل ٢٥)

سەرچاوە:

عبدالله ناهید (افتخار)یکی از رجال نامدار کردستان، "خاطرات من"، به اهتمام احمد قاضی، چاپ اول، ناشر: نفیسی فر، [تهران]، ١٣٦٢ [١٩٨٣]، ١٠٧ صفحه، فارسی.

**چواردەهەم**

**کەریمی حسامی**

**بیرەوەری**

... جا بەم حاڵە، زۆر جێگای داخە کە نووسەری کوردیش بێ لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی کاتو زەمان یا بۆ ئافەرینێکی دوژمن، ڕاپەڕینی سمکۆی سەردار بە "ڕێگریو ناڕەسەنو قسەی بێتام" دابنێو تاوانباریشی بکا!

نیشتمانپەروەری بەناوبانگو مامۆستای شاعیرانی موکریان، جەنابی "سەیف القضات" ئەودەم لە بەستە شێعری بەناوبانگی خۆیدا (کوردینە) کە بۆ ڕۆژنامەی "کورد"ی ناردووە دەڵێ:

((سمکۆی خودا کە داویە بە مەساحیبو ڕەئیس
شوکری بکەین بە زارو زبانو ددانو لێو
مەقسودی وی ئەمە، کە هەقی مە، بداتە مە
تەکلیفی مەش وەهایە، فیدای بین بە نێرو مێو)) (ل٨٢)

... حکومەتی ڕەزا شا نەیتوانی گیانی ئازادیخوازیو بیری نیشتمانپەروەری کوردایەتی لە جەستەو فیکری ڕووناکبیرانی نیشتمانپەروەری کورددا بمرێنێ. بیری ئازادیو ڕزگاری بە شێوەی جۆر بە جۆر لەو سەردەمە تاریکەدا لە بەرهەمی ڕووناکبیرانی کوردستاندا دەنگی داوەتەوە. لەنێو ڕووناکبیرانی ئەم بەشەی کوردستاندا شادرەوان حەسەن سەیفی قازی ناسراو بە "سیف القضاه" و مامۆستای شاعیرانی موکریان، لە بەستە شێعری "کوردینە"دا، زۆر بە ئاشکراو بە ئازایی،

بێبەشیو ژێردەستی کورد نیشان دەداو کوردەکان بۆ خەباتو بەربەرەکانی هان دەدا. شاعیر بێ خودانیو بێکەسی کورد لەگەڵ بارودۆخی باڵادەستەکانی کورد پێك دەگرێو دەڵێ:

((کوردینە! تا کەی ئێمە لە کێوان میسالی دێو؟
دێینو دەچینو بۆ مە نەبێ قەت خودانو خێو
ڕێی وانە کەهکەشانو ڕێی ئێمە بەردەڵان
جێی وانە تەختو بەختو جێی ئێمە بەردو چێو
ڕەشماڵە ماڵۆ کەشكو پەنیرە مەتاعی مە
قەسرو سەرایی خەڵکی دییە پڕ لە زێڕو زێو))

سەیفولقوزات هۆی ژێردەستیو کلۆڵی کورد دەست نیشان دەکاتو لۆمەیان دەکاو دەڵێ:

((چون دوژمنن دەگەڵ یەكو نیتانە یەکێتی
ڕاتان دەدەن بە جارێ لە هەورازی بۆ نشێو!
ژێردەستیو ئیتاعەتی بێگانە تا بە کەی؟
شەرمە لە بۆ مە هێندە بژین بێ نیشانو نێو))

سەیفی قازی لەو سەردەمە تاریکەدا کوردەکان هاندەدا بۆ تێکۆشانو دەڵێ:

((ئەو ژینە بەو زەلالەتە بۆ چیتە چاوەکەم؟
بمرین لە ڕێی نەجاتی وەتەن با بە نێرو مێو!
ئازادی سەربەخۆیی، میریو گەورەیی
داوا بکەن بە زارو زمانو ددانو لێو))

سەیفی قازی ساڵی ١٩٣٥ لە پارچە شێعرێکی دیکەدا ڕوو دەکاتە کوردەکانو دەڵێ:

((حەیفە میللەتێك شەش هەزار ساڵ بێ
نۆکەری ماڵان ڕووتو ڕەجاڵ بێ
نۆکەری ماڵان شەرمە لە بۆ مە
کۆڵان هەڵگرین بە کۆمە کۆمە
چیدی دوژمنان بە خۆ خۆش مەکەن!

بووزوو کەپەنك باڵا پۆش مەکەن!
تا کەی لە دەرکان کزو بڵاو بین؟
بێ مەزن و گەورەو سەر بێ کڵاو بین
هەر کەس ئارەزووی ماڵانی هەبێ
وەجاخی کوێر بێ، منداڵی نەبێ
ئەو بەد بەختییە لە کورد رووی دابوو
لەبەر نەخوێندن کۆزیان ساوا بوو
واجبە خوێندن بۆ دنیا و دینێ
پێغەمبەر فەرمووی بۆچوونی چینێ»(٢٥)

ئەگەر بە وردی شێعرەکانی سەیفی قازی بدرێنە بەر لێکۆڵینەوەی زانستی و بابەتیانە شی بکرێنەوە هەر ئەو رێبازە نیشان دەدەن کە ئەحمەدی خانی لە کوردستانی سەروو و حاجی قادر لە کوردستانی خواروو رچەیان شکاندووەو سەیفی قازیش لە کوردستانی رۆژهەڵات درنگتر نەیهێشتووە ئەم رچەیە کوێر بێتەوە، بە سەریدا رۆیشتووەو بە نەتەوەکەشی نیشان داوە. (لاپەرە ١٤٣-١٤١)

سەرچاوە: کەریمی حسامی، "پێداچوونەوە"، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٦.

## پازدەهەم
## خەلیلی فەتاحی قازی

ئێستاش بە کورتی باسی ژیانی کوڕانی میرزا قاسمی قازی کوڕی میرزا ئەحمەدی قازی دەکەم. کوڕانی خودالێخۆشبوو ناویان بەم شێوەیە بوو: ١) میرزا عەلی، ٢) ئەبولحەسەن کە لەقەبی سەیفولقوزات بوو، ٣) میرزا عەبدوڵا ناسراوە بە قازی عەسکەر، ٤) میرزا عەبدولرەحیم. (ل٣٧)

پێشکەوتنی دارایی خودالێخۆشبوو قازی عەلی و براکانی دوای سەرهەڵدانی ئەو قاتوقڕییە بوو، کە بە شوێن شەڕی یەکەمی جیهانیدا هات. قازی عەلی و براکانی: قازی عەسکەر و ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات لە گوندی "پیرۆلی باغی" دانەویڵەی چەندەها ساڵیان بەدەستەوە بوو و دوای ئەوەی کە نرخی غەلە بە

شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر گران بوو (ئەو دەم نرخی هەر کیلۆیەکی بوو بە ٧ قڕان و نیو)، ئەوان زۆربەی غەلەی ناو عەمبارەکانی خۆیان بە نرخێکی بەرز فرۆشت و لەو ڕێگایەوە بوون بە خاوەنی سەروەت و ماڵێکی زۆر. ئەوەش دەبێ بڵێم کە ئەگەر غەلەی خۆیان بە نرخێکی گران و بە نرخی ڕۆژ فرۆشت، بەشێکی زۆریشیان وەك خێرات و لە ڕێی خودادا بە خۆڕایی بە هەژاران بەخشی. خوداڵێخۆشبوو قازی عەلی فەرمانی دابوو هەموو ڕۆژێ نانێکی زۆر بکرێ و بە خێر بدرێ بە هەژاران. ئەو کارە چەند مانگی یەك لەدوای یەك درێژەی کێشا. هەرچۆنێك بێ، بەو پارەیە گوندەکانی دەلمە، گوێگجەلی ، موشێرابات، کانی کووزەڵە و عەولاباتیان کڕی.

خوداڵێخۆشبوو سەیفولقوزات لە کاتێکدا ئەو گوندانەی کڕی کە بەهۆی لێ نەزانی و عەییاشی و ڕابواردنی زیاد لە ئەندازەی خاوەنەکانی پێشوویان (میراتگرانی حوسێن بەگی سنجاق)ەوە وێران بووبوون و خەڵکیان تێدا نەمابوو. خوداڵێخۆشبوو سەیفولقوزات ئەو گوندانەی بە نرخێکی زۆر کەم کڕی و لەبەر لێهاتوویی و لێزانی ئاستی بەرزی لە کاری وەرزێریدا، لە ماوەیەکی کەمدا کردە بەهەشتی بەرین (ل٣٩ و ٤٠).

هەر بەو پارەیەی کە لە گوندی پیرۆلی باغی وەدەست هاتبوو سەیفولقوزات گوندی دەلمە و گوێگجەلی کڕی (ل٤٣)

میرزا خەلیلی فەتاحی لە کتێبەکەی خۆیدا سەبارەت بە سەیف درێژەی پێدەدا و دەنووسێ:

**ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات**

خواڵێخۆشبوو ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات برای بچووکی قازی عەلی بوو، مەعلووماتی بە قەد خواڵێخۆشبوو قازی عەلی نەبوو، بەڵام مونشی، ئەدیب و شاعیرێکی بەتوانا بوو. خواڵێخۆشبوو سەیفولقوزات لە تاقی لاوێنیدا لەگەڵ کاروباری سیاسیش سەروکاری هەبوو. لە سەروبەندی شێخ محەمەدی خیابانی ئازادیخوازی بەنێوبانگی تەورێزی، چالاکی سیاسی دەکردو سەرۆکی کۆمیتەی مەهاباد بوو. مەلا سەعیدی حاجی سەدرولعولەماو حاجی بایزاغاو براکەی عەلیاغای ئێلخانیزادە لەگەڵ هێندێك لە تاجرەکانی مەهاباد دەستەبەندییان بەدژی پێکهێنابوو هەمیشە لە ڕکەبەریو کێشەی باتنی دابوون. سەیفولقوزات ماوەیەکیش نوێنەری ئیدارەی

فەرهەنگی مەهاباد بوو (بە دوای ئەو ڕستەیەدا باوکم لێی زیاد کردووە: یەکەم کەسی کە لە مەهاباد پیشەی نوێنەرایەتی فەرهەنگی هەبوو "سەیفولقوزات" بوو- قادری فەتتاحی قازی)و بۆ پەرەپێدان‌و برەوپێدانی فەرهەنگی مەهاباد خزمەتی شایان‌و جێی سەرنجی ئەنجامدا.

دامەزراندنی خوێندنگەی نوێ لە مەهاباد ئاکامی هەوڵ‌و تێکۆشانی ماندوویی نەناسانەی وی بوو و لەبەرئەوەی زۆر جار سەفەری تاران‌و تەورێزی کردبوو و کۆمەڵە کولتوورییەکانی شێوەی نوێی لەو شارانەدا دیتبوو، ئاواتی ئەوە بوو لە مەهابادیش نموونەی ئەو جۆرە خوێندنگەیانە دروست بکا، سەیف دواتر دەستی لە ئیدارەی فەرهەنگ هەڵگرت‌و خۆی کشاندەوە، دوای وی سەرپەرشتی ئیدارەی فەرهەنگ کەوتە دەست برازایەکەی میرزا محەمەدی قازی (قازی محەمەدی بەنێوبانگ).

سەیف لەکاتی لێئەستاندنی سەلتەنەت لە بنەماڵەی قاجار، بەهۆی دنەدان‌و تەشویقی کاربەدەستانی خۆجێ یی، تەبلیغات‌و نوتقی زۆر موفەسەلی کردن بە قازانجی ڕەزا شای پەهلەوی کە ئەودەمی سەرۆك وەزیرو فەرمانداری گشتی هێزەکانی ئێران بوو و لەو تەئریخەوە چالاکی سیاسی وی زیادی کردو خەیاڵی نوێنەرایەتی مەجلیسی شوورای میللی کەوتە سەری‌و بۆ گەیشتن بەو مەبەستە زۆری هەوڵداو بۆ وی زەمینەی ناوچەیی لە هەمو بارێکەوە ئامادە بوو و با وەکوو کارشکێنی زۆری کە لەلایەن دژبەرەکانییەوە دەکرا، زۆربەی دەنگەکانی وەدست هێنا، بەڵام ئاخرەکەی دەنگەکان یان سندووقی دەنگەکانی ئەویان گۆڕی‌و زۆربەی دەنگیان بۆ عەلی خانی حەیدەری خاوەنی دێی حاجیاڵیکەند وەحسێب هێنا. بەم پێیە عەلی خانی حەیدەری پێنج شەش خول کورسی نوێنەرایەتی مەهابادی کردە تەرخانی خۆی بەبێ ئەوەی بتوانێ کارێکی باش بۆ مەهابادو دەورووبەری ئەنجام بدا یان لە جێدا لە مەجلیس خۆیەك نیشان بدا یان لە سەر شتێك بۆچوونی خۆی دەربڕێ.

ئەم شکانە سیاسییە سەیفی لە چالاکی سیاسی ناهومێد کردو وەلای نا، ئەویش لە جیاتییان چووە دێ‌و ژیانی لادێی بەسەر شارنشینی دا پەسند کرد. دێیەکانی گوێگجەلی، موشیرئاباد، عەبدوڵڵاباد، کانی کووزەڵەی کە وەك وێرانەیەکیان لێهاتبوو بە بایەکی زۆر کەم لە میراتگرانی حوسێن بەگی سنجاق کڕیبوو، لە ماوەیەکی کەمدا

ئەو دێیە وێران‌و پەرپووتانەی بە تەواوی ئاوەدان کردەوە. لە گوێگجەلی خانووبەرەیەکی- ئەندەروون‌و بێروونی- لە بەردی کانگا ساز کرد.

خوالێخۆشبوو سەیف بە عیشق‌و مرخێکی زۆرەوە دەستی کرد بە باغ دروست کردن‌و قەڵەمە چەقاندن بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە لە ماوەیەکی کورتدا باغاتی جۆر بەجۆری پێکەوە نا کە دارو درەختی بێ هەژماریان هەبوو. باغێك بە ڕووبەری چەند هێکتار تەنێ باغی ترێ‌و باغێکی دیکە بە هەزاران دار قەیسی هەبوو، باغێکی دیکە خالیس باغی سێو بوو و بەو پێیە بۆ هەر میوەیەك باغێکی بۆڵی ساز کردبوو.

قەڵەمەکانی ئەوێ (ئی گوێگجەلی) شایەد لە ملیۆنێکی تێدەپەڕاند. هەر کام لە باغەکان نێوێکی تایبەتییان هەبوو کە سەیف بۆ خۆی نێوی لێ نابوون. ئەو باغانە هەموویان لە ڕووی پرێنسیپی موهەندسی ساز کرابوون‌و بە دەستی پسپۆڕی کە لە تەورێزو ورمێوە هێنابوونی ساز کرابوون‌و خەڵفی ئەوانی لە چەشنی هەرەباشی شوێنی دوورە دەستەوە ئامادە کردبوو. هەر باغەی بە ڕادەی کافی باغەوانی بە سەلیقەو بە مشووری هەبوو کە ئەوانیشی لە مەراغە، تەورێزو ورمێوە هێنابوو و گوزەرانی ئەوانی بە باشترین شێوە دابین دەکرد. لەو باغانەدا داری جۆر بەجۆری میوەو موتوربەکراو سەرنجی ڕادەکێشا.

خوالێخۆشبوو سەیفولقوزات نموونەی خۆش سەلیقەیی‌و زەرافەت بوو (ئەمن هەر قسەیەکی ئەوتۆشم لە زمانی مامۆستا سەید حەسەنی قازی تەباتەبایی مامۆستای زمانی فارسی‌و عەرەبی زانکۆی تەورێزیش بیستبوو، خوالێخۆشبوو ناسیاویی نزیکی لەگەڵ سەیفولقوزات هەبوو- قادری فەتتاحی قازی)ماڵی خوالێخۆشبوو لە تەواوی ماوەی ساڵدا دەستە دەستە باشترین مافوورەچنی تەورێزو ورمێی لێبوو و لە باشترین خوریی بەرمێنی کوردستان فەرشیان دەچنی. مرۆ کاتێك دەچووە ژوورە ڕەنگین‌و ڕازاوەکانی ئەو خوالێخۆشبووە، چاوی بە باشترین فەرش‌و مافووری ئێرانی دەکەوت بە تایبەتی ئەو مافوورانەی کە بە قەوڵی خۆی دەیگوت نەخشەکەیان هی خوالێخۆشبوو شاسەفییە. ئەو مافوورانە مرۆیان وەبیر سنعاتی بەرزی مافوورچنی سەردەمی شایانی سەفەوی دەخستەوەو مرۆ بێ ئیختیار ئافەرینی دەکرد لە خۆش سەلیقەیی‌و مرخی خوالێخۆشبوو سەیفولقوزات بۆ بووژاندنەوەی شوێنەواری سنعاتی دەستی ئێران.

نووسەری ئەم دێڕانە چەندین جار لە سەروبەندو هەلومەرجی جیاوازدا ماڵی خوالێخۆشبوو سەیفولقوزاتم لە دێی گوێگجەلی دیوە. جارێکیان لە خزمەت بابمدا ئەو کاتەی کە خوالێخۆشبوو هێشتا مابوو چووینە ئەوێ، دێی نێوبراو نموونەیەك بوو لە بەحەشت: لە لایەکەوە مەزرای سەر سەوزو بە غورزەم، لە لایەکی دیکەوە چۆمی جەغەتوو، بە تەنیشتییەوە باغی دڵفێنککەرەوەو داری چنارو نارەوەن کە سەریان لە ئاسمان دەخشاو مێشەی خۆڕسکی کە هەتا چاو بڕی دەکرد درێژ دەبووەوە.

وەتاخی خاوێنی سپیکاریو ڕاخراو بە مافووری گران باییو جوان، لە دیوەخانی بیرونی خوالێخۆشبوودا گۆش تا گۆش خانو خاوەن موڵکان دادەنیشتن، خوالێخۆشبوو ئاغای سەیفیش بەوپەڕی ئەدەبو ویقارەوە دادەنیشتو خەریکی قسەکردن دەبوون لەسەر بابەتی دینی، ئەدەبی، عیرفانی، کشتوکاڵیو وەکی دی، جار جاریش گاڵتەو گەپ دەکرا...

چەند ڕۆژێکی کە لەوێ بووم بە هیچ جۆر هەستم بە دڵتەنگی نەکرد، باغەکانی گوێگجەلی ئەوەندە دڵڕاکێشو دیدەنی بوون کە دەرفەتی خوێندنەوە نەبوو بۆ ئەوەی کەلك لەو هەموو کتێبە باشە ئەدەبیو مێژووییانە وەرگرم کە لەسەر تاقەی ژوورەکان داندرابوون... باش لە بیرمە لەو سەفەرەدا کتێبی عالەم ئارای عەبباسی لە نووسینی ئەسکەندەر بەگی تورکمانم دی کە بەخەتێکی جوان نووسرابووەوە کە خوالێخۆشبوو سەیف دەیگوت ئەوە خەتی نووسەری کتێبەکە خۆیەتی... (لل ٤٢ تا ٤٥).

جاری دووەم بەبۆنەی کۆچی دوایی سەیفولقوزات چوومە گوێگجەلی... (سەیفولقوزات لە ساڵی ١٣٢٣/ ١٩٤٥ ]ی هەتاوی کۆچی دوایی کردووەو لە خانەقای شێخی بورهان نێژراوە- قادری فەتتاحی قازی).

بەبۆنەی کۆچی دوایی سەیف دوکانو بازاڕی میاندواو ڕۆژێك داخرا... (لل٤٥ تا ٤٦).

وەك باسم کرد سەیفولقوزات بەر لەوەی کە پیرو بێ تاقەت ببێ، زۆر جێی لە کن خۆش بوو و بۆ گەیشتن بە پلەی بەرز بە جیدییەت کاری دەکرد. پیاوێك بوو ئازادیخواز، هاونەوع دۆستو بێ ئازار، بیرکراوە، نوێخواز، بەشارستانییەت، بەدین، ئەدیب، شاعیر، خۆش خەت، قسەزانو تێکۆشەر، زۆربەی کاتی خۆی بەخت دەکرد

بۆ کارو چالاکی بۆ قازانجی گشتیو خزمەت بە خەڵك. ئەگەرچی حەوڵەکانی سەیفولقوزات بۆ وەدەستهێنانی کورسی نوێنەرایەتی مەجلیس چی لێ شین نەبوو و موافەقەتیان لەگەڵ نوێنەرایەتی وی نەکرد، لەگەڵ ئەوەش خەڵكو کاربەدەستانی دەوڵەتی ئەوپەڕی ڕێزو حورمەتیان لێ دەگرت. لەسەردەمی ڕەزاشادا بەو کەسانەی کە مەئمووری دەوڵەتی نەبوون مووچەو مواجییان نەدەدا، بەڵام سەیف مووچەو مواجبی دەوڵەتی هەبوو و ئەو دراوەی مانگ بە مانگ لە سندووقی ئیدارەی دارایی مەهاباد یان مەراغە وەردەگرت.

لەسەردەمی ئەمیر عەبدوڵڵا خانی تەهماسبی (لە ساحێب مەنسەبو پیاوە بەراییەکانی سەردەمی پەهلەوییە. لە خاکەلێوەی ١٣٠٧ [١٩٢٨] بەرامبەری ١٣٤٦ی کۆچی مانگی لە تەقەیەك کە لە ڕێگەی بروجرد- خوڕەم ئاباد لێی کرا کوژرا- اعلام معین- قادری فەتتاحی قازی)، کە فەرماندەری لەشکری ئازەربایجان بوو، لە دەوروبەری بانە لەلایەن حەمە ڕەشید خانی بانەوە سەرهەڵدانێك بەرپا کرا. هێزی دەوڵەتی لەگەڵ عەشیرەتەکانی دەورو بەری مەهاباد بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی نێو براو بەرەو بانە چوون.

دوای شکانی تاکوتەرای حەمە ڕەشید خان، سەیفولقوزاتو ژمارەیەك لە سەرۆك عەشیرەتەکانی دەوروبەری مەهاباد بۆ پێشوازی لە ئەمیر لەشکر تەهماسبی تا قاوەخانەی دێی دەرمان چوون (دەرمان دێیەکە لە ڕۆژهەلاتی مەهاباد، ڕێگەی مەهاباد بۆ بۆکان لەنیو کیلۆمیتری سەرووی وێ هەڵکەوتووە- قادری فەتتاحی قازی). ژمارەیەکی زۆر لە سوارانی مەنگور، دێبۆکری، مامەشو تایفەکانی دیکە لەگەڵ ئەمیر لەشکر تەهماسبی بوون.

ئەمیر تەهماسبی وای دانابوو دوای وتاردانێك، بەبۆنەی سەرکەوتنی عەشیرەتەکانی دەرووبەری مەهاباد بەسەر حەمە ڕەشید خانی بانەدا، ئاڵایەك بە یەکێك لە عەشیرەتەکانی مەهاباد بدا، بەڵام لەبەرئەوەی عەشیرەتەکانی مەهاباد ڕقەبەرییان لەگەڵ یەکتر هەبوو (بە تایبەتی مەنگوڕەکان لەگەڵ دێبۆکرییەکان)، بە ئەمیر تەهماسبی یان گوتبوو کە ئاڵاکە نەدا بە یەکێك لە ئەوان، چونکوو ئەوە دەکرێ ببێتە هۆی شەڕو خوێنڕێژی لەنێو عەشیرەتەکاندا. ئەمیر تەهماسبی گوتبووی ئێمە بۆ هەموو عەشیرەتەکان ئاڵایەکمان تەرخان کردووە، کە وابێ ڕێگەچارەی ئەو

گیروگرفته چییه؟ یەکێك لە سەرۆك عەشیرەتەکان گوتبووی: بنەماڵەی قازی لەلای عەشیرەتەکان بەڕێزن‌و ئەو بنەماڵەیە خۆیان عەشیرەت نین، ئەگەر ئاڵاکە بدرێ بە بنەماڵەی قازی، کەس ناڕازی نابێ‌و هەموو ئەو کارەیان پێ خۆش دەبێ. ئەمیر تەهماسبی ئەو تەگبیرەی پەسند کردو ئاڵاکەی دا بە خوالێخۆشبوو سەیفولقوزات کە لەوێ ئامادە بوو. ئاڵای گۆڕین کە نیشانەی شێرو خۆری لەسەر نەخش کرابوو ڕیشووی ئاوریشم‌و زەرکفتی هەبوو بۆ ماوەی دوورو درێژ لە مەحکەمەی قازی عەلی‌و کوڕەکەی خوالێخۆشبوو قازی محەمەد سەرنجی ڕادەکێشا.

خوالێخۆشبوو سەیفولقوزات‌و برا گەورەکەی قازی عەلی لە ڕاپەڕینێکدا کە سمایلاغای شکاك کردبووی، هاوکاری‌و هاوڕێییان نەکرد. لەبەرئەوە کاتێك کە سمایلاغا هێرشی کردە سەر مەهاباد، فەرمانی دابوو بیانکوژن. تفەنگچییەکانی سمایلاغا کە ئەوانیان نەدەناسی‌و نابەڵەد بوون، لە جیاتی قازی عەلی، قازی لەتیفیان کوشت کە ماڵەکانیان لە یەك نزیك بوو، لە قازی عەلی یان دابوو و جلکی مەلایەتیان لەبەر داکەندبوو. لەبەرئەوەی کە خوالێخۆشبوو سەیفولقوزات لەکاتی هێرشی سمایلاغا بۆ سەر مەهاباد، لە مەهاباد نەبوو، شکاکەکان دستیان وێرانەگەیشت‌و سمایلاغا هەڕەشەی کردبوو و گوتبووی هەر کاتێك جالینووس ببینێتەوە (بابم هەر بەدوای ئەو ڕستەیەدا لێی زیاد کردووە: سمایلاغا نێوی خوالێخۆشبوو سەیفولقوزاتی نابوو جالینووس- قادری فەتتاحی قازی))، دەستبەجێ لە شاخەوە جاڵەی دەکاتەوە خوارێ‌و لە نێوی دەبا. لەبەرئەوەی دەسەڵاتی سمایلاغا لە دەوروبەری ورمێ‌و مەهاباد چەندین ساڵی خایاندو دەوڵەتی ناوەندی لەوپەڕی لاوازی‌و پەرێشانی دابوو، خوالێخۆشبوو سەیفولقوزات‌و بە گشتی بنەماڵەی قازی لە سەروبەندی دەسەڵاتی سمایلاغا هەمیشە لەژێر گوشارو دەمەترسی دابوون، ئاغای سەیفولقوزات دوای هیوابڕان‌و ناهومێدی لە دەوڵەتی نێوەندی، بۆ ڕزگاری لە گوشاری سمایلاغاو ئەو بارودۆخە نالەبارە، خەتەرەی کردو چوو بۆ دیداری سمایلاغای شکاك لە گوندی چاری. سەیف هەر کە چاوی بە سمایلاغا دەکەوێ پێی دەڵێ بەپێی خۆم هاتووم کە فەرمانی خۆتان بەجێ بهێنن‌و لە شاخەوە فڕیم دەنە خوارەوە. سمایلاغا- بەپێچەوانەی ئەوەی چاوەڕوان دەکرا- بەعیزەت‌و ئیحتیرامێکی زۆرەوە وەریدەگرێ‌و لە ڕەفتارێك وا لەگەڵ بنەماڵەی قازی کردبووی، داوای لێبووردنی

لێ دەکاو پەشیوانی خۆی دەردەبڕێ. سەیفولقوزات دوای ئەوەی چەند ڕۆژ لەلای سمایلاغا دەمێنێتەوە، لەبەر نفووزی کەلامو بەیانی خۆشی، سمایلاغا بە تەواوی شیفتەی دەبێو ڕۆژ بە ڕۆژ لە حورمەت گرتنو ڕێز لێنانی زیاد دەکا. ئاخرەکەی سمایلاغا تکای لێدەکا ڕابردوو لە بیر بەرێتەوەو بە نوێنەرایەتی وی بچێتە نێو ئەو عەشیرەتە جۆر بەجۆرە کوردانەی کە هاوکاریو هاوڕاییان لەگەڵ سمایلاغا نەدەکردو بە قازانجی ڕاپەڕینی سمایلاغا تەبلیغیان بۆ بکا. خوالێخۆشبوو سەیفولقوزات بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەبەستە چووە نێو عەشیرەتەکانی هەورامانو مەریوانو ئەوانی والێکرد بە تەواوی سەر وەبەر سمایلاغا بهێننو هاوکاری لەگەڵ بکەن، بەڵام لەو سەروبەندانەدا هێزێکی گەورەو گران بەسەرکردایەتی سەرتیپ ئامانوڵا میرزای جەهانبانی ناردرا بۆ سەرکوتکردنی سمایلاغا، هێزی نێوبراو سمایلاغای شکاندو وای لێکرد ئێران بەجێبهێڵێ. دوای ماوەیەك، کاربەدەستان دیسان سمایلاغایان بانگ کردەوە ئێرانو بەڵێنێکی زۆریان پێ دا، ئاخرەکەی بە کەڵەكو دۆڵاب لەشنۆ لە تەئریخی سێیەمی گەلاوێژی ۱۳۰۹ [۱۹۳۰]ی هەتاوی کوشتییان ... .

خوالێخۆشبوو سەیفولقوزات ماوەیەك لە سەردەراباد لەلای خوالێخۆشبوو مەلا حەسەنی قزڵجیو ماوەیەکیش لە دێی عەنبار لەلای خوالێخۆشبوو مەلا شەفیع خوێندوویەتی...(لل ٥٢ تا ٥٥).

هەر وەك لە سەرەوەدا هاتووە ڕێکخراوەی فەرهەنگی نوێ لە مەهاباد، بە هەوڵ و تێکۆشانی ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات و برازاکەی قازی محەمەدەوە لە سەر پێ وەستا. لە سەرەتای پێك هاتنی قوتابخانەی نوێباو، سەرپەرشتی دائیرەی فەرهەنگ و قوتابخانە نوێیەکانی مەهاباد بە شێوەی ڕەسمی لە ئەستۆی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزاتدا بوو و پاشان کەوتوەتە ئەستۆی خودالێخۆشبوو قازی (محەمەد)(ل٩١).

بەهۆی ڕێزو ئیحترام و دەست ڕۆیشتوویی بنەماڵەی قازی لەلای مەئموورانی دەوڵەت، ئەگەر خەڵك لە کاری دەوڵەتی و غەیرە دەوڵەتیدا تووشی گرفتێك بووبایەن، بنەماڵەی قازی جێگەی پەنایان بوو، بەتایبەتی قازی عەلی و برایەکەی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات، هەروەها خودالێخۆشبوو قازی محەمەد و براکەی خودالێخۆشبوو ئەبولقاسمی سەدری قازی. ئەوان بە بێ ئەوەی چاویان لە هیچ شتێك

بێ، له هیچ چەشنە چالاکی و هەوڵدان و فیداکارییەك بۆ چارەسەری تەنگ و چەڵەمەی خەڵك کۆتاییان نەدەکرد و لەو ڕێگایەدا ئەوەندەیان زێدەڕۆیی دەکرد و پێیان دادەگرت، کە هەندێك جار بۆ جێبەجێکردنی کاری گوندنشینێك لەگەڵ مەئموورێکی پایەبەرزی دەوڵەتی دەکەوتنە کێشەوە... هەندێك له مەزنانی عێلی مەنگوڕ- کە لە سەردەمی مەلا خەلیلی گۆڕەومەڕ تاوانی ڕاپەڕین دژ به دەوڵەتیان لەسەر بوو و له تەورێز دەست بەسەر کرابوون، به کەفالەت و زەمانەتی خوداڵێخۆشبوو سەیفولقوزات له زیندان ئازاد کران، یەك لەو کەسانەی کە ئێستا ناویم لە بیرە، سلێمانی ڕەسووڵ ئاغای مەنگوڕ، ئاغای گوندی "خڕی ئاغەڵان" و "خاتوون ئەستی" بوو. (ل٩١ و ٩٢)

... له ڕووداوی سمایل ئاغای شکاکدا، خودا لێی خۆشبوو قازی لەتیف لەلایەن لەشکری سمایل ئاغاوە شەهید کراو لەشکری سمایل ئاغا خوداڵێخۆشبوو قازی عەلی یان به شێوەیەك جەربەزە دابوو، کە لە ئەنجامی ئەوەدا تا ڕادەیەك حەواسی لەدەست دابوو. دەستەی سمایل ئاغا له قازی عەلی و قازی مونعیمیان دەویست پەنجا هەزار تمەن قەرەبوویان بدەنێ بۆ خوێن بایی چەند کەس له لەشکری سمایل ئاغا کە له لایەن جەنابی کەریمی یەمنولوقوزاتەوە به تۆڵەی خوێنی باوکی (قازی لەتیف) کوژرابوون، هەتا ئەوەی به تکاکاریی هەندێك لە خەڵکانی ناسراوی خۆجێیی، سمایل ئاغا چاوی لێ پۆشی و قەناعەتی به دووسەر ئەسپی گران قیمەت کرد لەلایەن قازی عەسکەر و براکەی- واتە سەیفولقوزات (برایانی قازی عەلی) و پێنج سەد تمەنیش لەلایەن خوداڵێخۆشبوو قازی مونعیمەوە. (ل٩٥)

سەرچاوە:

خلیل فتاح قاضی، تاریخچه خانواده قاضی در ولایت مکری، ناشر وویراستار: قادر فتاحی قاضی، تبریز، ١٣٧٨ [١٩٩٩].

**شازدەهەم**

**بابا مردوخ روحانی "شیوا"**

**سیف القضاة مکری**

میرزا حەسەن ناودێر بە "سیف القضاة" کوڕی میرزا قاسمی قازی کوڕی میرزا مەحموودو برای میرزا عەلی قازی، لە خانەدانی ناسراوی قازییانی سابلاغی موکرییە کە، بابەلباب [ئەرکی] قازییەتی و سەرۆکایەتی ناوچەیان لە ئەستۆ بووە.

"سیف القضاة" زانایەکی بەمشوور، خۆشخەت و شاعیرێکی بەتواناو پیاوێکی خاوەن هیممەت بووەو بە فارسی و عەرەبی و کوردی شوێنەواری لێ بەجێماوە. خوێندنی زانستی ئایینی و ئەدەبی لە خزمەت زانایانی وەك مەلا شەفیعی بۆکانی و مەلا حەسەنی قزلْجی و مەلا سالْحی سەردەراباتی تەواو کردووەو پاشان لە گوندێك بەناوی "گوێگجەلی" لە دەوروبەری میاندواو نیشتەجێ بووەو تا کۆتایی ژیان لەو گوندەدا، بە بەر خزمەتی ئایینی و کۆمەڵایەتییەوە، بە کاروباری کشتوکاڵ و باخەوانییەوە خەریك بووەو هەر لەو ڕێیەشەوە ژیانی بەڕێوە بردووە. کاتی فەراغیش هاونشینی خەڵکانی زانا یاخۆ خەریکی موتالا بووە.

"سیف القضاة" لەسەر تەریقەتی نەقشی و موریدی شێخ شەمسەددین یۆسفی بورهان بووەو هەموو ساڵێك دەوروبەری یەك مانگ لە خانەقای شەرەفکەند لە نزیك مەرقەدی مورشیدی خۆی خەریکی سەیرو سلووك و عیبادەت بووە. ٦٧ ساڵ ژیاوەو لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٣٢٣ی هەتاوی، بەرانبەر لەگەڵ ساڵی ١٣٦٤ی مانگی جیهانی بەجێهێشتووە. [=١٩٤٥ز] و لە خانەقای شێخی بورهان تەسلیمی خاك کراوە. لە شوێنەوارە بەفارسی نووسراوەکانی هیچمان دەست نەکەوت و ئەوا چەند پارچەیەك لە شێعرە کوردییەکانی خوالێخۆشبوو دێنینەوە کە لە بەردەستماندا بوون:

١. تفلّی دڵم بەناڵەو زاری و فوغان ئەڵێ

خوش بەو شەوە کە ڕۆژی ڕوخی دڵبەرم هەڵێ (٥ فەرد)

ئاه و ناڵە لە زوڵمی پەهلەوی و هەژاریی گەلی کورد- هەڵبژاردەی پارچە شێعرێکی درێژە:

٢. بۆچی زمانی دایکی لە ئێمە مەنع کرا؟

ئەو هێندە زوڵم و فەرق و جودایی و جەفا چییە؟ (٥ فەرد)

غەزەل:

٣. عەنبەری زولفت بەدەم سەبادە

لەسەر مانگی ڕووت، هەوری مووت لادە (٨ فەرد)

داخ و کەسەری نیفاق و پێکەوە نەسازان:

٤. چون دوژمنین دەگەڵ یەك و نیمانە ئیتیحاد

رامان دەدەن بە جارێ لە هەورازی بۆ نشێو (٣ فەرد)

سەرچاوەکان [ی بابا مەردووخ]:

– دیوان سیف القضاة، چاپی تاران، ١٣٦١ [١٩٨٢]

– دەنگی گێتی تازە، ژمارە ١٦، ساڵ ٣، ل٣٤٢.

سەرچاوە: بابا مردوخ ڕوحانی (شیوا)، "تاریخ مشاهیر کرد– عرفا، علما، ادبا، شعرا"، جلد دوم، انتشارات سروش، تهران، ١٣٦٦ [١٩٨٧]، صص ٢٧٧و ٢٧٨، فارسی.

**حەڤدەهەم**

**رحمت الله خان معتمد الوزراء**

کتێبی ((اورمیه در محاربهء عالم سوز: از مقدمهء نصارا تا بلوای اسماعیل آقا ١٢٩٨–١٣٠٠ شمسی)) سەرچاوەیەکی بایەخداری مێژووی ئەو ساڵانەی ورمێ و ناوچەکەیە، کە بەشی زۆری لاپەڕەکانی شۆڕشی سمکۆ دەگرێتەوە. قەڵەمی نووسەر بە دژایەتی کورد و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد دەگەڕێت و سووکایەتی بە سمکۆ دەکات. سەرەڕای ئەوانەش، کتێبەکە خاوەن گرنگایەتی تایبەتییە بۆ تۆمار کردنی گەلێك ڕووداو کە لە سەرچاوەکانی دیکەدا نەهاتوون. بۆ نموونە، باسی پێك هاتنی (قشوونی ڕیفۆرمە)ی سمکۆ دەکات و دەڵێ دەیەوێت ٨٠٠ کەس بە جلوبەرگی تایبەتی سوپا و کڵاوی شکاکانەوە ڕێك بخات کە تا ڕۆژی قوربان [ی ١٣٣٨] ٤٠٠ کەسیان ئامادە کراون و لەو ڕۆژەدا "مانۆڕ"یان داوە (ل ٥٠٢) یا لە لاپەڕەی ٣٧٢دا باسی ئەوە دەکات کە سمکۆ خۆی وێنەی ڕێ و ڕەسمی میوانییەکی گرتووە، کە لە "عیمارەتی قەیسەر خانم" لە دەرەوەی ورمێ بەڕێوە چووە (ل٣٧٣).

کتێبی معتمدالوزراه شێوازی یادداشتی ڕۆژانەی هەیە و نووسەر ڕووداوەکانی شار و دەوروبەری ورمێ و شارەکانی دیکەی بە ڕێکو پێکی تۆمار کردووە. لاپەڕەی

٣٢٤ی کتێبەکە هەواڵێکی ٧ دێڕیی سەبارەت بە "دەست بەسەرکران"ی سەیف لەلایەن حکوومەتی سمکۆوەی تێدایە. هەواڵی معتمدالوزراه ئەو گرژی و ئاڵۆزییە پشتڕاست دەکاتەوە کە لە نێوان سمکۆ و بنەماڵەی قازییەکاندا هەبووە و گەیوەتە ئەنجامی گیرانی سەیف و دەست بەسەربوونێکی ١٠ ڕۆژەی لە گوندی "چاری". دوور نییە ئەوەی لێرەدا بە دەست بەسەر کران ناو دەبرێت، هەمان ئەو سەفەرەی سەیف بێت بۆ لای سمکۆ کە لە سەرچاوە کوردییەکاندا باسی لێوە کراوە و لەم کتێبەدا کەوتووەتە بەرچاوی خوێنەرەوە. ئەمەی خوارەوە وەرگێڕاوی نووسینەکانی معتمدالوزرایە:

ڕزگاربوونی سەیفولقوزات:

«لە ٣ی مانگی ڕەجەب [ی ١٣٣٨] [١٩٢٠/٣/٢٤ی زایینی] عەبدوولا بەگی "صدیق العشائر" بە نامەی هەڕەشە (١)، سەیفولقوزاتی سابلاغی- کە چەند مانگێک بوو لە ورمێ مابووەوە، بانگ کردبووە گوندی "بالو" بۆ ئەوەی لەسەر بابەتێک وتووێژی لەگەڵدا بکرێت هەر لەوێشەوە بە دەستبەسەری بردبوویانە [گوندی] چاری. (٢)

دەرکەوت کە سمایل ئاغا[ی سمکۆ] بانگی ئەو بەڕێزەی کردبوو و ناوبراو تا ١٣ی مانگی ڕەجەب (٣) لە "چاری" گیرابوو. لە لایەن "ئەیالەت"ەوە (٤) چەند تێلگرافێک نێردرابوو (٥) و سمایل ئاغا پێنج هەزار تمەن غەرامەی لێ داوا دەکرد. دوای ئەوەی ئەسپ و شتی تریان لێ سەندبوو، سەیفولقوزاتیان ئازاد کردبوو، کە هاتەوە ورمێ و دوای چەند ڕۆژێک بە پاپۆڕ چوو بۆ تەورێز». (٦)

١) آنتریک

٢) چەهریق

٣) ١٠ ڕۆژ

٤) ناوەندی ئیداری و فەرمانداریی شار[ی ورمێ]

٥) بۆ سمایل ئاغای سمکۆ

٦) سەرچاوە: رحمت الله خان معتمدالوزراه، «ارومیه در محاربهٔ عالم سوز- از مقدمه نصارا تا بلوای اسماعیل آقا (١٣٠٠-١٢٩٨ شمسی)»، بە کوشش کاوه بیات،

مجموعه تاریخ معاصر ایران- نشرو پژوهش شیرازه، چاپ اول، تابستان ١٣٧٩ [٢٠٠٠]، ٥٨٥ لاپەڕە، فارسی.

## هەژدەهەم

## بیرەوەریی محەمەدی قازی

مامۆستا محەمەدی قازی- وەرگێڕی ناوداری زمانی فارسی و خزمی نزیکی سەیف (ئامۆزازای) وا هەیە دەگمەن کەسێك بێ کە لە باسی سەیفدا بۆنی گلەیی لە دەم دێ و دەڵێ: خەرجی ڕێگای چوون بۆ تارانمی لە تەورێزەوە کەم داوەو تەواو بەشی نەکردووم.

کاك محەمەد پێش ئەوەی بۆ درێژە دان بە خوێندن بچێ بۆ تاران لە سابلاغ دەرسی خوێندووە و لە پشووی هاویندا چووەتە گوێگجەلی- گوندی سەیف، کە ئەو دەم خۆی لە تەورێز بووە و کوڕی گەورەی واتە محەمەد حوسێن خان بەسەر کاروباری دێیەکە ڕاگەیشتووە.

محەمەدی قازی لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا (بیرەوەرییەکانی وەرگێڕێك)، سەرەتا باسی دۆستایەتی گەرم و گوڕی خۆی لەگەڵ محەمەد حوسێن خان دەکا لە گوێگجەلی، ئینجا چۆنیەتی چوونی خۆی لە گوێگجەلییەوە بۆ مەهاباد و لەوێوە بۆ مەراغە و تەورێز دەگێڕێتەوە و لە پاشان دەگاتە سەر باسی ڕۆیشتن لە تەورێزەوە بۆ تاران بە یارمەتی سەیف:

((... هەرچۆنێك بێ، ڕۆژانی خۆشی مانەوەم لە گوێگجەلی یەك بەدوای یەکدا تێپەڕ دەبوون کە لە ناکاو تەتەرێك لە مەهابادەوە هات و نامەیەکی لە خودالێخۆشبوو قازی محەمەد کوڕی گەورەی قازی مەزن بۆ محەمەد حوسێن خان هێنا. کۆتاییەکانی بەهار بوو و سەفای دەشتودەری گوێگجەلی لەوپەڕی خۆیدا بوو، بە ڕادەیەك کە دڵ لێ هەڵکەندنی هاسان نەبوو. لە نامەکەدا نووسیبوویان "شوجاعی" مودیری قوتابخانەی سەرەتایی "سەعادەت"ی مەهاباد بەرەو تەورێز دەچێ و تکایان لێ کردووە منیش لەگەڵ خۆیدا ببا بۆ تەورێز و لەوێ بمداتە دەست جەنابی سەیفولقوزات ....

تەورێزم زۆر پێ خۆش بوو، بە تایبەت کە بۆ یەکەم جار چاوم بە شارێکی گەورە دەکەوت. چەند ڕۆژێک لە تەورێز لای جەنابی سەیفولقوزات مامەوە هەتا موسافیری ئوتوبووس بۆ چوونە تاران بە تەواوەتی پەیدا بوون. کرێکەم جەنابی سەیف دای و بۆ خەرجی ڕێگاش بریا ئەوەندەی دراو پێ بدایەم کە [لە تارانەوە] خۆم بگەیێنمە ماڵی مامم !..... ئەو خزمە دەوڵەمەندە، لەچەرانەم سەرەڕای ئەو هەموو ئیرادەتەی کە بە قسەی خۆیان بە دوکتور جەوادی قازی [مامم]یان هەبوو، نە جلوبەرگێکی ڕێکوپێکیان دەبەر کردم کە بە سەربەرزی بچمە لای مامم، نە تە نانەت ئەوەندەیان خەرجی ڕێگا پێدام کە بە سەلامەت بگەمە شوێنەکە ... .»

سەرچاوە: محمد قاضی، "خاطرات یك مترجم"، انتشارات فردوس، با همکاری چاپی انتشارات چشم و چراغ، اصفهان، ١٣٧١ [١٩٩٢]، ص٩٨.

**نۆزدەهەم**

**سید محمد صمدی**

**ابوالحسن سیف قاضی (سیف القضات)**

میرزا حەسەن ناسراو بە سەیفولقوزات کوڕی میرزا قاسم و برای پچووکتری میرزا عەلی قازی (قازی عەلی) لە هەشتەمی [حەوتەمی] مانگی بانەمەڕی ساڵی ١٢٥٥ی هەتاوی لە شاری مهاباد لەدایك بوو. خوێندنی زانستی دینی لەلای عولەما و زانایانی وەکوو مەلا شەفیعی ئەنبار، مەلا حەسەنی قزڵجی. مەلا ساڵحی سەردەرابادی و مەلای سڵەمانکەندی تەواو کرد و لە دوای ئەمە لە دێیەك بەناوی گوێگجەلی لە نزیك میاندواو دامەزرا و تا کۆتایی ژیانی لەو ئاوەدانییەدا لەگەڵ خزمەتی دینی و کۆمەڵایەتی خەریکی کشتوکاڵ و باغداری بوو و هەر بە حاسڵاتی ئەو دێیەش دەژیا و لەگەڵ کەسانی زانا و بە موتاڵا هاموشۆ و تێکەڵاوی هەبوو.

سەیفولقوزات لە پێڕەوانی تەریقەتی نەقشبەندی و لە موریدانی شێخ یۆسف" شەمسەدین بورهانی" بوو و هەموو ساڵێ مانگێك لە خانەقای دەماوە و خەریکی سەیر و سلووك دەبوو. بۆ خۆی لەمبارەیەوە دەڵێ:

هەر کەس بە تەمای دین و دنیا بێ، دەبێ لەو دەرکە خاکی دەرگا بێ
قیبلەیە بۆ مە زۆر لە مێژ ساڵە ڕووی لێ وەرگێڕین، نوێژمان بەتاڵە
دڵ وەك ئاوێنە جەلای هەڵدێنێ ژەنگی گوناه و ژاری نامێنێ
جێگاو خانەقای شەمسی بورهانە شەیتان وەك شێتان لێی سەرگەردانە

سەیفولقوزات نزیك بە ٦٨ ساڵ ژیا و لە کۆتایی ساڵی ١٣٢٣ی هەتاوی ماڵئاوایی لە ژیان کردو لە گۆڕستانی خانەقای شێخی بورهان بە خاك ئەسپێردرا.

زۆر تووڵی کێشا عەزیز هیجرانت لاڵ بم نابینم مەیلی جارانت
چ قەوما ئەوساڵ لەبەر چاو کەوتم ؟ چلۆنت دڵ هات لە دڵت دەرکەوتم؟
لە چێشتانێ ڕا تا بانگی شێوان چاوم چاوەڕێ لە دەشت و کێوان
چاوم هەر لە ڕێی "کانی کووزەڵە" دنیام لە بەرچاو تەم و دووکەڵە
ساڵان هەر مانگێك مایەی حەیاتم یا تۆ دەهاتی یا من دەهاتم
هەرهاتە هات بوو، ئەوساڵ نەهاتی ئەویش بەدبەختی مایەی نەهاتی
شەوگاری دووریت وشکە سەرمایە لە بەختی ڕەشمە باش ڕەشەبایە
هەمرازی شەویم فکر و خەیاڵت ڕەفیقی ڕۆژێم یادی جەماڵت
ژینی بە بێ تۆم ناخۆش و تاڵە وەتاغم زیندان ماڵم لێ چاڵە
شەوانم شین و گریە و ڕۆ ڕۆیە ژێربوونی ڕۆژێم بەبۆنەی تۆیە
ئەگەر دەپرسی باسی ئەو ناوە حوکمی ئازادی ئیعلان کراوە
لایان دا خانمان چادری ڕەش لە سەر وەك ڕۆژ لە ژێر هەور، سەریان هێنا دەر
چارشێویان لادا لەسەر گۆنای سوور دەرکەوتن سینگ و باسکی وەك بلوور

لە شێعرێکدا کە بۆ عەلی بەگی حەیدەری موکری "سالار سەعید" نووسیوە دەڵێ:

کەسێك بەختی سەعیدی بێ، دەبێ حازر لە دیوانت
مەلاز و مەنزڵی تۆیە نەسیبی وی لەسەر خوانت
کە قووتی ڕووحە میهری تۆ، لەسەر سەفحەی مەحەببەتدا
هەمیشە حازری وەختە حەسەن بێ و بێتە میوانت
ئەوا هات جێژنی قوربان شوکر لیللا خۆشی خۆشیمە

که حەججی ئەکبەرە بۆمن کەوا خوم کردە قوربانت
کەلامی من وەکوو شێعری فلانی بێ سەرو پانین
بکە تەقتیعی ئەوزانی، یەقین ڕاست دێتە میزانت
عەلی! مشهووری شارە، من کە سەیفی زولفەقاری تۆم
هەمیشە یا عەلیمە گەر قەبوولم کەی لە شیعانت
لەلام تەرکی ئەدەب کوفرە، ئەمن تەرکی ئەدەب ناکەم
لەبەروەی بوو کە ڕاوەستاوم لەلای میسباحی دیوانت
هەتا حەلقەی دوعاو تەهلیلو خەتمن ڕۆژو شەو دایر
لە دنیاو عاقیبەت یارو موعین بێ شەمسی بورهانت
لە ڕاستو چەپ دەڕۆن سەف سەف سوارانت لە دوی یەکتر
هەمیشە حافیزت بێ بۆ حەوادیس لوتفی یەزدانت

* * *

عازیز! ئارەزووت زۆری بۆ هێنام
فرمێسکم سوور بوو زەردی ڕوی لێنام
دیسان بە ئاوری دووریت کەوتمە گیر
دنیام لێ سارد بوو، بوو بە زەمهەریر
دنیا وا پڕ بوو لە بەفرو سیخوار
فرمێسکی سوورم بە سپی هاتە خوار...
لەگلەگ لەگل کەوت نەما تەق تەقی
سێرووش لە سێڕەو فیتوو چەقچەقی
پاك پەشیمانن لە بۆ گەرمێنێ
بۆچ دەهاتنەوە عەمروو نەمێنێ...
لالْ بم نابیسم لە چیاو لە ڕازان
زیڕەی هەلۆیان چریکەی بازان
کوێر بم نابینم خێڵ بەرەو خواران
تەقڵەو ڕمبازی و هەو هەوی سواران
شەماڵو زریان دایم شەڕیانە
ئاغاوەت شڕن، کرمانج قڕیانە....

ئەم شێعرە سەبارەت بە زستانی زۆر سارد و ترسێنەری ساڵی ١٣١٤ی هەتاوی گوتراوە و لە دوایین بەیتیدا دەڵێ بیستی خاکەلێوەی ١٣١٤ی هەتاوییە و سەرما بێداد دەکا. کۆکراوەی شێعرەکانی ڕەوانی شاد بێ سەیفولقوزات بە کۆششتی مامۆستا ئەحمەد قازی و بە نێوی (دیوانی سەیف القضات) لە ساڵی ١٣٦١ی هەتاوی لە ٨٢ لاپەڕەدا چاپ کراوە.

لە زۆرێك لە شێعرەكانی ڕەوانی شاد بۆ سەیفولقوزات دا هێمای زۆر جوان و دڵگیر هەنە بەو زۆرداریيانەی كە بە درێژایی مێژوو زۆر جار دەرحەق بە كوردان كراون. ڕوحی شاد بیرەوەری وی پیرۆز بێ.

سەرچاوە:

سید محمد صمدی، "نگاهی به تاریخ مهاباد"، انتشارات رهرو، مهاباد، ١٣٧٣، فارسی، صص ٢٨٨-٢٩٠.

## بەڵگە و وێنە

### ١- پێنج کورتە "بەڵگەنامە"

دەزانین سەیف خاوەن ملك و دەوڵەمەند و خاوەن دەستەڵات بووە. دەشزانین کە لە کاروباری ئابووری، ملکداری، باغداری، ئاژەڵداری و کشتوکاڵدا بلیمەتێکی گەورە بووە. ئەم یادداشتانەی وا لێرەدا دێن، نیشاندەری هێندێك چالاکی ئابووری و خاوەن ملکانەی سەیفن.

لە ناو دەستنووسەکاندا چەند لاپەڕە یادداشتی دەستخەتی سەیف هەن کە بەڵگەی ژیانی ئاسایی ئەو وەك خاوەن موڵك و دەستەڵاتدارن. هۆی هێنانی بەڵگەکان لێرەدا ئەوەیە یەکەم ئەو لایەنەی ژیانی سەیف بەهۆی یادداشتەکانی خۆیەوە دەربکەوێ و دووهەم، چەشنە زانیارییەك لە سەر بارودۆخی ئابووری خەڵکی دانیشتووانی دێیەکانی سەیف (و دێیەکانی دیکەی ناوچەکە) بکەوێتە بەردەستی توێژێنەر و بینەری بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئابووری ئەو سەردەمە.

بەڵگەنامەی یەکەم، ژمارەی مەڕومالاتی سەیف دەردەخا. بە گوێرەی یادداشتەکە سەرجەم ٢٥٣ سەر مەڕ و بزن و بەرخ و کاوڕ و نێری و بەرانی ماڵی سەیف لەو ساڵە تایبەتەدا (کە بە داخەوە دیار نییە کام ساڵە)، براونە هەوار و ٨٧ سەریان لە ماڵەوە ماونەتەوە، کە هێندێکیان هی کاردارەکانی بوون.

بەڵگەنامەی دووهەم، لیستەی ئەو خوری و خاوك و "میان پۆڕ"ەیە وا سەیف بە ڕەعیەتی دێیەکانی خۆی داوە بۆی بڕێسن و بۆ هەر "سیە"یەك [هێندێك زیاتر لە ٢ کیلۆ] بڕی ١ یا ٢ قڕانی پێداون. کێشی سەرجەمی ئەو خورییە، بەوانەوە کە بۆگوریسچنین پێی داون، بووەتە ٣ پووت و ٢٧ سیەو نێو، کە دەکاتە زیاد لە ٧٨ کیلۆ و نیو. ڕێکەوتی نووسرانی ئەم یادداشتەش نازاندرێ.

بەڵگەنامەی سێهەم، ڕادەی ئەو ماڵیات- واتە ئەو دە و دوویەیە کە ڕەعییەت داویانە بە سەیف، ئەویش بە ڕێگەی "عەبدولڵا مەنگور"ەوە کە وێدەچێ کوێخا یان گزیری سەیف بووبێ. ئامارەکان بە حیسابی ناسراو بە "ڕقوومی" نووسراون و بە داخەوە ناتوانم بیانخوێنمەوە، بەڵام ئەگەر بێ و لەناو کتێبەکەدا چاپ بکرێ، وا هەیە

ئەو تاجر و بازارییە بە ساڵدا چووانەی وا حیسابی ڕقوومی دەزانن بتوانن بیخوێننەوە، بە داخەوە ساڵی نووسرانی ئەم یادداشتەش دیار نییە.

**بەڵگەنامەی چوارەم**، یادداشتێکی کورتە، سەبارەت بە قەرزدار بوون بە "حاجی میرزا ساڵح" بە خۆشییەوە ئەو چەند دێڕەی کە سەیف وەکوو یادداشتی خۆی نووسیویەتی:

(قەرزی حاجی میرزا ساڵح لەجیاتی خودالێخۆشبوو قازیی عەسکەر لە یەکەمی زیحەجەی ١٣٥٤ بە ماوەی ساڵێك. ئەسڵی قەرزەکە یەکهەزار و یەکسەد و چل تمەن، دراوی ئیجارە یەکسەد و چاردە تمەن. فرۆشی شەرتی دانگێکی پیرۆلی باغی و دانگێکی عەبدوڵابات بە پاڵپشتی بەڵگەی فرۆشتنی دوو دانگ لە هەر کام لەو دێیانە، هەم کاتەکەی و هەم هۆیەکەی ڕوون دەبێتەوە.

کڕیار یان خاوەن قەرز حاجی میرزا ساڵحی ئەمینی تاجری سابلاغی بووە. لە بەڵگەکەدا لە جێی دانگێك باسی فرۆشتنی دوو دانگ لە دێیەکانی سەرەوە دەکرێ.

بەم پێیە، دەبێ سەیف ئەم یادداشتە کورتەی بەر لە سەوداکە نووسیبێ.

**بەڵگەنامەی پێنجەم**، یادداشتێکی کورتە کە سەیف لە سەرەوە نووسیوە:

"برای تعرفه دی ماه برای بهمن ١٣٠٩ همینطور" واتە [بۆ تەعروفەی دەی مانگ، بۆ مانگی بەهمەنی ١٣٠٩ [١٩٣٠ زایینی]ش هەر وەتر و دوایە بە ڕیز نێوی منداڵەکانی نووسیوە و عەدەدێکی لە بەرانبەر هەر کام لە ناوەکان نووسیوە:

| | |
|---|---|
| محمد حسین | ٢٧ |
| فاتمه | ٢٢ |
| حمیراء | ١٦ |
| سلطان | ١٥ |
| عایشه | ١١ |
| احمد | ١٠ |
| محبوبه | ٧ |
| رحیم | ٢ |

لەبنەوە لە دوو دێڕدا نووسیویە: «برای فروردین ۱۳۱۰ بهمین تاریخها نوشته شد مالیات [؟] جنسی ۱۷ خروار وکسری نقد شصت و نه تومان کسری»

بەداخەوە جوان ڕوون نابێتەوە مەبەست چییە؟

بەڵگەنامەی شەشەم، باسی کەرەستەی چنینی قاڵیچەیەکی "ئوتورلیق" -واتە دیوی بەردەستان- دەکا. لەو یادداشتە کورتەدا هەموو ناوەکان ترکین، هەروەها باسی کەرەستەی چنینی قاڵییەکی ۳/۵ و ۵/۵ میتری دەکا کە ئەوانیش هەر ترکین:

۲- پێناسەی سەیف

وزارەت داخله

علامت شیروخورشید سرخ

ورقه هویت

آقای میرزا ابوالحسن سیف قاضی

پسر آقای میرزا ابوالقاسم قاضی و امینه [هەمین] خانم

که در ولایت ساوجبولاغ، شهر ساوجبولاغ در تاریخ هفتم اردیبهشت یکهزار و دویست و پنجاه و پنج شمسی مطابق چهارم ربیع الثانی ۱۲۹۳ قمری تولد یافته است

در محله رزگەیان ساکن است

شماره شناسنامه ۱۹۸

تاریخ تنظیم سند ۱٦ اردیبهشت ۱۳۰۷ شمسی

تاریخ صدور ۱۷ اردیبهشت ۱۳۰۷ شمسی

*　*　*

وەرگێڕانی کوردیی:

[ناسنامەی سەیف]

وەزارەتی ناوخۆ

نیشانەی شێرو خۆری سوور

وەرەقەی ناسنامە

ئاغای میرزا ئەبولحەسەنی سەیفی قازی

کوڕی ئاغای میرزا ئەبولقاسمی قازی و هەمین خانم

که له ویلایەتی ساوجبولاغ، شاری ساوجبولاغ، لە ڕێکەوتی حەوتەمی مانگی بانەمەڕی هەزارو دووسەد و پەنجا و پێنجی هەتاوی، بەرانبەری چوارەمی ڕەبیعولسانی ۱۲۹۳ مانگی [=۱۸۷٦/٤/۲۷ی زایینی] لەدایك بووە.

دانیشتووی گەڕەکی ڕزگەیانە

ژمارەی ناسنامە ۱۹۸

ڕێکەوتی ئامادەکردنی بەڵگە ١٦ی بانەمەڕی ۱۳۰۷ی هەتاوی ڕێکەوتی دەرکردن [ی ناسنامەکە] ۱۷ی مانگی بانەمەڕی ۱۳۰۷ی هەتاوی

### ٣- حوکمی قەزاوەت

مخفی نماناد که بواسطهء معلومات و زحمات تحصیلات و لیاقت جناب مستطاب میرزا ابوالحسن سیف القضات خلف مرحوم میرزا ابوالقاسم قاضـی سلمه‌الله و سابقه‌اش در امورات شرعیه و قضاوت در این موقع که یک خانه‌اشرا بطرف قریه گویگجلو برده است او را مجاز نموده اجازه دادیم که بامورات قضاوت و شرعی محالات بهی و قره‌لر و دهات این طرف کنار رودخانه جغتو رسیدگی نماید و از طرف ماها نیابت دارد و لیاقت تدریس و مقام پیشنماز را دارا و مجاز است تحریرا فی شهر ربیع الاول ۱۳٤٣

داعی علی قاضی

[محل مهر الحق مع علی و علی مع الحق]

داعی در اموات شرعیه ماذون نمودم که جناب سیف

القضات قال الله و ماقال الرسول را جاری نماید و تدریس

وپیشنمازی جمعه و جماعت قیام و اقدام نماید

[محل مهر عبدوالمنعم]، [قاضی]

* * *

وەرگێڕانی کوردیی:

حوکمی قەزاوەت و پێشنوێژی و ئیمامەت کە لەلایەن

قازی عەلی و قازی مونعیم بۆ سەیف دەرکراوە

شاراوە نەمێنێتەوە کە بەهۆی زانیاری و زەحمەت و خوێندن و لێهاتوویی جەنابی موستەتابی میرزا ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات کوڕی خوداڵێخۆشبوو میرزا ئەبولقاسمی قازی، سڵاوی خودای لێ بێ و لەبەر پێشینەی خۆی لە کاروباری شەرعی و قەزاوەتدا، ئێستا کە یەکێك لە ماڵەکانی بردووەتە دێی گوێگجەلی، ئیجازە دراومان کرد و ئیجازەمان پێدا کە بە کاروباری قەزاوەت و شەرعی محاڵەکانی بێهی و قەرەلەر و دێیەکانی ئەم بەرەی چۆمی جەغەتوو ڕابگا و لە لایەن ئێمەوە نوێنەرایەتی هەیە و لێوەشاوەیی دەرس دادان و مەقامی پێشنوێژی هەیە و ئیجازەی پێ دەدرێ

داعی عەلی قازی [مۆر]: حەق لەگەڵ عەلی و عەلی لەگەڵ حەقە

داعی لە کاروباری شەرعیدا ئیجازەم دا کە جەنابی سەیفولقوزات ئەوەی خودا گوتوویەو ئەوەی نێردراوی خودا گوتوویە بەڕێوە ببا و دەرس دادا و پێشنوێژی جومعە و جەماعەت بکا

[مۆر]: عەبدولمونعیم [ی قازی]

٤- بەڵگەی فرۆشتنی مڵك

البایع الناذر الموجر

حضرت آقای میرزا ابوالحسن سیف القضات

بعداز رجوع از نذر اولاد ونقض وقف إحتیاطا تقلیدا

لمجوزیهما و بعداز آنکه اقرار کرد بیعه ملك خودم است میفروشم

المشتری للمنذر والموجر

مقدار دو دانگ از هریك از قریههای پیرولی باغی و عبداللهاباد

من محال آختاچی اعم از زمین آبی و دیمی و جبال و تلال و مراتع

و کهریز و عیون و خانها و دهکده و عمارت و باغ و درخت

با جمیع توابع ولو احق و کل مایطلق علیه اسم الملکته و کذا او لم یذکر

وحدود اندو قریه از غایت اشتهار مستغنی از بیان است

المشتری المذر وله للستاجر
جناب آقای حاج میرزا محمد صالح امینی تاجر
محترم ساوجبلاغی
الثمن والعوض المقبوض
مبلغ یکهزارو یکصد وچهل تومان که عبارت
است از یازده هزارو چهارصد ریال (۱۱٤۰۰) میباشد وتمام ثمنه
از طرف مشتری ببایع رسیده است
[مهر] ابوالحسن سیف القضات

وبینهما اولا عقد مبایعه و مناذره و موایبه و مواجره صحیحه شرعیه مشتمل برایجاب و قبول و قبض ثمن و اقباض مثمن که عبارت از تخلیه و فراغ است و اسقاط کافه خیارات حتی خیارالغبن ... ... بخش در حالت صحت و رضا بدون اجبار و اکراه صورت وقوع پذیرفت ثانیا بایع عین و منفعت بیعه را به مبلغ دو هزار و دو صد و هشتاد تومان نذر مشتری نمود ثالثا بایع تمام بیعه را بمشتری باجاره داد بموعد نود ونه سال سالی از قرار یازده تومان و نیم و بعد آقای امینی اعیان دو دانگ قریه‌های پیرولی باغی و عبداله‌اباد را بحضرت سیف باجاره داد بموعد یکسال سال شمسی بمبلغ یکصد و چهارده تومان که عبارت از یکهزار و یکصد و چهل ریال است اوهم قبول کرد و آقای امینی گفت هرگاه خدا کرد تا غایت مده یکسال یکهزار و یکصد و چهل تومان ثمنه و یکصد و چهارده‌تومان وجه اجاره از طرف آقای سیف القضات یا ورثه او بمن یا بورثه من رسید انوقت از شکران نعمت دو دانگ از... فوق با ضمان الدرك منذوره نذر آقای سیف القضات بوده باشد تحریرا فی غزه شهر ذی حجه یکهزار و سیصد و پنجاه وچهار قمری

دو دانگ از قریهء پیرولی باغی با دو دانگ از عبداله‌آباد ضمیمهء پیرولی باغی بتفصیل مرقوم درفوق بیع و نذره اجاره کرده‌ام صحیح است
سیف القضات قاضی
[مهر] ابوالحسن سیف القضات
... ... ... [امضاء] محمد قاضی
وخط و امضاء آقای سیف تصدیق میشود محمد [ناخوانا]

اقر البائع و المشترى عليها و بقبض الثمن لذى

[مهر] [ناخوانا] الحقير

اقر البايع بما و قسم عليه المدرس بمسجد بازار

[مهر]

... آخر البايع به ...

المدرس بمسجد سيد نظام [امضاء] محمد [نا خوانا]

اقر بما زبر في [مهر يا محمد] الداعى لاهيجانى

ما رقم صحيح الحقير عبدالكريم قاضى زاده

بر مراتب مسطوره اطلاع دارم [امضاء]

مراتب متن صحيح است

[امضاء] كريمى

بر مراتب مزبوره اطلاع دارم

ابوالقاسم صدر قاضى

[مهر]

مراتب مسطوره متن را شاهدم

[امضاء] عزيز صديقى

مراتب مرقومه صحيح است

[مهر] حيدرى

مراتب مسطوره متن را شاهدم

اقل العباد احمد اشعرى

مضمون متن شاهدم

[مهر] قاضى زاده

شاهدم اقل

[امضاء ناخوانا]

شاهدم اقل محمد اشعرى

اقر لجميع ما رقم في المتن

الداعى بمسجد رستم بيگ

[امضاء] مجيد ساوجبلاغى [مهر]
بر مراتب مسطوره متن اطلاعى دارم
[مهر] جعفرى

*　*　*

وەرگێڕانی کوردیی:

فرۆشیاری نەزردەر و ئیجارەدەر

حەزرەتی ئاغای میرزا ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات، دوای گەڕاندنەوەی نەزری منداڵان و شکاندنی وەقفی ئیحتیات، بە پێڕەوی کردن لەوەی کە ئیجازەی پێدراوە و دوای ئەوەی کە دەریبڕی ئەوەی دەفرۆشێ مڵکی خۆمە و دەیفرۆشم کڕیاری نەزر پێدراو و ئیجارە دار جەنابی ئاغای حاجی میرزا محەمەد ساڵحی ئەمینی تاجری بەڕێزی سابلاغی ئەوەی دەفرۆشرێ و نەزر دەکرێ بە ئیجارەدار

ڕادەی دوودانگ لە هەرکام لە دێیەکانی پیرۆلی باغی و عەولابات لە محاڵی ئاختەچی، بە زەوی بەراو و دێمەکار و شاخ و گرد و لەوەڕگە و کارێز و سەرچاوە و خانوو و دێ و بینا و باغ و دارەوە لەگەڵ گشت ئەو شتانەی سەر بە ئەوانن و هەموو ئەو شتانەی کە ناوی مڵکیان لەسەر دەنرێ، جا چ ناویان برابێ یان نا و سنوورەکانی ئەو دوو دێیە لەبەر ناسراو بوونی تەواویان ئیتر پێویست بە ڕاگەیاندن ناکا.

نرخ و لەبری وەرگیراو

بڕی یەك هەزار و یەکسەدو چل تمەن کە بریتییە لە یازدە هەزار و چوارسەد ڕییاڵ (١١٤٠٠) و تەواوی نرخەکە لە لایەن کڕیارەوە دراوە بە فرۆشیار.

[مۆر] ئەبولحەسەنی سەیفولقوزاتی قازی

لەنێوان هەر دوولایاندا یەکەم: پەیمانی کڕین و نەزر و خەڵات و ئیجارەی دروستی شەرعی پێك هات کە وەئەستۆگرتن و قبووڵ و وەرگرتنی دراو و وەرگیرانی بابەتی دراوەکە دەگرێتەوە، واتە بەجێهێشتن و ... و لابردنی ... بژارەکان تەنانەت بژاری مەغبوون بوونی ئاشکرا، بەڵکوو ئاشکراتر لە دۆخی ڕاستبوون و ڕەزامەندی بە بێ زۆرلێکران و پێ ناخۆش بوون بەڕێوەچوو.

دووهەم، کڕیار بابەتی کڕاو و سوودەکەی ئەوی کە بڕی دوو هەزار و دووسەد و هەشتا تمەنە کردە نەزری مشتەری.

سێهەم، کڕیار هەموو بابەتە کڕاوەکەی بە ئیجارە دا بە مشتەری بۆ ماوەی نەوەد و نۆ ساڵ لە قەراری ساڵی یازدە تمەن و نیو پاشان ئاغای ئەمینی ئەعیانی دوو دانگی دێیەکانی پیرۆلی باغی و عەبدولاباتی بە ئیجارە دا بە حەزرەتی سەیف بۆ ماوەی ساڵێکی هەتاوی و بە نرخی یەکسەد و چاردە تمەن کە بریتییە لە یەك هەزارو سەدو چل ڕیاڵ ئەویش قبووڵی کرد. ئاغای ئەمینی گوتی بێتوو خودا بکا تا کۆتایی ماوەی ئەو یەك ساڵە یەك هەزار و سەدو چل تمەن نرخ و سەدو چاردە تمەن دراوی کرێ لە لایەن ئاغای سەیفولقوزات یان میراتگرەکانییەوە درا بە من و پێم گەیشت ئەودەمی بە شوکرانەی نیعمەت دوودانگ لە ... سەرەوە بە "ضمان الدرك"ی نەزرکراو نەزری ئاغای سەیفولقوزات بێ.

لە غوڕڕە [ڕۆژی یەکەم] مانگی زیحەججەی هەزار و سێسەد و پەنجاو چواری مانگی [=١٩٣٦/٢/٢٤ی زایینی]دا نووسرا

دوو دانگی دێی پیرۆلی باغی و دوودانگی عەولابات، سەر بە "پیرۆلی باغی"م بەم وردە ڕیشاڵەی لە سەرەوەدا نووسراوە فرۆشت و نەزرم کرد و تەحویلم دا. ڕاستە

ئیمزا سەیفولقوزاتی قازی

[مۆر] ئەبولحەسەنی سەیفولقوزاتی قازی

مۆر و ئیمزاکان:

... ... ... محەمەد قازی [قازی محەمەد]

خەت و ئیمزای ئاغای سەیف تەسدیق دەکرێ [ئیمزا] محەمەد ...

ئەوەی نووسراوە، فرۆشیار ئیقراری پێ کردووە. وانەبێژی مزگەوتی بازاڕ [مۆر]

فرۆشیار و کڕیار ئیقراریان کرد بە سەودای نێوانیان و بە دانی نرخەکەی بچووك [مۆر، ناخوێندرێتەوە]

ئەوەی نووسراوە فرۆشیار ئیقراری پێ‌کردووە، وانەبێژی مزگەوتی سەید نیزام [ئیمزا] محەمەد ...

... [یا محەمەد] دۆعاگۆ لاهیجانی [مەلا محەمەدی دربکە]

ئەوەی نووسراوە ڕاستە، پچووك عەبدولکەریمی قازی زادە [قازی کەریم]

لەوەی نووسراوە ئاگادارم [ئیمزا ناخوێندرێتەوە]

ئەوەی لە دەقەکەدا هاتووە ڕاستە [ئیمزا] کەریمی

لەو شتانەی باس کراون ئاگادارم. ئەبولقاسمی سەدری قازی [مۆر]

شاهییدی ئەو شتانەم نووسراون. [ئیمزا] عەزیزی سەدیقی [مۆر]

ئەوەی نووسراوە ڕاستە. حەیدەری [مۆر]

شاهیدی ناوەرۆکی دەقەکەم. قازی زادە

شاهیدی ئەو شتانەم لە دەقەکە باس کراون. بەندەی هەری پچووك ئەحمەد ئەشعەری

شاهیدم هەرە پچووك. محەمەد ئەشعەری

شاهیدم هەری پچووك [ئیمزا ناخوێندرێتەوە]

ئێقرار دەکەم بە گشت ئەوەی لە دەقەکەدا هاتووە. دۆعاگۆی مزگەوتی ڕۆستەم بەگ

مەجیدی ساوجبولاغی [مۆر] [ئاغا مەجید]

لەو باسانەی لە دەقەکەدا هاتوون ئاگادارم، جەعفەری [مۆر]

* * *

لە ڕۆژی یەکەمی زیحەجەی ١٣٥٤ی مانگی [= ١٩٣٦/٢/٢٤ زایینی و ١٣١٤/١٢/٥ی هەتاوی]، سەیف دوو دانگی دێی پیرۆلی باغی و دوودانگی دێی عەبدولاباتی سەر چۆمی جەغەتووی بە "حاجی میرزا محەمەد سالحی ئەمینی: تاجری سابلاغی فرۆشتووە.

ئەم بەڵگەیە لە ڕاستیدا سەنەدی ئەو سەودایەیە، کە وەك دەردەکەوێ مەلا، یان کاتبێك نووسیویە، ئینجا سەیف بە دەستخەتی خۆی دوو دێڕی لە کۆتایی بەڵگەکەدا نووسیوە و لە دوو شوێنیش مۆری کردووە. پاشان ١٩ کەس وەك شاهید، لای سەرەوە و دەستی ڕاستی بەڵگەکەیان مۆر و ئیمزا کردووە.

بەداخەوە هێندێك لە ئیمزاکان یان مۆری شاهیدەکان ناخوێندرێتەوە. لەنێو ئەو کەسانەی دا کە شاهیدییان داوە لەسەر ئەو سەودایە، ناوی محەمەد قازی [پێشەوا قازی محەمەد]، ئەبولقاسمی سەدری قازی، مجید ساوجبلاغی [ئاغا مەجید]، مەلا محەمەد لاجانی [مەلا محەمەدی دربکەی]، عەزیز صدیقی، عەبدولکەریمی قازی زادە [قازی کەریم] و ... دەبیندرێ.

ئیمزای پێشنوێژەکانی مزگەوتی بازار، سەید نیزام و ڕۆستەم بەگ دەریدەخا ئەو سات و سەودایە لە شاری مەهاباد کراوە.

٥- مۆڵەتنامەی تفەنگی ڕاو:

اجازه ۱۱۲۰ .... اسلحه .... شد

شماره پرونده سال ۱۹ /۹۳

علامت شیروخورشید

محل الصاق عکس تشکیلات امنیه کل مملکتی

نمره ۳۹۰

شماره ثبت دفتر شعبه امنیه ستاد لشکر

/۱۹۰ ۲۰/۱/۱۸

ناحیه لشکر ٤ شمالغرب

جواز حمل تفنگ دولول سرپر شکاری

اسم ابوالحسن اسم پدر میرزا ابولقاسم اسم خانواده سیف القضات

ساکن قریه گوجلو سن ٦٤ علائم صورت گردچشم درشت ابرو پیویسته

سیستم اسلحه دولول سرپر نمره اسلحه ١٨٤ نمرهٔ کارخانه آلمانی

١- دارنده این جواز اجازه دارد تفنگ شکاری فوق الذکر را با خود حمل نماید

٢- صاحب این جواز حق انتقال آنرا بغیر ندارد

٣- مدت اعتبار جواز یك سال است از تاریخ ۲۰/۱/۱ الی ۲۰/۱۲/۲۹

٤- در سه ماهه بهار شکار قدغن است

٥- شکار آهو با اتومبیل قدغن است

رئیس ستاد لشکر رئیس امنیه کل مملکتی

مهر و امضاء سرهنگ اصلانی فرمانده هنگ ٤ امنیه امضاء

سرهنگ طالب بیگی

بە ژمارەی ۱۱۲۰ لە دەفتەری چەکدا تۆمار کرا

نیشانەی شێر و خۆر

ڕێکخراوی ئەمنییەی وڵات

مەڵبەندی لەشکری ٤ی باکووری ڕۆژئاوا

ئیجازەنامەی هەڵگرتنی تفەنگی دوولوولەی سەرپڕی ڕاوکردن

وێنەی سەیفولقوزات
[مۆری سەر وێنەکە]

ژمارەی ئیجازەنامەی ساڵی ۹۳/۱۹
نمرە: ۳۹۰

لەشکری چواری باکووری ڕۆژئاوا
... ئەمنییە

ژمارەی تۆمارکردن لە دەفتەری لکی
ئەمنییەی ستادی لەشکر: ۱۹۰
۲۰/۱/۱۸ [= ۱۹٤۱/٤/۷]

ناو: ئەبولحەسەن ناوی باب: میرزا ئەبولقاسم

پاشناو: سەیفولقوزات تەمەن: ٦٤

نیشانەکانی دەموچاو: چاو خڕ و گەورە و برۆی بەیەکەوە لکاو

سیستمی چەك: دوولوولی سەرپڕ ژمارەی چەك: ۱۸٤

ژمارەی فابریك: ئاڵمانی

۱- خاوەنی ئەم ئیجازەنامەیە، ئیجازەی هەیە تفەنگی ڕاوی لە سەرەوە ئاماژە پێکراو لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ.

۲- خاوەنی ئەم ئیجازە نامەیە مافی نییە ئەو ئیجازەنامەیە بداتە کەسێکی دیکە.

۳- ماوەی برکردنی ئەم ئیجازەنامەیە ساڵێکە لە ڕێکەوتی ۲۰/۱/۱ [۱۳]ەوە تا ۲۰/۱۲/۲۹ [۱۳] [= ۱۹٤۱/۳/۲۱ تا ۱۹٤۲/۳/۲۰]

٤- لە سێ مانگەی بەهاردا ڕاو یاساخە

٥- ڕاوە ئاسك بە ئۆتۆمۆبیل یاساخە

سەرۆکی ستادی لەشکری باکووری ڕۆژئاوا
سەرهەنگ ئەسلانی [ئیمزا]
سەرۆکی ڕێکخراوەی ئەمنییەی وڵات ...
فەرماندەری هەنگی ٤ی ئەمنییە
سەرهەنگ تالب بەگی [ئیمزا]

٦- وەکالەتنامەی سەیف بۆ محەمەد حوسێنی سەیفی قازی:

... ثبت اسناد درصفحه

دفتریار

زیر شماره ۱۲۵۷ به ثبت رسید

تاریخ ۲۳/۳/٤

وزارت دادگستری

ثبت کل اسناد و املاك

برگ وكالت نامه

دفتر اسناد رسمی شماره ٦٩ حوزه تهران

موكل آقای میرزا ابوالحسن سیف قاضی فرزند آقا میرزا ابوالقاسم قاضی

محل اقامت بخش سه تهران كوچه خیابان نظامیه منزل صدرقاضی نماینده محترم مجلس شورای ملی

وكیل آقای محمد حسین سیف قاضی فرزند موكل

محل اقامت زرین ده جزء قراء بهی آباد كه سابقا جزء میانداب بوده است مورد وكالت در خصوص فروش غلات متعلق بموكل موجود در میانداب و غیره بهركس كه نماینده ادارات دولتی باشد و بهر قیمتیكه مقتضی باشد و اخذ وجه آن حدود اختیارات وكیل نامبرده در تمام مراحل مربوط بمورد وكالت از امضاء اوراق و دفاتر مربوطه مجاز و مختار است و بطور خلاصه تمام اقدامات و امضاآت و اظهارات و اقدامات وكیل نامبرده بمنزله اظهارات و اقدامات و امضاآت موكل نافذ و ممضی است

بتاریخ چهارم خرداد ماه ۱۳۲۳

محل امضا: سیف القضات قاضی

تمبرهای مهر خورده دولت شاهنشاهی ایران

مهر دفتر اسناد رسمی شماره ٦٩

* * *

ژماره ١٢٥٧

ڕێکەوتی ٢٣/٣/٤ [١٣] [= ١٩٤٤/٥/٢٥]

وەزارەتی داد

سەبتی گشتی بەڵگە و ئەملاك

پەڕەی وەکالەتنامە

دەفتەری ئەسنادی ڕەسمی ژمارە ٦٩ی حەوزەی تاران

وەکالەتدەر: جەنابی میرزا ئەبولحەسەنی سەیفی قازی کوڕی جەنابی میرزا ئەبولقاسمی قازی

شوێنی نیشتەجێبوون: بەخشی ٢ی تاران، کۆڵانی شەقامی نیزامییە،ماڵی سەدری قازی نوێنەری بەڕێزی مەجلیسی شوورای میللی

وەکیل: جەنابی محەمەد حوسێنی سەیفی قازی، کوڕی وەکالەتدەر

شوێنی نیشتەجێبوون: زەڕین دێ [- گوێگجەلی]، سەر بە بێهیاباد کە پێشتر بەشی (٢) میاندواو بووە.

بابەتی وەکالەت: سەبارەت بە فرۆشتنی دانەوێڵەی ملکی وەکالەتدەر، کە لە میاندواو و هتدە، بە هەرکەس کە نوێنەری دایرە دەوڵەتییەکان بێ بە نرخێکی بە ڕێو جێ وەرگرتنی دراوەکەی.

سنووری دەستەڵات: وەکیلی نێوبراو لە هەموو قۆناخەکانی پێوەندیدار بە بابەتی وەکالەت، هەر لە ئیمزا کردنی ئەوراق و دەفتەری پێوەندیداردا ئیجازە پێدراو و خاوەن بڕیارە و بە کورتی هەموو چەشنە هەنگاونانەوە و ئیمزا کردن و ڕاگەیاندن و کردەوەیەکی وەکیلی نێوبراو وەك ڕاگەیاندن و هەنگاونانەوە و ئیمزای وەکالەتدەر برەوی هەیە و ئیمزا کراوە.

ڕێکەوتی چوارەمی مانگی خوردادی ١٣٢٣ [١٩٤٤/٥/٢٥]

ئیمزا: سەیفولقوزاتی قازی

* * *

ئەم بەڵگەیە لە دوایین سەفەری سەیف بۆ تاران نووسراوە. سەیف بە گوێرەی بەڵگەنامەکە، لە ماڵی ئەبولقاسمی سەدری قازی برازای خۆی لە تاران ژیاوە کە لەو سەردەمەدا نوێنەری خەڵکی مهاباد بووە لە مەجلیسی شوورای میللی ئێراندا.

ناوەرۆکی بەڵگەکە، بریتییە لەوەی نوێنەرایەتی خۆی داوە بە محەمەد حوسێنی سەیفی قازی- کوڕە گەورەی خۆی، بۆ ئەوەی بتوانێ بەرهەمی کشتوکاڵی سەیف لەمیاندواو بە نوێنەرانی داییرە حکوومییەکان بفرۆشێ، لە جیاتی ئەو بەڵگەکان ئیمزا بکاو دراوەکەی وەربگرێ.

بەڵگەنامەکە لە دەفتەرخانەی ژمارە ٦٩ی تاران نووسراوە و ڕێکەوتی نووسینی، چوارەمی خورداد [= جۆزەردان]ی ساڵی ١٣٢٣یە، کە دەکاتە ١٩٤٤/٥/٢٥ واتە نزیکەی شەش مانگ پێش کۆچی دوایی سەیف کلێشەی بەڵگەنامەکە بە ئیمزای سەیفەوە لە بەشی پاشکۆدا دەکەوێتە بەرچاوی خوێنەرەوە.

**٧- وەسیەتنامەی سەیف بە دەستخەتی قازی محەمەد:**

باعث تحرير اينكه حضرت آقای سيف قاضی (سيف القضات) وصيت كرد كه سه دانگ قريه سراب اعم از زمين ابی و ديمی و مراتع و غيره باستثناء سه دانگ آسياب بالا و سه دانگ آسياب زير قلعه از دەمذكوره با سه دانگ قريه عبداله اباد اعم از زمين آبی و ديمی و باغ غيره با سه دانگ قريه كانی كوزله اعم از زمين آبی و ديمی و غيره مال پسرم محمد حسين سيف قاضی باشد و سالی چهارصد تومان به هر چهار خواهر خودش (يكی صد تومان) بدهد و بقيه ثروت و املاك من آنچه می ماند مال دو پسرم رحيم و عبداله باشد

تحريرا فی ٢١/١١/٨

[امضاء] سيف القضات قاضی

بر مضمون متن شاهدم و امضاء حضرت

آقای سيف القضات را تصديق می نمايم

[امضاء] محمد قاضی

بر مراتب مسطوره در متن اطلاع دارم

[امضاء ناخوانا]

بر مرا تب مرقومەء متن كاملا اطلاع دارم

[امضاء] محمد صالح ايوبی مدرس

مراتب مسطوره صحيح است

امضاء حیدری

اطلاع دارم

امضاء محمد حسین پیشنماز گوکتپه

المطلع اذ ...

الداعی محمد ...

مضمون متن صحیح است

میرزا خلیل قزلباش

بر مضمون متن مطلعم

[مهر] بابامیری

*    *    *

وەرگێڕانی کوردیی

هۆی نووسینی [ئەم بەڵگەنامەیە] ئەوەیە کە حەزرەتی ئاغای سەیفی قازی (سەیفولقوزات) وەسیەتی کرد کە سێ دانگی دێی سەراو بە زەوی بەراو و دێم و لەوەڕگە... هتدەوە بێجگە لە سێ دانگی ئاشی بن قەڵای دێی ناوبراو لەگەڵ سێ دانگ دێی عەولابات بە زەوی بەراو و دێم و باغ و هتد- لەگەڵ سێ دانگی دێی کانی کووزەڵە بە زەوی بەراو و دێم و هتدەوە بگرە ئی کورەکەم محەمەد حوسێنی سەیفی قازییە و ساڵێ چوارسەد تمەن بدا بە هەرچوار لە خوشکەکانی (یەکی سەد تمەن) و پاشماوەی دارایی و مڵکەکانی من ئەوەی دەمێنێتەوە، هی دوو کوڕم ڕەحیم و عەبدوڵان.

نووسرا لە [ڕۆژی] ٢١/١١/٨ [١٣] [=١٩٤٣/١/٢٨]

شاهیدی دەقە کە هەم و ئیمزای حەزرەتی ئاغای

سەیفولقوزات تەسدیق دەکەم.

محەمەدی قازی [ئیمزا]

ئاگام لەو باسەی هەیە لە دەقی سەرەوە دا هاتووە.

[ناخوێندرێتەوە، ئیمزا]

بە تەواوی ئاگادارم لەم دەقەی نووسراوە

محەمەد ساڵحی ئەییوبی وانەبێژ

ئەو باسەی نووسراوە ڕاستە

ئیمزا حەیدەری

ئاگادارم

ئیمزا، محەمەد حوسێن پێشنوێژی گوێگتەپە

ئاگادار لە ... ...

دۆعاگۆ محەمەد [ناخوێندرێتەوە

ناوەرۆکی دەق ڕاستە

میرزا خەلیلی قزڵباش

ئاگام لە ناوەرۆکی دەقەکە هەیە

[مۆر] بابامیری

* * *

ئەوەی ئەم بەڵگەیە دەکا بە یەك لە سەنەدە گرنگەکانی ئەم کتێبە ئەوەیە کە بە دەستخەتی پێشەوا قازی محەمەد نووسراوە و خۆی یەکەم کەسە کە شاهیدیی دروست بوونی ئەم وەسییەتنامەیەی داوە.

وەسییەتنامەکە، بە بەراورد لەگەڵ زمانی ئەو سەردەمانە بە زمانێکی هاسان و ساکار نووسراوە.

بێجێ نییە باسی دوو کەسی دیکەش بکرێ کە ئەم بەڵگەیان ئیمزا کردووە، یەکیان میرزا خەلیلی قزڵباش نوێنەر و موباشیری سەیفە لە گوێجەلی کە هەتا مابوو لە ئاست پاشماوەکانی سەیف بە ئەمەگ و وەفادار بوو.

لە ساڵی ١٣٧١ی هەتاوی محەمەد ڕەزای داوودی بە زمانی فارسی نامیلکەیەکی بڵاو کردەوە بە نێوی "ماجرای دختر گرین فیلد (کچە هەرمەنی) در مهاباد" نووسەر لەو کتێبە لە لاپەڕەی ٣٥دا دەنووسێ: «کەسێکی ئینگلیسی بە نێوی گرانفلید لە کۆنسوولەکانی پێشووی ئینگلیسی بە ساڵان لە کوردستان و ئازەربایجان بازرگانی دەکرد و سامانی لەسەر یەك کۆکردەوە و دێی "سەراو" و "ڕەحیم خان"ی کڕی و بووە خاوەنی ئەوان. لە هەمان حاڵدا ژنێکی لە هەرمەنییەکان خواست و کچێکی لێی بوو. چەند ساڵ دواتر گرانفیلد گیانی داوە بە گیاندەر و ملکێکی زۆری لەپاش بەجێما. کچە گەیشتە تەمەنی ١٧ ساڵان و ئاشقی لاوێکی کورد بوو بە نێوی عەزیز بەگ. دواجار کچە هەرمەنی بووە موسڵمان و نێوی خۆی نا

فاتیمه و لەگەڵ عەزیز بەگ زەواجی کرد. ئەو عەزیز بەگە بابی میرزا خەلیل موباشیری سەیفولقوزات مامی قازی محەمەدە)).

ئێمە نازانین کە میرزا خەلیل لەو کچە هەرمەنییەوە بووە یان لە ژنێکی دیکەی عەزیز بەگ. حەسەنی قازی دەڵێ من خۆم خودالێخۆشبوو میرزا خەلیلی قزڵباشم دیبوو، پیاوێکی زۆر بەمشوور و بەوەج بوو، لە تەمەنی ژووروی ٧٠ ساڵاندا کۆچی دوایی کرد. خەلیلی فەتتاحی قازی لە بیرەوەرییەکانیدا باسی سەفەرێکی خۆی دەکا بۆ گوێگجەلی لە ساڵی ١٣٢٨ی هەتاوی و دیداری خۆی و میرزا خەلیلی قزڵباش ئاوا دەگێڕێتەوە:

((لە بیرێکی دووورودرێژەوە چووبووم کە ژنێکی لادێیی خەڵکی ئاوەدانییەکە بەرەو جۆگە دەچوو، کە نزیك بووەوە بە زمانی کوردی لێم پرسی: خوشکێ کێ لەو خانووەیەدا دەژی؟ کوێخا و ڕدێن سپی ئەم دێیە کێیە؟ ژنەکە بە ڕاوێژێکی خەفەتاوی گوتی:

خاوەنی ئەم دێیەو ئەم خانوو بەرەیە محەمەد حوسێن خان بوو کە لە داریان دا برا چکۆڵەکەی لە ڕووسییە دەخوێنێ، دایکی ڕەحیم ئاغا ئەم دێیەی بە خاوەن موڵکێکی مەراغەیی بە ئیجارە داوە. ئیجارەدارەکە بۆ خۆی لە مەراغە دادەنیشێ، بەلام لێرە نوێنەرێکی هەیە کە بۆ وەرگرتنی بەشە دانەوێڵەی ئەربابی چووەتە سەر خەرمانان. ئێرە چۆڵە، کەی خودا و ڕدێن سپی ئەم دێیە میرزا خەلیلی قزڵباشە کە ماڵەکەی لە نێوەڕاست دێیەکەیە و بە دەست ماڵی ئەو کەیخوداییەی پێشان دام.

لەبەر ئەوەی نووسەر میرزا خەلیلی ناوبراوم لە دەزگای خوالێخۆشبوو سەیفدا پێشتر دیتبوو و دەمناسی و هەروەها ماندوو و برسیش بووم بۆیە بۆ حەسانەوە و نان خواردن چوومە ماڵی میرزا خەلیل. میرزا خەلیل بۆ خۆی لە ماڵ نەبوو و چووبووە سەر مەزرا، لە دوویان نارد، دوای نیو سەعات هاتەوە ماڵێ، دوای سلاو و چاك و چۆنی لەلامان دانیشت، ناوبراو دوای هێندێك قسە کردن، بە یادی زەمانی ڕابردوو و جێ و جەلالی بنەماڵەی خوالێخۆشبوو سەیف بێ ئەوەی خۆی بۆ ڕابگیرێ بە کوڵ گریا، هەستی خزمایەتی بەسەر منیشدا زاڵ بوو، ئەمنیش دەستم بە گریان کردو مەجلیسەکەمان بوو بە پرسە و ئاخ و داخ هەڵڕشتن. دوای دوو سەعات مانەوەو نان خواردن و لێکۆڵینەوە سەبارەت ئەو ڕاسپاردەیەی هەمبوو، بە دڵێکی پڕ لە دەرد و کەسەر دێی ناوبراوم بەجێهێشت)).

[خلیل فتاح قاضی، تاریخچه خانواده قاضی در ولایت موکری، تەورێز ١٣٧٨ی هەتاوی، لل ٥١، ٥٢.]

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی میرزا خەلیل لە ڕیزی کەسانی ناسراوی دیکەدا وسیەتنامەی سەیفی ئیمزا کردووە، دەبێ زۆر جێی باوەڕی وی بووبێ.

کەسێکی دیکەی کە ئیمزای هاویشتووتە پای ئەم وەسییەتنامەیە مەلا ساڵحی ئەیووبی پێشنوێژ و مەلای دێی گوێگجەلییە. مەلا ساڵح، مەلایەکی زانا و بەناوبانگ بوو، باوکی مریەمە خاتوون دایکی دوکتور جەعفەری شەفیعی یەك لە تێکۆشەرانی سیاسی کوردە کە چەند ساڵ لەمەوبەر لە ڕووداننێکی ترافیك لە کوردستانی عێراق کۆچی دوایی کرد.

## نامەی ڕەحیمی سەیفی قازی بۆ محەمەد حوسێنی سەیفی قازی

تصدقت شوم- محترم مرقومهٔ مبارکه زیارت از مژدهٔ بقای صحت و سلامتی مزاج مسعود منتهای خشنودی حاصل گشت از اظهار لطف و یادآوری که فرموده بودند سلامتی قرین حالست. باری در خصوص ارسال پول برای حضرت قبله‌گاهی مرقوم فرموده بودید اینست حسب الامر جناب مستطابعالی مبلغ پانصد تومان ٥٠٠ روانه خدمتشان گردید و در خصوص بند اظهار فرموده بودند، فعلهٔ اوزن قشلاق و رحیم خان و ارمنی بلاغی و کانی... و چوگانلو همگی آمده بودند و ایحال جلگهٔ بزرگ را تمام کرده و کاغذی خدمت آقای کاکه رحمن نوشته بودم برای فعله، آقای عبداله نگذاشته بود که بفرستند، در خصوص مساعده هرگاه نگیرم بکلی چغندرها سوخته خواهد شد، تکلیف چیست، هرگاه میل داشته باشند به آقای کوشش بفرمایند حتما خواهد داد. دیگر بسته به امر مبارک است.

رحیم [امضاء] رحیم سیف قاضی

* * *

### وەرگێڕانی کوردیی

بە تەسەدوقت بم. حورمەت نامەی پیرۆزتانم زیارەت کرد. لە مزگێنی هەرمانی تەندروستی و سلامەتی میزاجی پیرۆزتان ئەوپەڕی خۆشحاڵی پێك هات. لە دەربڕینی لوتف و بیرهێنانەوەی کە کردبووتان سلامەتی هاوتای حاڵە. هەرچۆنێك

بێ سەبارەت بە ناردنی دراو بۆ حەزرەتی قیبلەگای من نووسیبووتان، ئەوە بەپێی فەرمانی جەنابی بەرزتان بڕی پێنجسەد تمەن -٥٠٠- ڕەوانەی خزمەتیان کراو لە بابەت بەنداو فەرمووبووتان، کرێکاری "وزن قشلاق" و "ڕەحیم خان" و "ئەرمەنی بولاغی" و "کانی [کوورزەڵە]"و "چەوگالی" هەموویان هاتبوون و هەرچۆنێك بێ دۆڵی گەورە تەواو کراو کاغەزێکم نووسیبوو بۆ خزمەت ئاغای کاکە ڕەحمان بۆ کرێکار، ئاغای عەبدوڵا ئاغا نەیهێشتبوو کە بیاننێرێ، لەمەڕ یارمەتی بێتوو وەرنەگرین چەوەندەرەکان هەموو دەسووتێن. ئێستا دەبێ چ بکرێ ؟ ئەگەر ویستتان بە ئاغای کووشش بفەرموون حەتمەن دەیدا. ئیتر وەستاوەتە سەر ئەمری پیرۆزتان.

ڕەحیم [ئیمزا]: ڕەحیمی سەیفی قازی

**دوانامەی محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی**
**بۆ هاوسەری فەرخلەقا خانمی مەلیك قاسمی**

ئەم بەڵگەنامەیە، خاوەنی گرینگایەتییەکی تایبەتییە.

شەهید محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی- کوڕە گەورەی سەیفولقوزات، وەك وەزیری جەنگی حکوومەتی کوردستان و جێگری سەرۆك کۆمار و دواتر فەرمانداری مهاباد لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا. دوای هەرەس هێنانی کۆمار، بەدەست ڕژێمی ئێران ئەسیر و پاشان هاوڕێ لەگەڵ پێشەوا و شەهید ئەبولقاسمی سەدری قازی ئامۆزای خۆی، لە گۆڕەپانی چوارچرای مهاباد لەکاتێکدا نەعرەتەی «بژی کوردستان»ی دەکێشا، دلێرانە چووە سەرداری بێداد و شەهید کرا. ڕووداوەکە لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٣٢٦/١/١٠ واتە ١٩٤٧/٣/٣٠ ڕووی دا. شەهیدان بەر لەوەی چارەنووسی مەرگ بێتە سۆراغیان، وەسییەتنامەکەیان نووسی.

ئەوەی لێرەدا دەیبینین وەسیەتنامەی شەهید محەمەد حوسێن خانە، کە نوسخەی گەیشتووەتە دەست بنەماڵەکەیان و تا ئەمڕۆ پارێزراوە. سەبارەت بە وەسییەتنامەکە، ئەم خاڵانەی دەبێ دەستنیشان بکرێن:

١- شەهید محەمەد حوسێن خان، گەلێك لە سەرەخۆ و بە بیرێکی تیژ وەسیەتنامەکەی نووسیوە. ئێمە لە ڕێگەی بیرەوەری هێندێك لەو ئەفسەرە

ئێرانییانەی وا لە کاتی ڕووداوەکەدا لەوێ ئامادە بوون و لە ڕاستیدا جینایەتەکە بەدەست ئەوان بەڕێوە چووە، دەزانین کە ئەوان گەلێك بە پەلە پەل ئەو تاوانەیان بەڕێوە بردووە و ویستوویانە پێش ئەوەی ڕۆژ ڕووناك بێتەوە لە مهاباد هەڵێن و بەرەو میاندواو و تەوریز بڕۆن. ئەو حاڵەتە بێگومان بووە بە هۆی ئەوەی گوشار بخەنە سەر قوربانییەکان و بە پەلە لە سێدارەیان دەن. سەرەڕای ئەو ڕاستییە، شەهید محەمەد حوسێن خان، بە شاییدی ئەم وەسیەتنامەیە، لەوپەڕی لە سەرەخۆییدا وەسیەتنامەی نووسیوە و نەشڵەژاوە.

٢- وەسیەتنامەکەی بۆ هاوسەری ژیانی- واتە "فەروخ لە قا خانمی مەلیك قاسمی" نووسیوە و نەفسی نامە و وەسیەتنامە نووسین بۆ هاوسەر- لە کاتێکدا براو کوڕیشی هەبوون، خاڵێکی سەرنجڕاکێشە و نیشاندەری ڕوانگەی مرۆڤانەی نووسەرەکەیەتی.

٣- ئەو هەڵوێستە، بە هۆی ناوەرۆکی وەسیەتنامەکەوە بەهێزتر دەنوێنێ و دەسەلمێنێ: شەهید محەمەد حوسێن خان هاوسەرەکەی بە "خانم" ناو دەبا و خوداحافیزی لێ دەکا و دەڵێ تەنیا لەلای تۆ شەرمەزارم. ئینجا سوێندی دەدا کە دوای مردنی ئەو ناڕەحەت نەبێ و لەوەش زیاتر ئازادی دەکا دوای ئەو، هەر بڕیارێك پێی خۆشەسەبارەت بە ژیانی خۆی بدا..

٤- شەهید، سەبارەت بە بابی خۆی- سەیفولقوزات، برای ڕەحیمی سەیفی قازی و منداڵەکانی ئەوپەڕی خۆشەویستی و ڕێز نیشان دەداو تەنیا مەرجێك بۆ حەلاڵ و ئازاد کردنی هاوسەرەکەی دادەنێ ئەوەیە ئاگادارییی لە منداڵەکان بکا، پێیان بخوێنێ و ئەگەر بکرێ بیاننێرێتە ئوڕووپا لەوێ دەرس بخوێنن.

٥- جگە لە ئەندامانی بنەماڵە، شەهید محەمەد حوسێن خان لە رەعیەت و نۆکەر و ئەوانەی وا ژێر دەستەی بوون، دوای لێبوردن دەکا.

٦- خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە، نووسەری وەسیەتنامە لەو کاتە ناسك و گرینگەدا، لە بیری قەرزدارییەکانی خۆیدایە و داوا لە هاوسەری دەکا قەرزی ئەو خەڵکانە بداتەوە، ئەوەش نەك بە شێوەیەکی گشتی ڕادەگەیێنێ، بەڵکوو بەناو، ٦ کەس ناو دەبا و ڕادەی قەرزەکەش ڕادەگەیێنێ و تکا دەکا قەرزەکان بدرێنەوە.

٧- لەوانە گرینگتر، تەنانەت لە کۆتایی نامەکەدا ناوی دوو ئەفسەر و کەسێکی دیکەی ئێرانی دەبا، کە لە کاروباری گیران و موحاکەمە کراندا یارمەتییان داوەو

یەکیان پارێزەری بووە. گەرچی ئەنجامی ئەو موحاکەمەیە گەیشتووەتە لەسێدارە دران، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تکا لە هەوسەری دەکا هەر کامیان ٥٠٠ تمەنیان بدرێتێ کە ئەو دەم دراوێکی زۆر بووە.

بەڵام سەبارەت بە دەقی وەسیەتنامەکە دەبێ بگوترێ کە ئەوە دەقی فەرمی دەوڵەتییە و بە گوێرەی دوایین دێڕ کە بە تایپ رایتر (تەباعە) نووسراوە، لەسەر فایلی بەردەستی دەوڵەتی ئێران بووە، ئەوانیش بە دابی سەردەم، کە هێشتا فۆتۆکۆپی باو نەبوو، "رونوشت مصدق"یان دەرکردووە. ئەو "رونوشت" یا نوسخە هەڵگیراوە بە گوێرەی ئیمزای "سەرگورد [مەیجر] ئەمین پوور"ەوە، بووەتە نوسخەی باوەڕپێکراو وەك نوسخەی ئەسڵی سەیر دەکرێ. نێوی "مەلا محەمەد سدیقی سیدقی"ش کە بە هەمان تایپ ڕایتر لە کۆتایی نامەکەدا هاتووە، ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ. مەلا محەمەد سدیقی سیدقی، قازی عەسکەر بووە و لە کاتی لەسێدارە درانی هەر سێ شەهیددا ئامادە بووە، ناوبراو لە دوایین ڕستەی نامەکەدا تەئییدی کردووە کە محەمەد حوسێن خان وەسیەتنامەکەی بە خەتی خۆی نووسیوە، ئیمزای کردووە و هاوسەرەکەی خۆی کردووە بە چاودێری ژیانی منداڵ و کاروباری مڵکەکانی، "ڕەحیم "ی براشی بە هەمان شێوە کردووەتە چاودێر- ئەگەر لە سەفەری باکۆ بگەڕێتەوە.

شەهید محەمەد حوسێن خان بەوپەڕی ئیمان و بڕواوە ڕادەگەیێنێ کە تاوانبار نییە، جینایەتکار نییە و ژیانی لە ڕێگای خزمەتکردنی کۆمەڵ و گەل و وڵاتپارێزیدا دێتە کۆتایی، ئەوەش ڕادەگەیێنێ کە لە لای ویژدانی خۆی شەرمەزار نییە بۆ ئەو کارانەی وا کردوویەتی.

ئەم بەڵگەیە لە کتێبی سەیید محەمەدی سەمەدی: نگاهی بە تاریخ مهاباد، انتشارات رهرو مهاباد، ١٣٧٣ شمسی، لاپەڕەی ٥٣٥دا چاپ کراوە. بەڕێز سەمەدی لەژێر ئەم بەڵگەیە بە زمانی فارسی ئەم ڕوونکردنەوەیەی نووسیوە: ((ئەو نووسەرەوەی کە ئەم بەڵگەیەی لە ڕووی فایلی ئەسڵییەوە نووسیوەتەوە، بە هەڵە ناوی مەلا سدیقی سیدقی وەك- محمد صادق صادقی- نووسیوە. ئەم دەقە وەسییەتنامەی خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێنی سەیفی قازییە)).

بسم‌الله الرحمن الرحیم

فرخ لقا خانم سیف قاضی امشب شب دوشنبه ۲۶/۱/۱۰ از این فاصله دور باشما خداحافظی میکنم و بدانید من جانی نبوده و بدون کوچکترین تقصیری در راه جامعه و خدمت بخلق نه خیانت به کشور و مملکت دارفانی را وداع مینمایم. من در پیش وجدان خود خجل نیستم فقط من در نزد شما شرمسارم و همینقدر تو را بروح پدرت و بجان فرزندانت قسم میدهم بعداز من بهیچوجه ناراحت نباشید و شما هر نوعی دلت میخواهد آزاد هستید و توقع دارم شما نیز مرا آزاد و حلال فرمائید فقط چیزی که هست شش نفر اولاد که یادگار من هستند بشما میسپارم بشرطی خیلی مواظبت نموده مخصوصا در تحصیل آنها مواظبت کامل فرموده درصورتیکه ممکن شود آنها را برای تحصیل به خارج یعنی اروپا بفرستید شما از طرف من قیوم هستید و اخوی عزیزم رحیم اگر مراجعت نمود ناظر هستند و از تمام رعایا، نوکران و کسان خواهش نمائید مرا حلال نمایند و روی بچه‌ها را می بوسم با والده وجیهه خانم که یادگاری ابوی هستند و عبدالله برادرم خوب بود وحق کسان مرا بدهد مخصوصا از تادیه قرضهای من سعی نماید بدهد. مبلغ دو هزار و دویست تومان بجناب سرهنگ هاشمخان امین مقروض هستم سند رسمی هم ندارد ولی انسانیت کرده اوراهم بدهید مبلغی به صغر [صغار؟] فتاح خان مقروض هستم که وجه هشتهزار تومان بوده از این مبلغ دوهزار یا سه هزار را داده‌ام بقیه مقروضم، به لطف علی کوشش مقروضم بدهید. از رعایا اگر از کسی جریمه گرفته باشم یاد ندارم خودتان تحقیق نمائید بدهید و خیلی صدمه خیلی ناراحتی بخودت راه ندهید و شما نیز در اختیار شوهر آزاد هستید ولی بشرطی از بچه‌ها مواظبت نمائید از تحصیل نمانند و یکنفر نایب حج بفرستید مبلغ پنج هزار تومان برایم اسقاط نماید و باطلاع شیخ محمد شمس برهان باشد از خانم والده و همشیره‌ها خداحافظی مینمایم مقصود این است هرکس ادعای از من داشت و طلب نمود بدهید و وصیت من اینست جنازه‌ام را به خانقاه علیه پهلوی مرحوم حضرت ابوی دفن نمائید از اخوی خیلی معذرت میخواهم از دور روی همه‌تان را می بوسم اینست ساعت طلا وانگشتری خود را محض یادگار تقدیم میدارم. بیست ودو هزار تومان هم [به] آقای دکتر جواد قاضی مقروضم در حدود مبلغ چهار هزار تومان به آقای موسوی مراغه

مقروضم در هر صورت آنچه فعلا در یادم بود نوشته بقیه نیز چنانکه در فوق عرض شد بعداز اینکه ثابت نمودند پرداخت نمائید مطابق معمول در سر مزار ابوی و من تلاوت قران برقرار نمائید محمد بابی را... بایکنفر دیگر بگیرند از خدیجه خانم و فرد فرد خانواده ملك قاسمی خداحافظی مینمایم مبالغی هم به آقای حاجی غلامحسین اردبیلی مقروضم بدهید در حفظ و حمایت خداوندی باشید با حواس جمع بتحریر رسید، مبلغ پانصد تومان به آقای سروان کبیری و مبلغ پانصد تومان به آقای مساوات و پانصد تومان بسرگرد نوائی که وکیل من بوده‌اند بدهید

امضاء

٢٦/١/١٠

رونوشت برابر رونوشت غیر مصدق موجود در پرونده است

محل امضاء

رئیس دفتر... ستاد لشکر سرگرد امین پور

خط و امضای محمد حسین خان را تصدیق مینمایم

محمد صادق صادقی

وهمچنین خانم عیالش ناظر قرار داد و اگر رحیم آمد

اوهم ناظر است

محمد صدیق صدقی

بسم‌الله الرحمن الرحیم

فەڕوخلەقا خانمی سەیفی قازی !

ئەمشەو شەوی دووشەمۆ ٢٦/١/١٠ [١٣] [=١٩٤٧/٣/٣٠]یە، لەم ڕێگای دوورە خوداحافیزیت لێ دەکەم. ئەوەش بزانن من جینایەتکار نیم و بەبێ کەمترین تاوانێك، لە ڕێگای کۆمەڵ و خزمەت بە گەل- نەك خەیانەت بە وڵات و مەملەکەت ئەم جیهانە تێپەڕە بەجێ دەهێڵم. مُن لەلای ویجدانی خۆم شەرمەزار نیم، تەنیا لەلای تۆ شەرمەزارم و هەر ئەوەندە بە ڕووحی باوکت و گیانی منداڵەکانت سوێند دەدەم کە دوای من بە هیچ شێوەیەك ناڕەحەت نەبی و ئازادی بە هەر شێوەیەك کە دڵت دەخوازێ. چاوەڕوانم تۆش گەردنی من ئازاد بکەی و حەڵاڵم بفەرمووی. تاقە شتێك

که هەیە، شەش منداڵم که یادگاری منن به تۆ دەسپێرم، بەو مەرجەی زۆریان چاوەدێری لێ بکەی، به تایبەت تەواو ئاگاداری خوێندنەکەیان بی و ئەگەر بگونجێ بۆ خوێندن بیاننێرییه دەرەوە، واته ئورووپا. تۆ لەلایەن منەوە قەییم [ی ئەوان]ی. ئەگەر برای خۆشەویستم ڕەحیم گەڕایەوە، ئەوا ئەویش چاوەدێر[ی کارەکە] دەبێ. له هەموو ڕەعیەت و نۆکەر و کەس‌وکار تکا بکه با حەڵاڵم بکەن و ڕوخساری منداڵەکان ماچ دەکەم. لەگەڵ دایکم- وەجیهه خانم، که یادگاری باوکمه و هەروەها عەبدوڵڵای برام باش به [کە] مافی کەس‌وکارم بداتەوە، بەتایبەتی بۆ دانەوەی قەرزەکانم تێبکۆشن ... دووهەزار و دووسەد تمەن به جەنابی سەرهەنگ هاشم خانی ئەمین قەرزدارم، بەڵگەی فەرمیشی نییه، بەڵام کارێکی مرۆڤانەی کردووە، ئەویش بدەنەوە. بڕی پارەیەك به ... فەتتاح خان قەرزدارم که هەشت هەزار تمەنه و لەوە، دووهەزار یا سێ‌هەزار تمەنم داوەتەوە و پاشماوەکەی قەرزدارم. به "لوتفعەلی کووشش" قەرزدارم، ئەویش بدەنەوە. لەنێو ڕەعیەتەکاندا، ئەگەر له کەسێك جەریمه [جەزا]م وەرگرتبێ و خۆم له بیرم نییه، ئەوا خۆتان لێی بکۆڵنەوە و بیدەنەوە. زۆر زیان و ناڕەحەتی تووشی خۆت مەکه و له ئیختیاری هاوسەردا ئازادی، بەڵام بەو مەرجەی له منداڵەکان پارێزگاری بکەی، که دەرس بخوێنن. کەسێك وەك نوێنەر[ی من] بنێرن بۆ حەج، بڕی پێنج هەزار تمەنیشم بۆ بکەن به "ئیسقات"، [ئەوەش] به ئاگاداریی شێخ محەمەدی شەمسی بورهان بێ. له خانمی دایکم و خوشکەکانم خوداحافیزی دەکەم، خواستم ئەوەیه هەرکەس داواکارییەکی له من هەبوو و سابیتی کرد، ئەوا بیدەنەوە. وەسیەتم ئەوەیه جەنازەکەم له خانەقای بەرز[ی بورهان]، له لای خوالێخۆشبوو حەزرەتی باوکم بنێژن، گەلێك داوای لێبوردن له براکەم دەکەم و له دوورەوە ڕوخساری هەمووتان ماچ دەکەم. ئێستاش سەعاتی زێڕ و ئەنگوستیلەکەی خۆم بۆ یادگار پێشکێشت دەکەم. بیست‌ودوو هەزار تمەنیش قەرزداری ئاغای دوکتور جەوادی قازیم، دەوروبەری چوارهەزار تمەنیش قەرزداری ئاغای مووسەویی مەراغەییم. هەرچۆنێك بێ، ئەوی سەرەوەم لەبیر بوو و نووسیمن، ئەوانی تریش- وەك له سەرەوە گوتم، دوای ئەوەی ئیسباتیان کرد، بیاندەنەوە. لەسەر گۆڕی بابم و من بڵێن قورئان بخوێنن و هەموو ساڵێك محەمەد بابی و کەسێکی دیکه [بۆ ئەم کارە] تەرخان بکەن. له خەجیجه خانم و یەکه یەکەی بنەماڵەی "مەلیك قاسمی"

خوداحافیزی دەکەم. بڕی پارەیەکیش بە حاجی غولام حوسێنی ئەردەوێڵی قەرزدارم، بیدەنەوە. لەژێر پارێزگاری و پشتیوانیی خودادا بن و بە لەسەرەخۆیی تەواوە ئەمە نووسرا. بڕی پێنجسەد تمەن بدەنە ئاغای سەروان کەبیری و بڕی پێنجسەد تمەنیش بە ئاغای مساوات و پێنجسەد تمەن بە سەرگورد نەوایی- کە پارێزەرم بوو.

ئیمزا

٢٦/١/١٠ [١٣] [-١٩٤٧/٣/٣٠]

دەستخەت و ئیمزای محەمەدی حوسێن خان پەسند دەکەم

هەروەها خانمی خێزانی خۆی کردە چاودێر و ئەگەر ڕەحیمیش هاتەوە، ئەویش چاوەدێر دەبێ.

محەمە سیدقی سیدقی

ئەم نوسخەیە بەرانبەرە لەگەڵ نوسخەی پەسندکراوی نێو فایلەکە.

سەرۆکی دەفتەری ... ستادی لەشکری سەرگورد ئەمین پوور

[ئیمزا]

[ئەم دێڕەی خوارەوە بە تایپ ڕایتر (تەباعە) نووسراوە]:

ئەم نوسخەیە بەرانبەر لەگەڵ نوسخەی پەسندکراوی نێو فایلەکە.

٢٦/١/١٠ [١٣]

[١٩٤٧/٣/٣٠]

محەمەد سدیق سیدقی

# وێنه

لەم بەشەدا چەند وێنەی سەیفولقوزات و کەسانی پێوەندیدار بە سەیفەوە، کە لەک کتێبەدا باسیان لێوە کراوە، بڵاو دەکرێتەوە. بەداخەوە تا کاتی ئامادەکردنی ئەم کارە وێنەی "عەزیز ئاغای عەبباسی"مان دەست نەکەوت کە لە وێنەکانی زیاد کەین.

پێرستی وێنەکان:

١. سەیف لە جل و بەرگی فەقێیەتیدا.
٢. سەیف لەگەڵ ژمارەیەک لە ئەفسەرانی ڕووس.
٣. (ئا) سەیف، هەندێک لە پیاوانی ئایینی و سەرۆک هۆزانی موکریان لە گەڵ سەرلەشکر عەبدوڵاخانی ئەمیر تەهماسبی لە دێی دەرمان.
٣. (ب) سەرەک هۆزانی موکریان لەگەڵ سەرلەشکر عەبدوڵا خانی ئەمیر تەهماسبی.
٤. سەیف و ژمارەیەک لە مامۆستایان و شاگردان، ئەوکاتەی کە سەیف سەرۆکی ئیدارەی فەرهەنگی مهاباد بووە.
٥. وێنەی سەیف و شەهید محەمەدحوسێن خانی سەیفی قازی کوڕی - ئەو دەمەی لە تەورێز خوێندوویە.
٦. سەیف و قازی عەلی و ژمارەیەک لە مەزنانی شاری مهاباد لە ڕێ و ڕەسمی دامەزراندنی نەخۆشخانەی شێرو خورشیدی سوور، ١٣٠٨ی هەتاوی.
٧. سەیف و قازی عەلی و ژمارەیەک لە مەزنانی شاری مهاباد لە خانووبەرەی شێخەلیسلام لە مهاباد، ١٣٠٨ی هەتاوی.

٨. سەیفو دوو ڕۆحانیی دیکە لە بۆنەیەکی ڕەسمیدا.

٩. وێنەی سەیف لە ڕۆژنامەی "کوردستان"دا.

١٠. سەیف دوای کەشفی حیجاب لە ئێران.

١١. سەیف، محەمەدحوسێن خانی سەیفی قازیو مەجید خانی میرموکری لە ڕێوڕەسمی کرانەوەی فابریکی قەند لە دێی قەرەوێرانی میاندواو، ١٩٣٣.

١٢. سەیفو کۆمەڵێك لە ڕۆحانیانی سابلاخ، ١٣٠٨ی هەتاوی

١٣. یەك لە دوایین وێنەکانی سەیف.

١٤. وێنەی سەیف بە ئیجازەی تفەنگی ڕاوێوە.

١٥. وێنەی دەجید خانی میرموکری، ئەمیر ئەمجەدو پێشەوا قازی محەمەد.

١٦. وێنەی محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازیو هاوسەریو چوار لە شەش منداڵەکانیان.

١٧. وێنەی مەجید خانی میرموکری، هاوسەریو خوارزای.

١٨. ئەحمەدی سەیفی قازی.

١٩. ئەحمەدی سەیفی قازیو نەناسراوێك.

٢٠. وێنەی توورانی سەیفی قازی کچی هەرە پچووکی سەیف.

٢١. وێنەی ڕەحیمی سەیفی قازی لە ڕێو ڕەسمی هەڵکردنی ئالأی کوردستان لە مهاباد- ٢٦ی سەرماوەزی ١٣٢٤ی هەتاوی (١٧ی دیسامبری ١٩٤٥).

٢٢و ٢٣. گۆڕی سەیف لە گۆڕستانی خانەقای بورهان.

**وێنەی ژمارە (١): سەیف لە جل‌وبەرگی فەقێیەتیدا**

شوێن‌و ساڵی گرتنی وێنەکە دیار نین. بەڵام وەك لە وێنەکەڕا دەر دەکەوێ، لە تەمەنێکی کەمدا گیراوەو دەبێ تەمەنی لەکاتی کێشانی ئەم وێنەیەدا لە ٢٠ ساڵ کەمتر بووبێ.

وێنەی ژمارە (٢): سەیف لەگەڵ ژمارەیەك لە ئەفسەری ڕووسییەی قەیسەریو ٢ كورد ڕووسەكان ساڵی ١٩١٢ كۆنسووڵخانەیان لە سابلاغ داناوە. ئەو وێنەیە لەو سەروبەندانەدا گیراوە. بەپێی حوكمی قازی مونعیمو قازی عەلی ، سەیف ساڵی ١٣٤٣ لە مانگی ڕەبیعی یەكەمدا ماڵی لە گوێنگجەلی داناوە. بڵێی ئەو وێنەیە ئەو دەمی نەگیرابێ؟

سالّی ١٣٠٣ی هەتاوی هێزە عەسکەرییەکانی ئێران، پاشەکشەیان بە میراودەلّیو پژدەرییەکان کرد لە خاکی ئێران. دوای گەڕانەوە لەو ڕاسپاردەیە، لە دێی دەرمان کە لە دەوروبەرەی مهاباد هەڵکەوتووە، لەلایەن سەرۆك عەشیرەتەکانو کەسایەتیی بەدەستەڵاتی ناوچە پێشوازییان لیّ کرا. ئەم وێنەیە لە سالّی ١٣٠٣٠ی هەتاوی [١٩٢٥ی زایینی] لەبەردەم قاوەخانەی دێی دەرمان هەڵگیراوە. ڕیزی پێشەوە، لەڕاستەوە بۆ چەپ بریتین لە میرزا ئەحمەدی ئەشعەری (ناسراو بە میرزا ئەحمەدی بەلەدێی)، سەید جامی جەعفەری، عەلی ئاغای عەلییار "ئەمیر ئەسعەد"، مەحموود ئاغای ئێلخانیزادە براگەورەی ئەمیر ئەسعەد، حاجی سەیید ڕەحمانی سەییدی، لەپشت سەری حاجی سەیید ڕەحمانی سەییدی کەسێك کە بە بەرگی سپی ڕاوەستاوەو خەنجەری لە بەر پشتێندیدایە: ئەحمەد خانی شەجیعی "شەنگە"ی فەیزوڵڵا بەگی‌یە کە دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان لە سەقز لە سێدارە درا، عەلی خانی حەیدەری موکری (سالار سەعید؛ عەلی بەگی حاجیالّیکەندی)، سەیفولقوزات، ئەمیر لەشکر عەبدوڵاخانی ئەمیر تەهماسبی، لەپشت سەری سەرلەشکر تەهماسبی ئەو کەسەی کە بە مەندیلی سپی‌وخەنجەر لە بەر پشتێنددا دەبیندریٚ: حەسەن ئاغای کوڕی بایز ئاغای مەنگوڕ، سەیید حەسەنی شێخەلئیسلامیی موکری (بابی ڕەوانی شاد بێ ماموٚستا هێمن) کە تەنێ سەری دیارە، ماموٚستا مەلا محەمەدی تورجانیزادە، یاوەر قەویدڵ، قەرەنی ئاغای ئەمیرولعەشایر (مامەش)، لەپشت سەری قەرەنی ئاغا لەلای ڕاستی کوڵەکەکە ئەو کەسەی بە پێچی ڕەشەوە دەبیندرێ بایز ئاغای قورمیش؛ دێبۆکرییە، لای چەپی هەمان کۆڵەکە ئەو پیاوە پیرەی کە دەبیندرێ خان بابا خانە، ئەفسەرەکەی دوای قەرەنی ئاغا نەناسراوە، گەنجالّی بەگی قاتانقوڕ، عەلی ئاغای گەورك، لەپشت سەری عەلی ئاغای گەورك ئەو کەسەی کە یەخەو سینگی سپیی کراسەکەی دیارە باپیر ئاغای دێبۆکرییە، کەسی هەرە دوایی ڕیزی پێشەوە باپیر ئاغای مەنگوڕ نەوەی هەمزاغای بەنێوبانگە.

وێنەکە لە ئالّبۆمی شەخسیی عومەر ئاغای عەلییار وەرگیراوە، بە سپاس لە بەڕێزیان.

ئەم وێنەیە لە کتێبی سەیید محەمەدی سەمەدی "نگاهی بە تاریخ مهاباد، انتشارات رهرو، مهاباد، سالّی ١٣٧٣ [ی هەتاوی]، زمانی فارسی، لاپەڕەی ٤٨٠" وەر گیراوە. شەرحی ژێر وێنەکەش بەڕێزیان نووسیویەو لێرەدا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی.

جێی ئاماژەپێکردنە کە بۆنەی هەڵگیرانی ئەم وێنەیە لە ڕیوایەتی بەڕێز خەلیلی فەتتاحی قازیو بەڕێز سەیید محەمەدی سەمەدیدا لەیەك جیاوازە.

وێنەی ژمارە (٣) (ب)

سەیفو سەرەك هۆزانی موكریان لەگەڵ سەرلەشكر عەبدوڵڵا خانی ئەمیر تەهماسبی

(هەردوو وێنەی ژمارە ٣ ساڵی ١٣٠٣ی هەتاوی هەڵگیراون، میرزا خەلیلی فەتتاحی قازی ئەو بۆنەیەی بەدرێژی شی كردووەتەوە)

## وێنەی ژمارە (٤)

## سەیفو ژمارەیەک لە مامۆستایانو شاگردان، ئەوکاتەی کە سەیف سەرۆکی ئیدارەی فەرهەنگی مهاباد بووە

ئەم وێنەیە لەگەڵ قوتابیانو مامۆستایانی مەدرەسەی سەعادەت لە حەوشەی مەدرەسەکە هەڵگیراوە. ڕیزی ناوەڕاست لەڕاستەوە بۆ چەپ قازی محەمەد، قادری، سەیفولقوزات، شوجاعی بەڕێوەبەری مەدرەسەی سەعادەت، میرزا ئیبراهیمی قازی، محەمەدی تورجانیزادە
ڕێکەوت: ١٩٢٣/٢/١٣

ئەم وێنەیە بە سپاسەوە لە کتێبی "پیشوای بیداری" خاطرات سعید همایون، بە کوشش هاشم سلیمی، موسسه چاپ و نشر آراس، اربیل، ٢٠٠٤، وەرگیراوە.

وێنەی ژمارە (٥) سەیفو محەمەد حوسێنی سەیفی قازی کوڕی گەورەی محەمەد حوسێن خان لە تەورێز خوێندوویە، سەیف بۆ ماوەی دووروودرێژ لەوێ ماوەتەوە، تەنانەت لەوێش ڕووبابە خانمی خواستووە، کە هەر کچێکی لێ بووە بە نێوی توران. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی ساڵی ۱۹٤۷ لە تەمەنی ٤۳ ساڵیدا لە دار دراوە، (حەمە حوسێن خان لە ۱۲۸۳/۲/۹دا لە سابڵاغ لەدایک بووە)، ئەو وێنەیە دەبێ لەنێوان ساڵانی ۱۹۲۳-۱۹۲٤دا گیرابێ.

## وێنەی ژمارە (٦)

لەکاتی ڕێوڕەسمی دروستکردنی

نەخۆشخانەی شێر و خورشیدی سووری مهابادا، ١٣٠٨ی هەتاوی

ڕیزی پێشەوە لەڕاستەوە بۆ چەپ: سەدرولعولەمای تەوحیدی، نوێنەری مەرکەز، سەیفولقوزات

ڕیزی دووەم لەڕاستەوە بۆ چەپ: حەسەنی داودی، شێخ عەبدولڕەحیمی شەمسی بورهان، حاکمی دەوڵەتی لە مهاباد، سەرگورد باستی، دوکتۆر ئەمیر ئەعلەم، سەرهەنگ محەمەدعەلیخان، قازی عەلی، قازی مونعیم.

ڕیزی سێیەم لەڕاستەوە دانیشتوو: قازی محەمەد، ڕەحمەتی شافعی، ڕیزی سێیەم ڕاوەستاوان لەڕاستەوە: نەناسراوە، قادری، ڕەئیسی دارایی، ڕەئیسی شارەبانی، نەناسراوە، سەروانی ئەرتەش، کارمەندی گومرگ، ٢ کەس لە عەشیرەتی مەنگوڕ، ڕیزی هەرە دواوە لەلای ڕاستەوە کەسی دووەم: سەعید بابی

١٣٠٨/ ١٩٢٩

ئەم وێنەیە لە کتێبی "پیشوای بیداری" خاطرات سعید همایون، بە کوشش هاشم سلیمی، لە بڵاوکراوەکانی "انستیتو فرهنگی کردستان، موسسه چاپ و نشر آراس، ٢٠٠٤ وەر گیراوە.

شەرحی ژێر وێنەکەش هەر لەو سەرچاوەیە وەر گیراوەو وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی

## وێنەی ژمارە (٧)

ڕیزی پێشەوە لەڕاستەوە بۆ چەپ: ساڵحی شاتری، شێخ موحسینی قازیی موکری، حاجی سەردرولعولەمای تەوحیدی، میرزا عەلی قازی (قازی عەلی)، شێخ عەبدولڕەحیمی شەمسی بورهان، ئەبولحەسەنی سەیفی قازی (سەیفولقوزات)، نەناسراوە، حاجی سەیید ڕەحمانی سەییدی، حاجی ساڵحی حەیدەری فارووقی مەشهوور بە حاجی ساڵحی فەقێ محەمەدی،

ڕاوەستاوان ڕیزی یەکەم لەلای چەپەوە بە بەرگی نیزامییە کە دەستی لە گیرفانی ناوە: حەمزەی، سالاری لە خێڵی مەنگوڕ، ڕیزی دواتر، لەلای ڕاستەوە نەفەری دووەم بە ڕدێنی سپییەوە: میرزا عەبدوڵای نانەوازادە، ڕیزی هەرە دواوە نەفەری یەکەم لەلای ڕاستەوە بە کڵاوی سپیی پەهلەوییەوە: میرزا ڕەحمەتی شافعی.

ئەم وێنەیە ساڵی ١٣٠٨ی هەتاوی (١٩٢٩) لە مهاباد لە خانوویەرەی شێخەلیسلام ڕووبەڕووی مزگەوتی هەباساغای هەڵگیراوە. ئەم خانووبەرە ئێستا نەماوە.

ئەم وێنەیە بە سپاسەوە لە ئارشیوی بەڕێز سەیید محەمەدی سەمەدی وەر گیراوە.

وێنەی ژمارە (٨)

سەیف و دوو ڕۆحانیی دیکە لە بۆنەیەکی ڕەسمیدا

ئەم وێنەیە بەسپاسەوە لە ئارشیوی بەڕێز سەیید محەمەدی سەمەدی وەرگیراوە.

## وێنەی ژمارە (١٠):

مێژووی گیرانی ئەو وێنەیە ، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو شێعرەی سەیف جوانتر ڕوون دەبێتەوە. ئەو کەسەی لەدوای سەیف لەنێوان ئەو و خانمێکدا دەموچاوی دیارە، ئەبولقاسمی سەدری قازی برازای سەیفە. شێعرەکە ئاوا دەست پێ دەکا:

ئەگەر دەپرسی باسی ئەم ناوە

حوکمی ئازادی ئیعلان کراوە

ئاوا تەواو دەبێ:

تاریخ هەزار و سێسەدو چاردە

دەی مانگو هەواش زۆر وشكو ساردە

ئەمن (حەسەنی قازی) لەو باوەڕەدام ئەو وێنەیە ئی مەراسیمی کەشفی حێجابە کە ساڵی ١٣١٤ لە ١٧ی مانگی دەی بەفرانباردا بەڕێوە چووە، ١٣١٤/١٠/١٧، ئەگەر ئەو قەسیدەیە لەگەڵ وێنەکە لەبەر یەك ڕۆ بندرێ، ئەوە زیاتر ڕوون دەبێتەوە. وا دیارە لەوێ ڕێز لە سەیف نراوەو دەسکەگوڵیان داوەتێ.

شوێن: زیاتر وێدەچێ تاران بێ. سەیف لەبن دەستخەتێکدا دەنووسێ:

بتاریخ ٢١/١/٢٠ در تهران نوشته شد

اقل ابوالحسن سیف القضات قاضی

واتە ئەو شێعرەی جارێکی دیکە لەوێ نووسیوەتەوە.

وێنەی ژمارە (١١)

سەیف، محەمەدحوسێن خانی سەیفی قازی‌و مەجید خانی میرموکری لە ڕێ‌وڕەسمی کرانەوەی فابریکی قەند لە دێی قەرەوێرانی میاندواو، ١٩٣٣

لەلای ڕاستەوە نەفەری دووەم: مەجیدخانی میرموکری، نەفەری سێیەم: محەمەدحوسێن خانی سەیفی قازی، لەلای چەپەوە نەفەری سێیەم: سەیفولقوزات

ئەم وێنەیە بەسپاسەوە لە ئارشیوی بنەماڵەی میرموکری وەرگیراوە.

**وێنەی ژمارە (١٢)**

**سەیف و کۆمەڵێک لە ڕووحانیانی سابلاخ، ١٣٠٨**

**١- سەیید موحسینی قازی موکری ٢- سەدرولعولەما ٣- سەیفولقوزات ٤- قازی عەلی**

**٥- ئیسماعیل خان بەهادوری حاکمی سابلاخ ٦- سەرتیپ حەسەن خانی موقەددەم**

**ئەم وێنەیە لە (کەونە نیشتمان)ی گۆڤاری "مەهاباد" وەر گیراوە**

**کە بەڕێز فەرەیدوونی حەکیم زادە ئامادەی دەکات**

وێنەی ژمارە (١٤)

وێدەچێ دوایین وێنەی سەیف بێ کە بەدەستەوەیە. بە مۆڵەتنامەی هەبوونی تفەنگی ڕاوێوە لکاوە. ئەو مۆڵەتنامەیە لە ١٣٢٠/١/١٨دا دراوە.
هەر دەبێ ئەوێ ساڵێ هەڵگیرابێ. سەیف لە ٧ی ڕێبەندانی ساڵی ١٣٢٣دا کۆچی دوایی کردووە.

**وێنەی ژمارە (١٥)**

**لەڕاستەوە بۆ چەپ: ئەمیر ئەمجەدی مەولەوی (ئەمیر ئەمجەدی چاخڵەمەن)، مەجید خانی میرموکری (مەجیدخانی قەرەوێران)، پێشەوا قازی محەمەد، کاکە ڕەحمانی موهتەدی (حاجی ڕەحمانی دواتر). هەرسێکیان جلوبەرگی تۆپزی سەروبەندی ڕەزاشایان دەبەردایە.**

**ئەمیر ئەمجەدی مەولەوی لە خاوەنموڵکانی ترکی ئازەربایجانیو مەجید خانی میرموکری، هەر ئەو کەسانەن کە سەیف لە نامەکەیدا بۆ محەمەد حوسێن خانی کوڕی باسی لێوە کردوون**

وێنەی ژمارە (١٦)

محەمەد حوسێن خانی سەیفی و هاوسەری و چوار لە شەش منداڵەکانیان

وێنەی ژمارە (١٧)

وێنەی مەجیدخانی میرموکری (مەجیدخانی قەرەوێران)

لەگەڵ هاوسەری (لەلای ڕاستەوە) نازەنین خانمی ئەمیری و خوارزای بوداغ خانمی

موجتەهیدی کچی میرزا عەبدولحوسێنی فەرمانفەرما سیاسەتمەداری بەنێوبانگی دەورەی

قاجارو پەهلەوی کە ڕەزاشا بە دەك و دۆلاب کوشتی

ئەم وێنەیە بەسپاسەوە لە ئارشیوی بنەماڵەی میرموکری وەرگیراوە

وێنەی ژمارە (١٨)

ئەحمەدی سەیفی قازی

لە ورمێ هەڵگیراوە، دەبێ ئی ماوەیەکی کورتی پێش کۆچی دوایی بێ،

چونکە زۆر بە گەنجی مردووە

وێنەی ژمارە (١٩)

لەڕاستەوە: ١- ئەحمەدی سەیفی قازی ٢- نەناسراو

بە جلوبەرگی یەکپۆشی قوتابیانەوە

وێنەی ژمارە (٢٠)

وێنەی توورانی سەیفی قازی، کچی هەرە پچووکی سەیف

تووران خانم لە ساڵی ١٣٦٧ی هەتاویدا لە شاری بۆکان کۆچی دوایی کردووەو

لە خانەقای شێخی بورهان نێژراوە.

وێنەکە بەسپاسەوە لە ئارشیوی کاك خەسرەوی میرموکری وەرگیراوە

وێنەی ژمارە (٢١)

ڕەحیمی سەیفی قازی لە ڕێوڕەسمی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان‌دا لە مهاباد، ٢٦ی سەرماوەزی ١٣٢٤ی هەتاوی (١٧ی دیسامبری ١٩٤٥)

ئەم وێنەیە لە فیلمێکی بەڵگەیی وەرگیراوە
کە لەلایەن فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجانەوە بڵاو کراوەتەوە.

وێنەی ژمارە (٢٢) و (٢٣)

کێلی گۆڕی سەیف لە گۆڕستانی خانەقای بورهان (سەر ڕێگای مەهابادو بۆکان)،

ئەم وێنەیە کاك شوان سەدری قازی هەڵیگرتووە

ئەو چەند بەیتە شێعرەی خۆی لەسەر کێلی گۆڕەکەی نووسراوە:

هەر کەس بە تەمای دین و دنیا بێ     دەبێ لەو دەرکە خاکی دەرگا بێ

قیبلەیە بۆ مە زۆر لە مێژ ساڵە     ڕووی لێ وەرگێڕین دینمان بەتاڵە

جێگاو خانەقای شەمسی بورهانە     شەیتان وەك شێتان لێی سەرگەردانە

# بەڵگەنامە

لیستەی بەڵگەنامەکان:

١. ئیجازەی قەزاوەتی سەیف، کە قازی عەلیو قازی مونعیم ئیمزایان کردووە.

٢. وەسییەتنامەی سەیف کە بە دەستخەتی پێشەوا قازی محەمەد نووسراوەو جگە لە سەیفو پێشەوا، حەوت کەسی دیکە وەك شاهید ئیمزایان کردووە.

٣. قەواڵە (سەنەد)ی کڕینی دوو دانگ لە گوندی پیرۆڵی باغیو عەولاّبات.

٤. کۆپیی ئیجازەی هەڵگرتنی تفەنگی دوولوولی ڕاوێ.

٥. کۆپیی وەکالەتنامەی سەیف بۆ محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی.

٦. کۆپیی شناسنامەی سەیفو ناوەڕۆکەکەی.

بەداخەوە کۆپیی شناسنامەکە کە بە فاکس ناردراوە، ڕەش ڕەشە،
موشەخەساتەکەی بە تەلەفوون ئاوا وترا:
وزارت داخله
علامت شیرو خورشید سرخ
ورقەی هویت
آقای میرزا ابوالحسن سیف قاضی
پسر آقای میرزا ابوالقاسم قاضی و امینه [هەمین] خانم
که در ولایت ساوجبولاغ، شهر ساوجبولاغ در تاریخ هفتم اردیبهشت
یکهزار و دویست و پنج شمسی مطابق چهارم ربیع الثانی ۱۲۳۹
قمری تولد یافته است.
در محلەی رزگەیان ساکن است
شماره شناسنامه ۱۹۸
تاریخ تنظیم سند ١٦ اردیبهشت ۱۳۰۷ شمسی
تاریخ صدور ۱۷ اردیبهشت ماه ۱۳۰۷ شمسی

## بەڵگەنامەی پەیوەندیدار بە بنەماڵەی سەیف

لــەم بەشــەدا هەنــدێ بەڵگەنامــەی ئەنــدامانی بنەماڵــەی ســەیف بــڵاو دەکرێتەوە، وەسییەتنامەی شەهید محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی وەزیری جەنگی کۆماری کوردستان، کە چەند خولەك پێش لەسێدارە دران بۆ هاوسەری خۆی نووسیوە.

لیستەی بەڵگەنامەکان:

١. نامــەی محەمەدحوسێن خــانی ســەیفی قــازی بــۆ "ئیمــامی"، واتــە وەرگێڕی بەنێوبانگی زمانی فارسی محەمەدی قازی.
٢. نامەی ڕەحیمــی ســەیفی قــازی بــۆ محەمــەد حوســێن خــانی ســەیفی قازی.
٣. وەسییەتنامەی شەهید محەمەدحوسێن خانی سەیفی قازی.

## دەستخەتی شیعرە کوردییەکان

لێرەدا کۆپیی هەندێك لەو دەستخەتانەی وا لە بەر دەستدا بوون و بنەمای ئەم کتێبەیان پێك هێناوە، بڵاو دەکەینەوە.

### وله ایضاً

یار که دیته سر گولو استیره — سیری وی وکی مانگو استیره

روناکی روی بو یاروی عاشقان — وختی بوکیری دباکا گیره

حوزگم بو شو وانه لەدوی مشکلان — یارم بزلفان دکا داوی‌ره

شرط شرانیم او غده وبس بی — یارم بیری لی بیته بر بیره

به تیری نازت جرگم براوه — برچی به تیغی لیم دگری سیره

گله سوره کی گوله میسلا قه — لەدورە خدادان بریز بزمیره

لبغی مواتیت وختی زکاته — فقیری خوتم هر بومن خیره

بسته بزلفان دلم زنجیره — زوارو بردی بس ده میگیره

هر دانه منه ده دولو زولان — تیک فتنه شوانه زنگی ملویره

زلفی وک شه ده وسوزی کره بشو — چرای سرکلەم کبوترا دیره

هر کس عشقی توی لسردا نبی — بیگک سعوانه یرد یا نیره

کردمه سر باسکان هر آتش باله — هر بوو امیدم یارم آشیره

هر تا دارم اوو رود بسمه بی — زوو دره میکه بدونی دیره

وکی مجنون لەدوت کوتمه کیو ودشت — فیستم گرگ و پلنگ و شیره

خیالی خمدان مابی غم نابی — تابی زلفانی یارشینه دیره

زوانه شعرن عزیز بر گت — مملکت بتو وه باغ کویره

کوستانی دوریت هر زرو رواز — ترکت وه لابلا ژر ره دبه‌یره

بار فراقت پشتی شکاندوم — سبرم دادی لی تا دیره

تمت شقه ...

زلفان لسرشان لیک پژلی ژژان — لشکری چین وژاپن تیک چرژان
بلرزه وچپه فریزو چنیینی — گریانه کاریان جی پکینینی
بو چینه وه جوان ملکری ده کن — پولی کوران وان کرچینه ی وکن
پاچو بیره وبتی سر شاندا — وک فوجی حاضر لژیر فرمان دا

هسته ملاوازن مرو مالاتیان — قربانی ناکری نادری زکاتیان
گالبرلری املت گری نیسری — نه مرماستی ما نه مانگا شیری
ملژو گامیشیان برنه چلک چکی — وشتریان ببین بچری لنگلنگی
لمبر بی امیزی له ترسی سرما — پشتینه لپشت دا همو جسلکرا
ترنو مرروت بون وک سوره ساعه — یک دانو دیکشت یک به له باقه
زستانی دوسال دیاره پینج مانگه — ترو کاوگیا وجو براده ونگه

زلی فتیوی شوران لسرشوینی — میگه لان چیشتا وله کوی دنوینی
گوان شنگه بری لچیا وکویستانان — شلقه ی مشکه یان بری بیابانان
قرنیان هلدکن دسیلی بلوره — لنگیان دردخن پارچیک دنوره
قوزری بردکیان که دین دربینن — روژ ده ساقی بو عرضی وسینن
زلفیان لابلاوکن به لادل — روژ هوری کسر روژ خری ولا دل
دیهات لیک دی جیا درو هوبا فی — ورت ناکری رون بو چوکره سانی
قودرت ناکری ماست بو هوینی — دوی هلگیریت ده یابه گلینی
هیر بو اکثیر شیرآوی حیات — وک اسکندری کو تینه ظلمات

کرانج حه‌لتی پرو پاتالک بو  کرمی دی بدی بانگ و سال بو
دریش له‌ذشیو چیدی کوچ بکن  کای سره وزوی کن جوتی چا بکن
تیتر کایه وک کاره بابه  بو به قوتی زرج دینجه بر صحرایه
حاصل عمره له زوررو کمر  داتان به کاوگیا دلنیو عجب
باغان داتین داران بنیژن  بحیب داصلن کوتو لمیشرن

حیفه علتی اسینده هزار سیاک  نوکری مالان پی روتو رجاک
چیدی دژمنان به خو و خیرتر مکن  بزرو وکینک بالا پو شر مکن
تاکی له درکان کزو بلاو بین  بنزنو گوزه سر بسکلاو بین
نوکری مالان شرمه کسبو کمه  کولان هتر گرین به کرکمه کوشه
هرکس کزردی مالانی ماهی  وجاغی کویر به مندالی نبی

دوبه بخیه‌ی له گورد روبدل بو  گرنگ مندن کرز یان ساوا بو
واجبه خوینان بو دنیا و دینی  پیغمبر فرموی بو چو نا چینی
به کرته وشانمان علت دمینن  به مزن و گوران شاران دستین
دردی دل دکم گرتو کرانجی  حسن کرانجه چی کدولانجی

پوشوانا شوتا میشر ورکسان  دران به حری وک دنیجه نخشان
کای زردو رزیو به لیره‌ی سوره  دنیجه رشوشین بیشتی سموره
ری کاکیشی وک کهکشانه  قطاری وشتر ورک استیرانه

ئەڵ بم نابینم خێڵ سرە و خواران  تەقڵ و رمبازی و هەوا هەوای سواران

کوا پەروەت آغا سەرخێڵ کوردان  دەقوڵە سنی رد پچی بۆ کوێستان

لەکوێ یە تاغی او چادری جوانی  تیپ تیپ سیوانی سەرسفرە و خوانی

کوانێ سید صمد دومردی رشید  بو ماین بلاغ بچی بە تهید

خەسرەو شێر جوانە گا رشی منەدار بو  شەواردنی فرزو گلامی بێ دلدا بو

دگەر عنجی جوان شینیان دگیرا  قادر و صالحیان تێکرا دگیرا

گرەبو زیشیان تێکرا دستانی  گلی گرایان لە او کی دانی

تازە مالکان تورد خدا یونن  اودنشیر تۆیکا فرزی دلکا کونن

دڵت تنگ نبی تنا قت هبی  اودی تری تویی یا خدا قط نبی

عمر و عثمان بو بکری نازدار  نابازگرە بێ هشامە چوار یار

چرینە قربانە خوم قربان دکم  چرینە پروانە عزیزگیان دکم

تاریخ، هزار و سیصد و دوازده
بیستی فروردین نێچیر لیا دە

فصولی اوردی شکوفه‌لری شیلده تندامکم — ربت اولدی خوشکدر لیرضاک رحمتی نت
سیمبرلک نکللرنکا شکست کاردی فرید — برعزت لوب اوروحسن هردل حسنی نت
که کانی طلعلة طلم لیزبرق ارازه — رضام شح درعایه بوعزیزلری برلطافت
اینا حلقه دعا وتمین وختم زورکونیار — لدینا دعاقبت یاردمعین باشی برابت
هتر کسان برده وبی حفظ لدینیدا — لدرزنهیدا ناربت وحیب بنمز سیر کانت

نزاکت وچپ بدون صف صف سازیت اولدی یک
رمیده غفلت بلا بحوادث لطف یزدیت

گل بگلزار همی خندان است — بلبل شیفته خوش الحان است
ساقیا باده ملکونم ده — یار در سر بوس مستان است
لب جو و چمن و سایه بید — توبه ناز درف مستان است
ای صبا مژده بگلزار برید — که یکی هم فلک گردان است
گو بیان سجده کنم داده — چندی خنده که که افشان است
آسمان بیت پیغمبر سعید — زنده کنم شیعه و قربان است
جان چشم تو را ز برالی — در درد عشق مرغی جان است
جشن‌ها باد پسفیده حضرت — تره زیر آن لطف جان است

صبح سه‌شنبه ۲۹ شهر شعبان گفته شد تحریر گردید سنه ۱۳۱۷

قاصد که له دریا تو به تبلیغی وفا کەرد — مجروحی منی حسرەتی صد جبتی خطا کەرد

بیم روت لخطف دی یو یا خطەی تاتار — یا أهلی بهشتی که دلت یه له صفا کەرد

یا خضری که هاتی به دو جام آوی تماوە — ئەم مردەی هجرت بە تمای عمری بقا کەرد

یا خور له طرفی یارم وەدی هاتی نامە — خاصیتی آهوی ختن چین یه دا کەرد

خاصیتی بو چاوی نمی خستەی رەنجور — وەک جامەیی یوسف کە بە یعقوبی عطا کەرد

سطاری وەکو زلفی عروسان مسلسل — الفاظی که عنبرچەیی دەلداری بدا کەرد

نقطەی بنا خالی له سەر پیتی یارم — یا وەک عرقی گولی کە مێلی بجفا کەرد

هەر خوم به بینای ئم خطو [illegible] — مجروح و غمزدەی له دلم محفوو فنا کەرد

ئەم دیتەکو له دیتەی [illegible] — بوو یەوە وەکو بولبول حسنی نغمە سرا کەرد

**نموونەی دەستخەتی خودالێخۆشبوو مەلا حوسێنی گلۆلانی کە بەپێی داوای شەهید محەمەد حوسێنی سەیفی قازی شێعرەکانی سەیفولقوزاتی نووسیوەتەوە**

٧١

وله ایضاً رحمه الله تعالی

نموونەی دەستخەتی یەکێك لە نووسەرەوەکانی شێعری سەیف کە زۆر وە دەستخەتی خۆی دەچێ و بە زەحمەت فەرق بە جیاوازییان دەکرێ

نموونەی دەستخەتی خوداڵێخۆشبوو مەلا بابەوەیسی عوسمانی کە لەسەر داوای نەمر فەتتاح خانی سەیفی قازی کوڕی گەورەی محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی و نەوەی سەیف کەشکۆڵێکی لە شێعرەکانی سەیف و شاعیرانی دیکە بەرهەم هێناوەو لە کۆتاییدا بە شێعرێك لە پەسنی فەتتاح خان‌دا کەشکۆڵەکەی ڕازاندووەتەوە

## نموونەی چەند شیعری فارسیی سەیف

سیٚ لاپەڕەی یەکەم ئەو شیعرانەن وا لە پەسنی بزووتنەوەی خیابانیدا گوتراون و یەکیان لە گۆڤاری "ئازادیستان"دا چاپ بووە. لاپەڕەی یەکەم و سیٚهەم دەستخەتی سەیف خۆی و لاپەڕەی دووهەم کە نوسخەی هەمان شیعری لاپەڕەی یەکەمە، دەستخەتی شەهید محەمەد حوسیٚن سەیفی قازییە و ئیمزای ئەویشی بەسەرەوەیە.